# کاروان

گۆڤاری ئەمینداریێتی گشتیی رۆشنبیری و لاوانە

24

ئەیلوولی 1984 ساڵی دووەم





# کاروان

گۆڤارێکی رۆشنبیری ی مانگانەیە
ئەمینداریتی ی گشتی ی رۆشنبیری و لاوان
بەزمانی کوردی و عەرەبی دەری دەکا

24 ئەیلوولی 1984 ساڵی دووەم



## لەم ژمارەیەدا



ئەدرەس : هەولێر ـ ئەمینداریتی گشتی رۆشنبیری و لاوان ـ گۆڤاری (کاروان) ت 20882

عومەر دزەیی
هەولێر

# بەراورد کردنێکی «رابوردووی تەواو»ی کوردی لەگەڵ «Perfect»ی زمانە ئەوروپاییەکاندا

لە زۆربەی هەرە زۆری ـ ئەگەر نەڵێم لە هەموو ـ زمانە ئیندۆ ـ ئەوروپاییەکاندا ، بۆ دروستکردنی «ڕابوردووی تەواو ـ Perfect» وەك : «I have eaten» ی ئینگلیزی کە «من خواردوو .. مە»ی کوردی‌یە ، یان «فرمانی هەبوون ـ Verb to have» یان «فرمانی بوون ـ Verb to be بەکار دەهێنرێت . ئەم دوو فرمانە ، لەو زمانانەدا ، پێیان دەگوترێت «فرمانی یاریدەدەر ـ auxiliary verbs» واتا ، بە پشتیوانی‌ی یەکێك لەو دوو فرمانانە ، هەر فرمانێکی تر ـ ئەگەر ئەندازەیی [1] بوو ـ دەتوانێ ببێتە «رابوردووی تەواو ـ Perfect» .

کوردی‌یەکەی خۆشمان ـ وەك هەر زمانە ئیندۆ ـ ئەوروپاییەکی‌تر ـ لەئەندازە نەترازاوە .

لەم لێکۆڵینەوە بچکۆلەمدا ، ئەم زمانانەی خوارەوەم لەگەڵ کوردی‌دا بەراورد کردوە :

ئینگلیزی ، فرانسەیی ، ئەڵەمانی ، ئیسپانیانی ، ئیتالیانی .

با جارێ خەریکی فرمانی «هەبوون» بین کە لە فرمانی «بوون» باوترەو کە لە زمانی ئیسپانیانی‌و ئینگلیزی‌دا ، ڕاستی‌یەکەی ، هەر یەکەمیان ، نەك دوەم ، لەو بوارەدا بەکار دەهێنرێ . ئەمەش چاوگەکەیەتی :

| کوردی | ئەڵەمانی | ئیسپانیانی | ئینگلیزی | ئیتالیانی | فرانسەیی |
|---|---|---|---|---|---|
| habun | haben | haber | to have | avere | avoir |
| هەبوون | | | | | |

بافرمانی «خواردن» یش بە نموونە وەربگرین‌و بەهۆی ئەو «هەبوون»ەوە بیکەینە «ڕابوردووی تەواو ـ Perfect» . چاوگی «خواردن» یش بەم جۆرەیە :

| کوردی | ئەڵەمانی | ئیسپانیانی | ئینگلیزی | ئیتالیانی | فرانسەیی |
|---|---|---|---|---|---|
| خواردن | essen | comer | to eat | mangiare | manger |

بۆ دروستکردنی «ڕابوردووی تەواو» فرمانی یاریدەدەر «هەبوون» هەر لە حاڵەتی ڕانەبوردوو ، بەلام گەردانکراو ، دا دەمێنێتەوە ، هەرچی ئەو فرمانەی کە دەمانەوێ بیکەینە «ڕابوردووی تەواو» ، چاوگەکەی دەگۆڕێ‌و شێوەیەکی نوێ وەردەگرێ کە پێی دەگوترێ «پارتیسیپ ـ Particip» . ئەم پارتیسیپە لە هەر زمانەك‌دا فۆرمێکی تایبەتی وەردەگرێ‌و هەر بەو فۆرمەش دەمێنێتەوە . لە زمانی کوردی‌دا ئەو فۆرمە لە (ڕەگی چاوگ + پاشگری «وو» یان «و») پێك هاتووە بەم جۆرە :

| کوردی | ئەڵەمانی | ئیسپانیانی | ئینگلیزی | ئیتالیانی | فرانسەیی |
|---|---|---|---|---|---|
| خواردوو | gegessen | comido | eaten | mangiato | mangé |

جا ، «ڕابوردووی تەواو — Perfect» لە لێکدانی ئەم پارتیسیپە «خواردوو ..» لە گەڵ فرمانی «هەبوون» لە حاڵەتی

رانەبوردوو و بە پێی کەس گەردان کراو ، پێك دێ .
لە زمانە ئەوروپاییەکاندا ، ئەم لێکدانە بەم جۆرەیە :
1 - راناو 2 - فرمانی یاریدەدەر «هەبوون»
3 - پارتیسیپی ئەو فرمانە کەوا دەکرێتە رابوردوو .
بەلام لە کوردیدا بەم جۆرەیە :
1 - راناو 2 - پارتیسیپی ئەو فرمانەی کەوا دەکرێتە رابوردوو 3 - فرمانی یاریدەدەر «هەبوون» .

**تێبینی :**

لە کوردی و ئیتالیانی و ئیسپانیانی ، وە هەروەها لە لاتینیشدا ، پێویست ناکا ، لە هەموو حالەتەك دا ، راناو دابندرێ . خۆی ، ئەو گۆرانەی کە بە پێی کەسەکان بەسەر فرمانەکەدادێ ، راناوەکانی پێ دەناسرینەوە . بەلام بۆ ئاسانکردنی تێگەیشتن ، من ، لە کوردیەکەدا ، هەمیشە راناوم داناوە .

رابوردووی تەواو - Perfect :

| کوردی | ئەلەمانی |
|---|---|
| من خواردوو .. مە | Ich habe gegessen |
| تۆ خواردوو .. تە | Du hast gegessen |
| ئەو خواردوو .. یەتی | er, sie hat gegessen |
| ئێمە خواردوو .. مانە | Wir haben gegessen |
| ئێوە خواردوو .. تانە | Ihr habt gegessen |
| ئەوان خواردوو .. یانە | sie haben gegessen |

| ئیسپانیانی (راناو دانەندراوە) | ئیتالیانی (راناو دانەندراوە) |
|---|---|
| he comido | ho mangiato |
| has comido | hai mangiato |
| ha comido | ha mangiato |
| hemos comido | abbiamos mangiato |
| habeis comido | aVete mangiato |
| han comido | hanno mangiato |

| فرانسەیی | ئینگلیزی |
|---|---|
| J'ai mangé | I have eaten |
| tu as mangé | You have eaten |
| il, elle, a mangé | he, she, has eaten |
| nous avons mangé | we have eaten |
| vous avez mangé | you have eaten |
| ils, elles, ont mangé | they have eaten |

**تێبینی :**

سەیرێکی پارتیسیپەکە بکە لە هەموو زمانەکاندا دەبینیت ، لە سەرایی تا دوایی ، هەروەك خۆی ماوەتەوە .

ئێمە گوتمان کوردیش ، وەك زمانەکانیتر ، بە یارمەتی فرمانی یاریدەدەر «هەبوون» ەوە ، رابوردووەکەی دروستکردوە . بەلام کوا لە کوێیە ئەو فرمانی «هەبوونە»ە ؟

خۆی پیاو کە دەلێ (من خواردوو ..مە) ، ئەم (مە) یە نە پاشگرو نە راناوی لکاوە - وەك دێتە بەرچاو - بەلکو (هەمە) یە کە یەکەم کەسی تاکی فرمانی «هەبوون»ە وەك (I have)ی ئینگلیزی ، بەلام کراوە بە (مە) چونکە لە کوردیدا دوو پیتی بزوێن بە دوای یەکدا لە قسەکردن ناخۆش دێ بۆیە یەکێکیان قووت دەدرێ . هەروەها ، کە دەگوترێ (تۆ خواردوو ..تە) ، ئەم (تە) یە راستییەکەی (هەتە)یە کە دوەم کەس تاکی فرمانی «هەبوون»ە وەك (you have)ی ئینگلیزی بەلام کراوە بە (تە) لەبەر هەمان هۆی سەرەوە .

راستە پیتی (هـ) بزوێنی تەواونییە ، بەلام لە هەندە دیالەکتی زمانی کوردیو لە فرانسەییو لە ئیسپانیانییش ، دیالەکتی ئەندەلووسی لێ دەرچێ ، هەروەك بزوێنەکان رەفتاری لەگەلدا دەکرێت . کەواتە :

(من خواردوومە) لە (من خواردووهەمە) وە هاتوە (تۆ خواردووتە) لە (تۆ خواردووهەتە) وە هاتوە (ئەو

خواردوویەتی) لە (ئەو خواردووهەیەتی) ەوە هاتوە (ئێمە خواردوومانە) لە (ئێمە خواردووهەمانە) ەوە هاتوە (ئێوە خواردووتانە) لە (ئێوە خواردووهەتانە) ەوە هاتوە (ئەوان خواردوویانە) لە (ئەوان خواردووهەیانە) ەوە هاتوە

گوتمان ئەم (هـ) یە لە کوردیدا جاروبار فڕێ دەدرێ بە تایبەتی لەو جێگایانە کە پیتێکی بزوێن وەپاش یان وە پیشی دەکەوێ ، یانیش هەر دوولای لێ دەگرێ

وەك :

پەهلەوان ← پاڵەوان
قەهرەمان ← قارەمان
تەهران ← تاران
کورد هەواری ← کوردەواری
شوێن هەوار ← شوێنەوار
تاهیر ← تایر
ئیبراهیم ← برایم
بەهرام ← بارام
بەهمەند ← بامەند
هەسپ ← ئەسپ
هێسك ← ئێسك
هاسان ← ئاسان
هاون ← ئاون
هاوزا ← ئاوزا
هێوارە ← ئێوارە
هورمزیار ← ئورمزیار (ناوی خێڵێکی کوردە)
هەوڕۆ ← ئەوڕۆ
هومێد ← ئومێد

با نموونەیەکی تریش بینین : (بردن) .

چاوگ : (بردن) پارتیسیپ : (بردوو ..) فرمانی یاریدەدەر : (هەبوون) .

من بردوو هەمە (بوەتە) من بردوومە
تۆ بردوو هەتە (بوەتە) تۆ بردووتە
ئەو بردوو هەیەتی (بوەتە) ئەو بردوویەتی
ئێمە بردوو هەمانە (بوەتە) ئێمە بردوومانە
ئێوە بردوو هەتانە (بوەتە) ئێوە بردووتانە
ئەوان بردوو هەیانە (بوەتە) ئەوان بردوویانە

نموونەیەکی دیکەش : (هێنان)

چاوگ : (هێنان) پارتیسیپ : (هێناو ..) فرمانی یاریدەدەر : (هەبوون) .

من هێناو هەمە (بوەتە) من هێناومە
تۆ هێناو هەتە (بوەتە) تۆ هێناوتە
ئەو هێناو هەیەتی (بوەتە) ئەو هێناویەتی
ئێمە هێناو هەمانە (بوەتە) ئێمە هێناومانە
ئێوە هێناو هەتانە (بوەتە) ئێوە هێناوتانە
ئەوان هێناو هەیانە (بوەتە) ئەوان هێناویانە

ئیتر بەم جۆرە ، ئەگەر ترازاو (irregular) یان تێدا نەبێ ، بەشێکی زۆری فرمانەکانی کوردی ، وەك هەموو ئەو زمانانەی باسم کردوون ، بە هۆی فرمانی یاریدەدەر (هەبوون) ڕابوردووی تەواو ـ Perfectی خۆیان پێك دێنن .

**تێبینی :**

ئەم ئەندازەیە فرمانی «دارشتراو»و «لێکدراو» وەکو : خواردنەوە ، پێکردن،تێکدان .. و ئیتریش ناگرێتەوە .

*

ئینجا با بێینە سەر فرمانی «بوون ـ verb to be» کە لە ئینگلیزیو ئیسپانیانیدا ، بەڵام لە کوردیو زمانەکانی تر ، لە هەندێ حاڵەت ، لە باتی «هەبوون» دەبێتە «فرمانی یاریدەدەر ـ auxiliary verb» .

ئەو حاڵەتانە یان (فرمانی جووڵانەوە)ن یان (فرمانی تێنەپەڕ ـ intransitive verbs)ن .

فرمانی جووڵانەوە واتا ئەگەر فرمانەکە جووڵانەوە ، گواستنەوە ، یان گۆڕان لە حاڵەتێك بۆ حاڵەتێکی تری پێوەبوو وەك :

هەستان ، دانیشتن ، چوون ، ڕۆیشتن ، نووستن ، مردن ، فڕین ، کەوتن ... و ئیتریش .

**تێبینی :**

ئەوەی کە سەرنج ڕادەکێشێ ، هەموو ئەو فرمانی جووڵانەوانە ، لە هەمانکاتدا تێ نەپەڕیشن . بەڵام هەندێ فرمانی جووڵانەوە هەن وەکو «هێنان» ، «بردن» ئەمانە بە هۆی

«هەبوون» نەك «بوون»ەوە دەبنە ڕابوردووی تەواو ، چونكە تێپەڕن ـ transitive .

چاوگی «بوون» ئەمەیە :

| كوردی | ئەڵەمانی | ئیتالیانی | فرانسەیی |
|---|---|---|---|
| bûn | sein | essere | être |
| بوون | | | |

«بوون» یش وەك «هەبوون» هەر بە شێوەی ڕانەبوردوو گەردان دەكرێ و لە گەڵ پارتیسیپی ئەو فرمانەی كە دەمانەوێ بیكەینە ڕابوردووی تەواو ، لێك دەدرێن .

با فرمانی «نووستن» بە نموونە وەربگرین

چاوگ : (نووستن) پارتیسیپ : (نوستوو) فرمانی یاریدەدەر : (بوون) ..

| گەردان كردنی «بوون» لە حاڵەتی ڕانەبوردوودا | ڕابوردووی تەواوی «نووستن» (پارتیسیپ + بوون) |
|---|---|
| من .. م | من نووستوو .. م |
| تۆ .. یت | تۆ نووستوو .. یت |
| ئەو .. ە | ئەو نووستوو .. ە |
| ئێمە .. ین | ئێمە نووستوو .. ین |
| ئێوە .. ن | ئێوە نووستوو .. ن |
| ئەوان .. ن | ئەوان نووستوو .. ن |

نموونەیەكی‌تر : (هەستان) .

چاوگ : (هەستان) پارتیسیپ : (هەستاو)

فرمانی یاریدەدەر : (بوون) .

| گەردان كردنی «بوون» لە حاڵەتی ڕانەبوردوودا | ڕابوردووی تەواوی «هەستان» (پارتیسیپ + بوون) |
|---|---|
| من .. م | من هەستاو .. م |
| تۆ .. یت | تۆ هەستاو .. یت |
| ئەو .. ە | ئەو هەستاو .. ە |
| ئێمە .. ین | ئێمە هەستاو .. ین |
| ئێوە .. ن | ئێوە هەستاو .. ن |
| ئەوان .. ن | ئەوان هەستاو .. ن |

زۆر جار بێگانەیەك كە خەریكە تازە فێری كوردی ، ئەڵەمانی ، ئیتالیانی یان فرانسەیی دەبێ و هێشتا فرمانەكانی تێپەڕو تێنەپەڕو جووڵانەوەی بە تەواوی بۆ ساغ نەبووینەوە ، تووشی ئەم هەڵەیە دەبێ لە كاتی قسەكردندا . لەوانەیە كوردی نەزانێك بڵێ :

من گەیشتوومە
تۆ گەیشتووتە
ئەو گەیشتوویەتی
ئێمە گەیشتوومانە
ئێوە گەیشتووتانە
ئەوان گەیشتوویانە

یان ئەڵەمانی نەزانێك لە باتی (Ich bin angekommen) بڵێ (Ich habe angekommen) یان ئیتالیانی نەزانێك لە جێی (sono arrivato) بڵێ (ho arrivato) یان فرانسەیی نەزانێك لە جیاتی (Je suis arrivé) بڵێ (J'ai arrivé) . هەڵبەتا ئەمە ، نە لە كوردی نە لە ئەڵەمانی نە لە ئیتالیانی و نە لە فرانسەییدا نییەو نابێ .

**تێبینییەكی گرنگ :**

لە بەكارهێنانی (هەبوون) مەرجێك هەیە دەبێ لە كوردیدا ، بە پێچەوانەی زمانەكانی‌تر ، ڕەچاو بكرێت : ڕستە نابێ لە ڕاناوو فرمان و فرمانی یاریدەدەر پتر بێ واتا نابێ وشەیەكی تری بخرێتە ناو وەك بڵێی (من نانم خواردوو ..ە) ؛ یان ئامرازی نەیاندنی[2] تێدابێ وەك (من نەم خواردوو .. ە) . ئەم حاڵەتانە حیسابێكی كەیان هەیە كە لێرەدا جێی نابێتەوە .

هەر چۆنێكی بێ ، ئەوەی كە نووسیومە بێگومان هەمووشت نییە دەربارەی ئەم حاڵەتە «ڕابوردوو»ەی زمانی كوردی و بەراوردكردنی لەگەڵ زمانە ئەورووپاییەكان دا ڕێیەكە ئەوها سانا نییە ، پێچ و پەناو كووچەو كۆڵانی زۆرە . هێشتا لێكۆڵینەوەو لێكدانەوەیەكی زۆری دەوێ . بەڵام مەترسی كەمتەرخەمیی و ساربوونەوە[3] ، وای لێ كردم هەر نەبێ جارێ بەركوڵەك لەبەر دەمی زمانەوان و خوێنەری ڕێزمانی كوردی دابنێم . ئومێدەوارم سوودی لێوەرگرن .

**پەراوێز**

1 ـ ئەندازەیی یان ئەندازەدار = regular .
2 ـ نەیاندن (نە ـ یاندن) = (to say no) negation دژەكەشی : ئایاندن (ئا ـ یاندن) ، (to say yes) .
3 ـ لە ساڵی 1978دا لە لەندەن دەستم بەم لێكۆڵینەوە كرد بەلام تەواوم نەكردو وا تازە گەڕاومەتەوە سەری ..

غازی فاتح وەیس

# کتێبی زاراوەی کـوردیو چەند تێبینییەك

کتێبی زاراوەی کوردی لەلایەن مامۆستای بەڕێز دوکتۆر کامل بەسیرەوە دانراوەو بەتایبەتی بـۆ پۆلی یـەکەمی بـەشی کوردی ـ کۆلیجی ئاداب ـ زانکۆی سەلاحەدین ئامادەکراوە . ئەرکی ووتنەوەی ئەم کتێبە ئەوا بۆ سێ ساڵ ئەچێ سپێرراوە بەمن . ئەگـەر یەکێـك سێ ساڵ وانـەیەك بلێتـەوەو کتێبێکی تایبەتیش بناغەی ئەو وانەیە بێ ، ئەوا گومانی تێدا نییە ئەبێ ئـەو کەسـە بتوانی لایـەنی خراپیو چـاکی ، هـەر نـەبێ لەگۆشەیەکەوە ، دەستنیشان بکات . جالێرەدا بەشێوەیەکی هێمنو لەسەرخۆو دوور لەشکاندنەوەو پێشێلکردنی ڕاستی دەربارەی ئەو کتێبە ئەدوێمو هیوادارم مامۆستای بـەڕێزیش دوکتور کامل بەدڵێکی فراوانەوە بڕوانێتە مەسەلەکە .

1 ـ لەپێشەکی کتێبەکەدا ئەڵێ :

« بەڵگە نەویستو ئاشکرایە کە زاراوە بەردی بنـاغەی لەدایـك بـوونو پێکهـاتنی زمـانی نـەتـەوایـەتی میللەتـە پێشکەوتووەکانی ئەم سەرزەمینەیە » .. ل (3) ـ

هەروەها لەلایەکی تریشەوە ئەڵێ :

« ئـەم ووشانـە (واتە ووشـەی دیکـە نـەك زاراوە) ـ هەروەکو ئاشکرایە ـ تایبـەتی نین بـەبەشێـك لەبەشـەکانی زانیاری بەڵکو ووتەی سەر زمانی هەموو کەرتەکانی کۆمەڵنو خوێندەوارو نەخوێندەوارو پیاو ژنو گەنجو پیر بۆ گفتـوگۆی ڕۆژانە بەکاریان دەهێنن » .. ل (26) .

واتـە ئەم جـۆرە ووشانـە نـابن بـەزاراوە . ئـەم دوو هەڵوێستە بەئاشکرا دژی یەکدین چونکە لەلایەکەوە ئەڵێ زاراوە بەردی بناغەی لەدایك بوونی زمانەو لەلایەکی تریشەوە ئەڵێ ووشەی ڕۆژانە نابێ بکرێ بەزاراوە بەلام لەڕاستیدا قسەی ڕۆژانە بەردی بناغەی لەدایكبوونی زمانە نەك زاراوە ، چونکە زاراوە ئەگەر وەکو ناوێکیش حیسابی بۆ بکری ئەوا ماوەیەکی زۆر نییە بەکارهێنراوەو ئینجا لەسەرەتای پەیدابوونی زماندا هەر نەزانراوە زاراوە چییەو بگرە خوێنـەوار هەر نـەبووە بـۆ ئەوەی زاراوەو قسەی ڕۆژانە لەیەکدی جیابکاتەوە . هەروەها زانـاکانی مێـژووی زمانیش سـەرەتای پـەیـدابـوونی زمـان ئەبەستن بـەچەنـد جوڵانـەوەو دەنگە دەنـگو قیژە قیـژێکی ئادەمیزادەوە ئینجا قسەی ڕۆژانە بەرە بەرە پەیدا بووەو لەو سەردەمەشدا ئادەمیزاد نەیزانیوە تەکنەلۆژیا چییەو کاربۆنو ئوکسجین چین .

2 ـ هەر لە هەمان لاپەڕەدا دوکتۆر کامل ئەڵێ :

« بۆیە کۆڕی زمانیو زانیاری ئەو میللەتانە گرنگییەکی تایبەتی بە لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی زاراوە دەدەنو فەرهەنگی پسپۆر بۆ گشت لایەنەکانی دادەنێن » .. ل (3) .

لەنێو میللەتە پێشکەوتووەکاندا هـەر پسپۆرێـك ، وەیا چەند پسپۆرێك هەریەکە لەئاستی خۆی ئەو زاراوانە دائەنێ کە لە بواری ئیشو کارەکەیاندا پێویستن وتاقە کەسێك مافی ئەوەی نییە زاراوە بۆ هەموو بـوارەکانی زانیـاری و زانست دابنێ . لەڕاستیدا زاراوە بەزۆر دانانرێو وەکـو تەوق نـاکرێتـە ملی خوێنەرانو نووسەران ، بەڵکو بەپێی پێویست ووشەی نوێ دروست ئەبێو لەشوێنێکی تـایبەتیـدا بەکـار ئەهێنـرێ . بۆ نمـوونە ئـەگەر چـەند پسپۆرێك لەلابـرۆتەرێکـدا خـەریکی دۆزینـەوەی شتێك بـوونو چەنـدەیا کـەرەستەی تـازەیـان لەپێناوی دۆزینەوەی ئەوشتەدا بەکارهێنـا ، ئەوا ئـەوچەنـد کەرەستەیە هەریەکە بەپێی ڕەنگو بۆنو جۆری بەکارهێنانی ناوێکی تایبەتی لێئەنرێو جار جاریش ئەو کەرەستەیەی کە بۆ

یەکەم جار دروست ئەکرێ بەناوی دروستکەرەکەیەوە ناوی لێئەنرێ . دوابەدوا ئەگەر ئەو کەرەستەیە لەبواری دروستکردن چووە دەرەوەو چووە نێو مەزرای بەکار هێنانەوە ئیتر خەڵکەکە بەبێ دەستکاری‌و سەرسوڕمان بەکاری ئەهێنن‌و دەستکاری ناوەکەشی ناکەن .

جالێرەدا دەرئەکەوێ کە پسپۆڕێتی (الأختصاص) دەورێکی باڵا ئەبینێ بۆ چەسپاندنی زاراوە وەیا ناوی تازە ، بەلام چونکە ئێمە بەهەموو ئاشێکیدا ئەکەین بۆیە ئەو زاراوانەی کە لەخۆمانەوە دایان ئەنێین زۆربەی خەڵکی پێیان قایل نابن‌و زوو ئەمرن . جگە لەمەش ئێمە کەسمان نییە لە لابرۆتەردا کاربکات وەیا لەکارگەی دروستکردنی ئۆتۆمبیل‌و فرۆکەو ئەلەکتریک‌و کەشتی ئاسمانی‌و بواری تەکنەلۆژیا بەگشتی ، بۆ ئەوەی زاراوەی نوێ دروست بکرێ . ئەوەی هەیەو نییە بواری ئەدەب‌و زمانەو چەند زاراوەیەکی ئاسایی‌یان ئەوێ ، جگە لەچەند بوارێکی تەسکی دیکە . بەلام لەبەر ئەوەی بە پسپۆڕی‌ی زاراوەکانی ئەم بوارانە دائانرێن‌و کەسیش ئەوی دی بە پسپۆر دانانێ ، بۆیە ووشەی نوێ‌و زاراوەی نوێ سەرمان لێ‌ئەشێوێنێ و هەر ووشەیەکی نوێش ، ئەگەر دابنرێ ، خوێنەر خێسەی لێ‌ئەکا . بۆ نموونە هەریەکێك لەئێمە خۆی بەهەموو شتێك دائەنێ ، بەچیرۆك نووس‌و شاعیرو هونەرمەندو نووسەرو فۆلکلۆرزان‌و زمانەوان‌و ڕەخنەگر ... هتد . بەلام ئەگەر ، بۆ نموونە ، من تەنیا ڕەخنەگربم‌و ئەو شاعیرو ئەوی دی زمانەوان‌و ئەوی دی چیرۆك نووس ، ئەوا هەر زاراوەیەکی نوێ بۆ ڕەخنە بشێ ڕەخنەگر دایئەنێ‌و چیرۆك نووس بەکاری ئەهێنێ‌و ئەوەی زمانەوان دایبنێ ئەبێ چیرۆك نووس بەکاری بهێنێ . بەلام تەنگو چەڵەمەکە لە دانانی زاراوەدا نییە بەڵکو لەتێکدانی زاراوەدایەو هۆکەشی نەبوونی پسۆڕێتی‌یە ، چونکە ئەگەر زمانەوان زاراوەیەکی تازە دابنێ ، چیرۆك نووس لەئاستی خۆیەوە نارەزایی لە ئاستیدا دەردەبڕێ‌و زاراوەیەکی دیکە ئەهێنێ بەم جۆرە زاراوەی یەکەم هەڵئەواسرێ‌و زاراوەی دووەمیش لەبار ئەچێت‌و هیچیان بەزیندوێتی نامێنێتەوە .

3 — دوکتۆرکامل ئەلێ :

« لیکسیکۆلۆژی زمانی کوردی یاسای ووتوویژی ئەمرۆو دوێنێ‌و شێوەی پەیدا بوون‌و پێشکەوتن‌و گەشەکردنی زمانەکەمان‌و پەیوەندی لەگەڵ مێژووی گەلی کوردمان بۆ دەردەخات‌و ڕوونی دەکاتەوە » .. ل (10)

لیکسیکۆلۆژی یاسای ووتوویژی ئەمرۆو دوێنێ دەرناخات چونکە لیکسیکۆلۆژی پێوەندی بەیاساوە نییەو دەربارەی مێژووو بەسەرهاتی میللەت نادوێ بەڵکو لیکسیکۆلۆژی دانانی فەرهەنگە بۆ ووشەی زمان و بۆ ئەوەی ئەگەر یەکێك واتای ووشەیەکی نەزانی لە فەرهەنگدا دەری بهێنێ . بۆنموونە لەفەرهەنگدا ووشەیەك ئەکرێ بەسەرەتا (Head) وەیا (Entry) و ئەو ووشانەی کە پێوەندی‌یان بەو ووشەیەوە هەیە لەدوایەوە ئەنووسرێنەوە لەگەڵ واتاو شی‌کردنەوەیاندا . دانانی فەرهەنگیش ڕێبازی تایبەتی خۆی هەیەو ئەبێ لەدانانی فەرهەنگدا پەیرەوی چەند یاسایەك بکرێ‌و ئەم ڕێبازو یاسایانەش ئەکەونە بواری لیکسیکۆلۆژییەوەو لیکسیکۆلۆژیش جودایە لە لیکسیکۆگرافی .

4 — هەروەها دوکتۆری بەرێز ئەلێ :

« لە سنووری چێوەی سەر ئەنجامەکانی سیمانتیکدا (علم الدلاله) خولاینەوەو کەلکمان لە ووشەڕوونان‌و لیکسیکۆلۆژی وەرنەگرت ئایا دەگەینە مەبەست‌و ئامانجی لێکۆڵینەوەکەمان ؟ یاخود پێویستە لەبەر ڕۆشنای سروشتی کێشەی زاراوە لە زمانەکەی خۆماندا قوڵی مەردانەی لێ‌هەڵکەین » .. ل (11) .

سیمانتێك ، واتە واتا سازی ، ڕەفزی هەموو ووشەیەکی بێ‌واتای زمان ئەکاو ئەگەر لەڕووی فۆرمیشەوە تەواو نەبێ ناچێتە نێو فەرهەنگەوە ، جا لەبەر ئەمە هەر ووشەیەك وەیا زاراوەیەك ئەگەر لەڕووی ناوەرۆك‌و فۆرمەوە تەواو نەبوو ئەوا گومانی تێدا نییە کە ئەو زاراوەیە نابێتە زاراوەیەکی چەسپاو لەزماندا ئینجا هەڵبەتە ئەو زاراوانەی کەدوکتۆر کامل دایناون‌و تائێستا نەچەسپاون ، لەم ڕووەوە کەم‌و کورتی‌یان تێدایە .

5 — لەلاپەرە (13) دا ئەلێ :

زۆر جار زاراوەیان لەگەڵ ووشەی فەرهەنگی‌و واژەی خەڵکیدا تێکەڵ کردووە .. ل (13) .

دوکتۆر کامل خۆشی ئەم کارەی کردووەو چەندەیا ناوی ڕۆژانەی بەزاراوە لەقەڵەم داوە . بۆ نموونە دوکتۆر ئەم ناوانە بەزاراوە دائەنێ : پایسکیل ، کتێب ، شێر ، مێرگە سوور ، ڕەشماڵ ، دارتاش ، بەرماڵ ، ئاسنگەر ، مزگەر ، گاسن ،

ـنبەند ، باخـەوان ،نانکەر ،ئیشکـەر ، فێرگـە ، دارستان ، میشوولە ، گوێچکە ، چاوێلکە ، مەسینە ، دەسك ، سەریین ، ـِستە ، فرۆکە ، مردوو ، نەخۆش ... هتد . لە کاتێکدا ئەمانە هەموو ناون‌و وا دەرئەکەوێ دوکتۆر هەموو نـاوێك بـەزاراوە ـ ئەنێ ، ئینجا هەرووشەیەکی ، وەیا ناوێکی عەرەبی ، ئەگەر ـەرانبەرەکەی لەکوردیدا هەبێ یا نەبێ ، ووشەیەکی کوردی ـبۆ دائەنێ‌و ناوی زاراوەی لێ‌ئەنێ .

لەلایـەکی ترەوە ئـەم ووشـانـەی خـوارەوە بـەزاراوە ـ انانێ : سی ، (الرئتان) ، ڕێز ، دڵسۆزی ، دەست پاکی ، کەم تەرخەمی .. ل (26) .

لێرەدا ئەپـرسین ئـایا بـۆچی گوێچکـە زاراوە بێ‌و سی (الرئتان) زاراوە نەبێ ؟ ئایا هـەردووکیان دوو ئـەندامی لەشی ئادەمیزادنین ؟ ئایائەبێ جیاوازییان هەبێ لەڕووی زاراوەوە ؟ هـەروەها ئـا یا بـۆ چی دڵسـۆزی زاراوە نـەبێ‌و نـەخـۆشی زاراوەبێ ؟ هەروەها بۆچی دەست‌پاکی زاراوە نەبێ‌و ڕەشماڵ زاراوەبێ ؟ بێگومان ئەو ووشانەی سەرەوە هەموویان ناون‌و ناویش یا ناوی ماددییـە وەیا نـاوی مەعنـەوی‌یە وەیـا ناوی هەستییە وەیا ناوی شتێکە . بەلام ئەگەر ئەو هەمـوو ناوێـك بەزاراوە دابنێ ئەویش مـەسەلەیـەکی دیکەیـە . ئەگـەر ناو بەزاراوە دابنێ ئەوا هەڵەیەو ئەگەر ناویش بەزاراوە دانـەنێ بۆچی سەدان ناوی کردووە بەزاراوە .

6 — دوکتۆر ئەیەوێ بەپێی ناساندنی ئەرستۆ ووشە بناسێنێ چونکە وەکو خۆی ئەڵێ ئەرستۆ دەربارەی ووشە ووتوویەتی :

« ووشە یاخود ناو واژەیەکە لەچەند دەنگێك پێك‌هاتووەو واتـای هەیـەو هیچ پـارچەیـەکی خۆی لەخـۆیـدا واتـایـەك نابەخشێ » ... ل (14) .

بەلام لەزمانەوانی‌ی سەردەمی ئێستـادا هێشتا هیـچ زمانەوانێك نەیتوانیوە بڵێ ئەمە ناساندنی تەواوی ووشەیەو هەر ئەوەندەی توانیوە بڵێ لەوەیە ووشە بەم شێـوەیە بنـاسێنرێ چونکە ناتوانرێ سنوورێکی تەواوی بۆ دابنرێ لە زماندا . بۆ نموونە « بلۆم فیلد » ی زانا ئەڵێ : ووشە سەربەسترین فۆرمە لەزماندا . بەلام بەگوێرەی ناساندنەکـەی ئەرستـۆ بێ ئەبێ کـەرتێکی ووشە واتـا نەبـەخشێ کەچی دەیـان ووشەی نێـو کتێبەکەی دوکتۆر کامل ئەگەر کەرت بکرێن هەندێکیان هەردوو کەرەتەکەیان واتای سەربەخۆ ئەبەخشن‌و هـەندێکی تـریان کەرتێکیان واتا ئەبەخشن‌و کەرتەکەی دیکەیان واتا نابەخشن .

**بۆ نموونە :**

**ڕەش + ماڵ**

**نان + کەر**

**ڕێك + کەوتن**

**ئاسن + گەر**

**گوێ + چکە .. هتد .**

لەوەیە یەکێك بڵێ لەوەیـە ئەرستـۆ مەبـەستی ووشەی لێکدراونەبێ ، بەلام « بۆ » و « بە » و « لە » و « بەڵکو » .. هتد لە فەرهەنگدا حیسابی ووشە یـان بۆ ئـەکرێ‌و ووشـەی « دەست لێ‌هەڵگرتن » و « پێ‌شێل‌کردن » و « هەڵ ماڵین » و « پێ‌لێ هەڵبڕین » یش هەر حیسابی ووشەیان بـۆ ئەکـرێ . لەبەر ئەم هۆیەو جۆرەها هۆی دیکە ناتوانرێ بەتەواوەتی ووشە سنووری بۆ دابنرێ .. وەیا با بڵێین بناسێنرێ .

6 — هەر لەهەمان لاپەڕەدا ئەڵێ :

ووشە ئەبێ ئەم خاسیتانەی خوارەوەی تێدا هەبێ :

1 — « پێکهاتنی فۆنەتیکی هەبێ » .. ل (14)

ئایا مەبەست لەپێکهاتنی فۆنەتیکی چیە ؟ ئایا ئەبێ بتوانرێ بدرکێنرێ وەیا ببیسترێ وەیا لەڕەی تایبەتی هەبێ ؟ بـەلام مرۆڤ ئەتوانێ هەمـوو جۆرە دەنگێـك بدرکێنێ واتـادارو بێ واتاش .

2 — ماناو واتادار بێ .. ل (14) .

ئایا ماناو واتا جیاوازییان هەیـە ؟ جگە لەمـەش ووشە هەیە واتای نییە وەکو « بۆ » و « بەڵکو » .

3 — قەوارەی ڕێزمانی هەبێ .. ل (14) .

ووشە هەیە تەنیا ئەرکی ڕێزمانی هەیەو ووشەش هەیە ئەرکی ڕێزمانی‌ی هەیەو واتاش ئەبەخشێ .

بۆ نموونە « بە » « بۆ » « بەڵکو » تەنیا دەوری ڕێزمانی ئەبینن‌و ووشەی « ئازاد » واتای هـەیەو دەوری ڕێـزمانیش ئەبینێ .

**4 — هەمیشە خاوەنی دەنگ‌و مانابێ .. ل (14)**

**دووبارەکردنەوەی خاڵی یەکەم‌و دووەمە .**

**5 — پتر لەیەك گیرەی نەبێ .. ل (14) .**

**ئەگەر مەبەست لەگیرەستریس‌بێ ئەوا ووشەی سێ بـڕگەیی**

لەیەك گیرە زیاتری هەیە .
6 – بتوانرێ لە ڕستەدا بەکاربهێنرێ .. ل (14) .
دووبارەکردنەوەی خاڵی سێیەمە .
7 – تواناى هەبێ ببێ بەئیدیۆم .. ل (14) بەلام هیچ ووشەیەك بەتەنیا نابێتە ئیدیۆم چونکە ئیدیۆم بریتیە لەکۆمەڵێك ووشە . ئەگەر مەبەست ئەوەبێ کە ئەبێ هەموو ووشەیەك لەگەڵ ووشەی دیکەدا ببێ بەئیدیۆم ئەوا دیسان هەموو وشەیەك ئەم کارەی پێ ناکرێ .
7 – دوکتۆر کامل ئەڵێ (الشریف الجرجانی) ئەڵێ واژەی (الاصطلاح) ڕێکەوتنی تاقمێکە لە کۆمەلانی خەڵکی دەربارەی ناونانی شتێك یاخود کارێك بەووشەیەك لەواتایەکەوە بۆ واتایەکی تر گواسترابێتەوە .. ل (16)

بەپێی ئەم ڕایە بێ ئەبێ کۆمەڵێك خەڵك زاراوە دروست بکەن نەك تاقە کەسێك ! ئینجا دوکتۆر کامل ئەڵێ : بێگومان پێناسەکەی (الجرجانی) و ڕوون کردنەوەکەی (الکفوي) دەربارەی زاراوە هەموو شتێك لەم ڕووەوە پێك ناهێنن ... ل (16) .

بەلام دوکتۆر هیچی نەخستووەتە سەر پێناسەکەی (الجرجاني) چونکە هەر ئەو پێناسەیە دابەش ئەکات بەسەر چوار تایبەتیدا . بۆ نموونە لەتایبەتی یەکەمدا ئەڵێ :

ئەوە دەسەلمێنێ کەزاراوە چەشنێکە لەووشە .. ل (16) .
(الجرجانی) یش ئەڵێ ناونانی شتێك بەووشەیەك . هەروەها لەتایبەتی سێیەمدا ئەڵێ :

ئەوە دووپات دەکاتەوە کە زاراوە واژەیەکی نوێیەو دوو واتایان پتری هەیە ... ل (16) . الجرجانیش ئەڵێ لەواتایەکەوە گواسترابێتەوە بۆ واتایەکی دیکە . بەلام دیسان ئەگەر بەپێی ئەم تایبەتییە بێت ئەوا ئەبێ هەموو ئەو زاراوانەی کەدوکتۆر تۆماری کردوون دوو واتایان هەبێ بەلام بەدەگمەن وشەی وەیا زاراوەی هێناوەتەوەو دوو واتای بەخشیبێ . بۆ نموونە ئەم ووشانە تاقە واتایەك ئەبەخشن و ئەو بە زاراوەی داناون : ڕژێم ، خوا نەناسین ، شیاو ئایین ، باوەڕ ، هەبوون ، ئەنجام .. هتد .
8 – لەلاپەڕە (17) دا ئەڵێ :

تیۆری یەکەم : تێڕوانینی خۆی لەسەر هەڵوێستێکی ئاینیدا ڕەچاو کردووەو بڕوای وایە کە زمانی ئادەمیزاد لە خواوە وەرگیراوەو ووشەو دەربڕینەکانی (توقیفین) .. ل (17) .

بێگومان ئەم تێورە جێی متمانە نییە چونکە ئاشکرایە کە زمان ئەگۆڕێ . لەبەر ئەمە پێویست ناکات تیوێریوا بنووسرێتەوە ، ئەمەش هەروەکو ئەو تیوێرەیە کەئەڵێ دەنگی مرۆڤی ڕەش و سپی جیاوازە .
9 – سەر ئەنجام نابێ بۆ تاقە مەبەستێك و یەك واتا پتر لەیەك زاراوە بەکار بهێنرێت و سەر لەخوێنەرو گوێگری کورد تێك بدرێ .. ل (24) .
مەبەستی دوکتۆر ئەوەیە کەنابێ دوو زاراوە بۆ یەك مەبەست بەکار بهێنرێت ، هەروەکو ئەڵێ نابێ « جوانکاری » و « شیرین کاری » هەردووکیان بۆ (الابداع) بەکاربهێنرێن . هەروەها ئەڵێ نابێ « نووسین » و « دارشتن » هەردووکیان بۆ « الانشاء » بەکاربهێنرێن ، واتە ئەبێ یەکێکیان بەکاربهێنرێت و هەمووشمان ئەزانین ووشەی « نووسین » بە پڕی ووشەی (الکتابە) ی عەرەبییە . بەگوێرەی ئەم ڕایەی دوکتۆر بێ نابێ « مرادف » ، لەزمانی کوردیدا هەبێ ، بە تایبەتی لەبواری زاراوەدا . ئەو لە لایەکەوە (داڕشتن) بەرانبەر بە (الأنشاء) دائەنێ (ل : 25) و لەلایەکی ترەوە ووشەی (دەربڕین) بەرانبەر بە (الأنشاء) دائەنێو (ل 29) لەلایەکی تریشەوە (داڕشتن) بەرانبەر بە ووشەی (الصیاغە) و (الأشتقاق) دائەنێ (ل 30 و 31) کەچی « دەربڕین » بەرانبەر بە (التعبیر) ی عەرەبی دائەنرێ . ئەمە لەلایەکەوە ، لەلایەکی تریشەوە « بوون » ی بەرانبەر بە (الکون) داناوە کەچی ووشەی «گەردوون » بەرانبەر بە (الکون) دائەنرێو (بوون) بەرانبەر بە (الوجود) . هەروەها لەلایەکەوە « زانا » بەرانبەر بە (العارف) دائەنێو لەلایەکی تریشەوە « دانا » بەرانبەر بە (العارف) دائەنێ ل (41 و 42) .

هەروەها ووشەی « سوخرەکێش » بەرانبەر بە « العمیل » دانانرێ بەڵکو ئێمە دوو ووشەی زۆر بەکارهاتوومان هەیە بەرانبەر بە « العمیل » وئەویش ووشەی « بەکرێگیراو » و « نۆکەر » هەروەکو شاعیری پایە بەرزی کورد (فایق بێکەس) ئەڵێ :

**کورد ئەبەد ناگاتە مەقصەد ، نۆکەری بێگانەیە**
**دوو دڵن ، پیسن لەگەڵیەك ، بۆیە وا بێ لانەیە .**

جیاوازی نێوان « سوخرە کێش » و « نۆکەر » ئەوەیە کە

سوخرەكێش بەزۆر سوخرەی پێ ئەكرێ ، بەلام « نۆكەر » كە پڕ بەپێستی (العمیل) ی عەرەبییە ، بە خوایشتی خۆی ئەبێ بەبەكرێگیراو . جگە لەمەش سوخرەش ووشەیەكی عەرەبییە (السخرة) (ل 42 )

10 — دوكتۆر كامل ئەڵێ (ك) ی ووشەی كلاسیك زیادەیەو نابێ بەكار بهێنرێ چونكە ووشەی (Classiss) ی لاتینی (جا نازانم مەبەستی لەزمانی لاتینییە یا زمانی ئینگلیزی) (ك) ی تێدانییە . بەلام ئێمە ووشەی كلاسیكمان لە لاتینییەوە وەرنەگرتووە چونكە هیچ خوێندەوارێكی كورد زمانی لاتینی نازانێو بگرە كەم ئینگلیزیش ئەم زمانە مردووە ئەزانن ، ئینجا ئەگەر ئێمە زمانی لاتینی نەزانین چۆن ووشەی لێوە وەرئەگرین ؟ بەم جۆرە یا ئەبێ ئێمە ئەم ووشەیەمان لەعەرەبییەوە وەرگرتبێو عەرەبیش لەئینگلیزییەوە وەریان گرتووە وەیا یەكسەر لەزمانی ئینگلیزییەوە وەرمان گرتووە . ئەگەر لەعەرەبییەوە وەرمان گرتبێ ئەوا ووشەكە دەنگی [ ك ] ی تێدایە وە ئەگەر لەئینگلیزییەوە رەرمان گرتبێ ئەوا دیسان ئاوەڵناوی ناوی (class) ئینگلیزیمان وەرگرتووە كە دەنگی [ ك ] ی تێدایەو (classic) بەپێی دەستووری فۆنۆلۆژی كوردی دەنگی [ ك ] لەپێش دەنگی [ س ]ەوە نایەت ئەگەر ڤاولێكیان لەنێواندا نەبێ . بۆنموونە ووشەی (Phonetics) و (Semantics) فۆنەتیكس و سیمانتیكس ناونو ئاوەڵناوەكانیان بەبێ دەنگی [ س ] ە واتە ئەبن بە (Phonetic) و (Semantic) فۆنەتیكو سیمانتیك ، ئێمەش ، چونكە دەنگی [ س ] لە دوای [ ك ] وە نایەت ، ئەوا دەنگی [ س ] فڕێ ئەدەینو وەكو ئەوەی لێدێ ئاوەڵناوەكەمان وەرگرتبێ . بەم جۆرە كلاسی ی دوكتۆر كامل هەڵەیەو ئەبێ كلاسیك بەكاربهێنرێ .. ل (54) .

11 — دیسان لەلاپەڕە (55) دا ووشەی قەڵەم وەكو هەموو ناوەكانی دی بەزاراوە لەقەڵەم ئەدا كە ئاشكرایە قەڵەم ناوە نەك زاراوە ؟

12 — دوكتۆر كامل لەلاپەڕە (57 و 58) دا دەست ئەكات بەتێكەڵ كردنی زاراوەو ئیدیۆم . بۆ نموونە « ئاگرنانەوە » و « شێر » بەپێی میتافۆر ئەكات بەزاراوە ، ئەگەر چی میتافۆر وەیا (مجاز) یەكسەر بەستراوە بەئیدیۆمەوە . جگە لەمەش تەشبیە كردنی (شێرێكم لەبازاڕ دی) هەڵەیەو ئەبێ بووترێ (وەكو شێر لەبازاڕدا ئەسوڕایەوە) وەیا « وەكو شێر گەڕایەوە ماڵەوە » ئەمەش ئیدیۆمە نەك زاراوە چونكە لەتێكستی وادا نەبێ « شێر » ئەو دەورە ناگێڕێو واتاكەشی لێرەدا (مجاز) یە . هەروەها ئاگرنانەوەش ئیدیۆمە چونكە ئەگەر مەسەلەكە كردنەوەی ئاگربێ ئەوا ئەبێ بڵێین (ئاگری كردەوە) . جگە لەمەش (metaphore) لەدووبەش پێك دێت بەشی یەكەم (meta) كە بە واتای « گۆڕین » دێو (Phore) بەواتای « هەڵگر » واتە گۆڕینی واتایەكی (حەقیقی) بۆ (مەعنەوی) و ئەبێ ئیدیۆم بێ ، واتە ئەبێ لەرستەیەكدا بەكار بهێنرێ ئەگینا واتا مەجازییەكە دەرناكەوێ .

13 — دوكتۆر كامل تەنیا لەلاپەڕە (61) دا ناوو زاراوەی لەیەك جیاكردووەتەوە بێ ئەوەی پەنجە بۆ ئەم جیاكردنەوەیە رابكێشێ . چونكە « زمان » ئەبێتە ناوێك ئەگەر بۆ ناوی ئەو پارچە گۆشتە بەكارهێنرا لەناو زاردایەو ئەبێتە زاراوەیەك ئەگەر بەرانبەر بە (اللغه) بەكارهێنرا .

14 — بۆ سازكردنی ووشەی نوێ ، وەیا وەكو دوكتۆر كامل ئەڵێ زاراوەی نوێ ، حەوت رێبازی تۆمار كردووە . بەلام راستییەكەی دوو رێباز هەیە یەكێكیان رێبازی لێكدانە و ئەوی تریان رێبازی وەرگێڕان . رێبازی لێكدان لەناو زمانەكەدا بەكار ئەهێنرێو رێبازی وەرگێڕان لە دەرەوەی زمانەكەوە بۆ نێو زمانەكە . بەم جۆرە رێبازەكانی وەرگرتن ووەرگێڕان بەیەك رێباز لەقەڵەم ئەدرێنو رێبازی لێكدانو داتاشینو داڕشتنو زرەڕێژ بە یەك رێبازو (وەكو دوكتۆر مەكەنزی بەكاریان ئەهێنێ لە كتێبەكەیدا بۆ دروست كردنی ووشە) رێبازی ئاوەڵواتاش پێوەندی بەئیدیۆمەوە هەیە نەك زاراوەو ناو .

15 — لە لاپەڕەی 118 دا ئەڵێ : هەروەها زاراوەی (كۆما) پڕ بەپێستی زاراوەی (الفارزه) ی عەرەبییەو بێ ی ناوێ هەوڵی دروست كردنی زاراوەیەكی تری وەكو زاراوەی (زنگوڵ) لەبری ئەو زاراوە جیهانییە بدەین .. (ل 118) ئەڵێ :

هەروەها هەر لەهەمان لاپەڕەدا ئەڵێ :

كەوابوو ئێمە پەسەندی بەكارهێنانی زاراوەی (كۆننۆنت) ی جیهانی ناكەین . لەلایەكەوە پەسەندی زاراوەی جیهانی ئەكاو لەلایەكی ترەوە پەسەندی ناكات بێ ئەوەی هۆیەك دەستنیشان بكات . جگە لەمەش بڕیاری بەكارهێنانی ریالیزمو سریالیزم ئەداو هی فۆرمو ڤاوڵ نادات و هەمووشیان ووشەی جیهانین .

16 — لەلاپەڕە (136) دا دوکتۆر کامل ئەڵێ ڕەخنە پڕ بەپڕی ووشەی (Criticism) و (النقد) ی عەرەبی نییە ، چونکە ڕەخنە لەکوردیدا واتای عەیبدار ئەگەیەنێو (ڕەخنە سازی) داناوەو ئەڵێ (ڕەخنە) چاکیو خراپی ئەگەیەنێو (ساز) یش بە واتای (شتی جوانی ڕێکخراو) دێت کە نرخی هونەریی ئەدرێتە پاڵ . بەلام ووشەی (Criticism) ی ئینگلیزی لەژیانی ڕۆژانەو بواری ئەدەبیشدا بە کارئەهێنرێ و سەدان جار گوێم لێبووە لەقسەی ڕۆژانەدا ئینگلیز بەکاری هێناوە . ئەمە لەلایەکەوە ، لەلایەکی ترەوە (ساز) بەواتای شتی ڕێکخراوی جوان نایەت بەڵکو بەواتای (التهیأة) و (الصنع) ی عەرەبی دێتو لەگەڵ بەشێکی دیکەدا ناوێك بۆ ناوی دروستکەری کەرەستەیەکی ماددی دروست ئەکا ، وەکو (دانساز) و (چەخماخ ساز) . سەرەڕای ئەمەش (ڕەخنە) دەمێکە لەناو زمانی کوردیدا بەکار هێنراوە ئیتر بۆچی ووشەیەکی دیکە داتاشین ، هەر لەبەر ئەمەشە ووشەی نوێ جێگە بەخۆی ناگرێ لەناو زمانی کوردیدا .

17 — لەلاپەڕە . (138) دا ئەڵێ ووشەی ناوەڕۆك ناتوانێ بەرانبەر بە « بیبلیۆگرافیا » بوەستێو ئەم ووشەیە لەگریکیدا واتە زانیاری لەسەرکتێب نووسینەوە . بەلام ئەم ووشەیە لەئینگلیزیو فەرەنسیدا بەو کۆمەڵە سەرچاوەیە ئەوترێ کە نووسەرێك سوودیان لێ وەرئەگرێ بۆ نووسینەوەی ووتارێك وەیاکتێبێك ،واتە ئێمە چۆن لەکۆتای کتێبێکدا ئەنووسین (سەرچاوەکان) ئینگلیزیش ئەنووسێ « بیبلیۆگرافی » . هەروەها ئێمە ئەم ووشەیەمان لەگریکییەوە وەرنەگرتووە بۆ ئەوەی لە باتی زانیاری نووسینەوەی کتێب بەکاری بهێنین چونکە ئەگەر ئێمە زمانێك نەزانین چۆن ووشەی لێوەرئەگرین . بەم جۆرە بیبلۆگرافیا بەرانبەر بەسەرچاوە دائەنرێ نەك لەباتی ناوەڕۆك وەیا زانیاری کتێب نووسینەوە .

18 — هەروەها دوکتۆر کامل ووشەی « هەستیار » لە (ل 141) لەسەر ڕووەزنی جووتیارو فرۆشیار بۆ شاعیر دائەنێو هەستیاریش واتە ئەوکەسەی هەستی هەیەو بەپێی ئەمە بێ ئەبێ تەنیا شاعیر هەستی هەبێ .

جگە لەو تێبینیانە جۆرەها تێبینی دیکە لەو کتێبەدا بەرچاو ئەکەون ، بەلام لێرەدا ئەوەندەمان لێهەڵبژاردو ئەوەی مابێتەوە لەدەرفەتێکی دیکەدا دەستنیشانیان ئەکەین .

# چی تریش زمانی نو

## - بەشی دووەم -

52 — **د . جەمال نەبەز ، زمانی یەکگرتووی کوردی ، بامبێرگ ، 1976 .**

ئەم کتێبە (127) لاپەڕەیە . لە زوربەی زۆری ئەو کێشانە دەدوێ کە پێوەندییان بە سازبوونی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردییەوە هەیە .

53 — **حامید فەرەج ، ڕێنووسی کوردی لە سەدەیەکدا ، بەغدا ، 1976 .**

نامیلکەیەکی (42) لاپەڕەییە ، بریتییە لە پیشاندانێکی ئێجگار کورتی کەمێك لەو نووسراوانەی پێوەندییان بە ڕێنووسی کوردییەوە هەیە(9) .

54 — **شێخ محەمەدی خاڵ خاڵ ، فەرهەنگی خاڵ ، جزمی سێهەم ، سلێمانی ، 1976 .**

(9) لەبارەی ئەو نامیلکەیەوە ، بڕوانە :

أ ـ محەمەدی مەلا کەریم ، (ڕێنووسی کوردی لە سەدەیەکدا) لەبەر ڕووناکیی ڕەخنەدا گۆڤاری ، ڕۆژی کوردستان ، ژ 43 — 44 ، بەغدا ، 1977 ، ل 53 — 56 .

ب ـ د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، کورتەیەکی مێژووی نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبێ ، ، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد ، ، بەرگی هەشتەم ، بەغدا ، 1981 ، ل 66 .

## لــــە بـــــارەی کـــوردیـــیـەوە ســـــــراوە

ئەم بەرگەی فەرهەنگی خاڵ 512 لاپەڕەیەو لە پیتی (ق) ەوە تا (ی) گرتوتەوە . هەروەها هەندێ وشەی کۆنی کوردی لە فەرهەنگێکی مادەوە دەرهێناوەو لە لاپەڕە (460 — 483) دا نووسیونی . لە لاپەڕە (484) یشەوە بیروڕای چەند ڕووناکبیرێکی لەبارەی بەرگی یەکەمو دووەمی فەرهەنگەکەوە بلاوکردووەتەوە .

55 — صادق بەهائەدین ئامێدی ، ڕێزمانا کرمانجی ، بەغدا ، 1976 .

ئەم کتێبە (146) لاپەڕەیەو بە ڕۆنیۆ ڕاکێشراوە . باسەکانی لەبارەی فۆنەتیکو مۆرفۆلۆژی دیالێکتی ژووروی زمانی کوردی‌یەوەن .

56 — عەبدوڵلا شاڵی ، ڕابەری قوتابیان بۆ چاوگەو بۆ فرمان ، بەغدا ، 1976 .

ئەم بەرهەمە (72) لاپەڕەیە . زوربەی زۆری چاوگەکانی زمانی کوردی بە پێی بەدوایەکدا هاتنی پیتەکانی ئەلفوبێی کوردی تێدا تۆمارکراوەو بەرانبەر هەر چاوگێك ڕیزەی ڕابوردووو ڕانەبوردووو داخوازی نووسراوە .

57 — کوردستان عەبدولڕەحمان لەتیف ، دیارخەرو شێوەکانی دەربڕینی پێوەندی‌یە دیارخەری‌یەکان لە زمانی کوردیدا ـ دیالێکتی سۆرانی (کورتەی نامەی دوکتۆری) ، مۆسکو 1976 .

ئەم نامیلکەیە بە زمانی ڕووسی‌یەو کورتەی نامەی دوکتۆری د . کوردستان موکریانی‌یەو بریتی‌یە لە پێشەکی‌یەكو سێ بەشو ئەنجامی لێکۆڵینەوە[10] .

58 — کۆڕی زانیاری کورد ، ڕێنووسی کوردی ، بەغدا ، 1976 .

ئەم نامیلکەیە (18) لاپەڕەیەو بریتییە لە بیروڕای ئەنجومەنی کۆڕی زانیاری کورد سەبارەت بە ڕێنووسی کوردی . ئەم پێشنیارو بڕیارانەی ئەنجومەنی کۆڕ لە بەشی یەکەمی بەرگی یەکەمی « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » یشدا بلاوکراوەتەوە .

59 — لیژنەی زاراوە زانستییەکان ، زاراوە زانستییەکان ، بەغدا ، 1976 .

ئەم نامیلکەیە (48) لاپەڕەیەو نزیکەی هەزار زاراوەیەکی سەر بە ژیربێژی و فەلسەفەیە ، کە لە لایەن مامۆستایان : (مەسعود محەمەد ، د . شوکور مستەفا ، هێمن موکریانی ، ئەورەحمانی حاجی مارف) ەوە دانراوە . ئەو بەرهەمە هەروەها لە بەرگی چوارەمی « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » دا بلاوکراوەتەوە .

60 — لیژنەی زمانو زانستەکانی کۆڕ ، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی ، بەغدا ، 1976 .

ئەمە بەرهەمی لیژنەی زمانو زانستەکانی کۆڕی زانیاری کوردە ، کە لە چەند ژمارەیەکی گۆڤاری کۆڕدا[11] و ساڵی 1976 بە کۆکراوەیی لە کتێبێکی گەورەی (476) لاپەڕەییدا بە ناوی « ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بە پێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمانو زانستەکانی » یەوە بلاوی کردووەتەوە .

ئەم نووسراوە بە شێوەیەکی سەرەکی دەربارەی بەشەکانی ئاخاوتنەو بریتی‌یە لە باسی : ناو (ل 10 — 26) ؛ جێناو

---

(10) بۆ وەرگرتنی زانیاریی پتر دەربارەی ئەو بەرهەمە ، بڕوانە : د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، بەرکۆلێکی هەڵە زانستی‌یەکانی کورتەی نامەی دوکتۆری‌یەکەی د . کوردستانی موکریانی ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ 70 ، بەغدا ، 1978 ، ل 11 — 18 .

(11) بڕوانە : « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب 3 ، ژ 1 ، بەغدا ، 1975 ، ل 396 — 496 ؛ ب 3 ، ژ 2 ، بەغدا ، 1975 ، ل 241 — 358 ؛ ژ 4 ، بەغدا ، 1976 ، ل 289 — 400 ...

(ل 27 — 74) ؛ ئــاوەڵنــاو (ل 75 — 91) ؛ كــردار (ل 92 — 267 ؛ چاوگ (ل 268 — 283) ؛ ئاوەڵكردار (ل 284 — 303) ؛ پرپێوزیشن (ل 304 — 325) ؛ ئامرازی پێــوەندی (ل 326 — 416) ؛ ئــامرازی ســەرسوڕمــان (ل 418 — 447) ؛ ئــامــرازو گیــرەك و نیشــانــە (ل 447 — 477) .

**61 — مــارگــریت كــاهن ، هــەنــدێ ڕواڵەت و وەرگــرتنی هەمەجۆری فۆنۆلۆژیی كوردی ، مەشیگان ، 1976 .**

ئەم كتێبە (160) لاپەڕەیەو بە زمانی ئینگلیزی‌یە و نامەی دوكتۆری‌یەو دەربارەی فۆنەتیك و فۆنۆلۆژی زمانی كوردییە .

**62 — مەسعوود محەمەد ، چەند حەشارگەییكی ڕێزمــانی كوردی ، بەغدا 1976 .**

نووسەر لەم كتێبە (97) لاپەڕەییەدا لە چوار كێشەی باس نــەكراوی زمــانی كــوردی دواوە : 1 — حــەشــارگــەی ڕانــاو (ل 9 — 17) ؛ 2 — حەشارگەی پاشگرەكانی كار (ل 17 — 51) ؛ 3 — حــەشــارگــەی (فعــل انتقــالی) و (انتقــالی پێچــەوانــە) (ل 51 — 77) ؛ 4 — حەشارەگەی ناوگر (ل 77 — 91) .

**63 — وریــا عومــەر ئەمــین ، چەنــد بــاســایــەكی بنچی‌ی داڕشتنی ڕستە لە زمانی كوردی‌دا ، لەندەن ، 1976 .**

ئــەم بەرهــەمــە (32) لاپــەڕەی گــەورەیــەو بــە زمــانی ئینگلیزی‌یە . بە شێوازێكی زانستیی نوێ لە سازبوونی ڕستەی كوردی دەدوێ .

**64 — د . ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، وشە ڕۆنان لە زمانی كوردیدا ، بەغدا ، 1977 .**

ئەم كتێبە (104)لاپەڕەیەو بریتییە لە تۆژینەوەو كۆڵینەوە لەو كێشە گرنگانەی لە ڕووی وشە ڕۆنانەوە پەیــوەندییــان بە وشــەی كوردییــەوە هەیــە ، بە تــایبــەتی وەك : (مــۆرفێم ، جــۆرەكانی مــۆرفێم ، شێوەی مــۆرفێم ، پێشگــرو پــاشگــرو نیشانە ، ئینتەرفیكس ، كۆنفیكس ، ناوگر ، وشەی داڕێژراو ـ ناوی داڕێژراو ، ئاوەڵناوی داڕێــژراو ، كرداری داڕێــژراو ، ئاوەڵكرداری داڕێــژراو ؛ وشەی لێكــدراو ـ ناوی لێكــدراو ، ئــاوەڵنــاوی لێكــدراو ، كــرداری لێكــدراو ، ئــاوەڵكــرداری لێكدراو .. ) .

**65 — چ . خ : بەكۆ (بلكاییف) ، دەوری پێوەندیی زمان لە پێشكەوتنی زمانی كوردەكانی سۆڤیەتدا ، مۆسكۆ ، 1977 .**

ئەم بەرهەمە (288) لاپەڕەیەو بــە زمانی ڕووسی‌یــە . لە پێشەكی‌و چوار فەسل‌و هەندێ تێكستی فۆلكلۆرو فەرهەنگێكی وشەی بێگانە لە زمانی كوردیدا پێكهاتووە .

لە پێشەكیدا (1 — ڕوونكردنەوەی پێــوەندیی زمــانان و 2 — باسی كوردەكانی سۆڤێت) ی كردۆتە مەبەست (ل 3 — 21) . فەسلی یەكەم بە ناوی « دەوری زمانی عەرەبی لە پێشخستنی زمانی كوردیدا » ەوەیە (ل 22 — 48) . فەسلی دووەم سەرناوی « دەوری زمانی توركی لە پێشخستنی زمــانی كوردیــدا » ی وەگرتووە (ل 49 — 68) فەسلی سێیەم « دەوری زمانی ئەرمەنی لە پێشخستنی زمانی كوردیدا » (ل 69 — 128) و فەسلی چوارەم « دەوری زمــانی ڕووسی لە پێشخستنی زمــانی كــوردیــدا » (ل 129 — 146) .

**66 — زبیر بلال اسماعیل ، تاریخ اللغة الكردیــة ، بغداد ، 1977 .**

ئەم كتێبە (72)لاپەڕەیەو بە زمانی عەرەبی‌یە . ناوەڕۆكی بــەم چەشنــەیە : پێشــەكی (ل 3 — 5) ؛ خێزانی زمــانەكــان (ل 6 — 9) ؛ زمــانی كوردی (ل 9 — 13) ؛ پێــوەندیی كــورد بە میدێكان‌و زمانەكەیانەوە (ل 14 — 17) ؛ بیروڕای دی سەبارەت پێوەندی نێوان زمانی كوردی‌و میدی (ل 17 — 18) ؛ زەردەشت‌و ئــاوێــستــا (ل 18 — 27) ؛ زمــانــی زەردەشت (ل 28 — 32) ؛ دەورەكانی مێژووی پێشكەوتنی زمانە ئێرانییەكان (ل 33 — 51) زمــانــە ئێــرانییــەكــانی ســەرووی ڕۆژئــاوا (ل 52 — 54) ؛ سەربەخۆیی زمانی كوردی (ل 54 — 59) ؛ زمانی كوردیی ئەمڕۆ (ل 60 — 61) ؛ دیالێكتەكــانی كوردی (ل 60 — 65) ؛ لە بــارەی لوڕستان‌و لوڕو شێوەیــانەوە (ل 65 — 67) ؛ ڕای تــر لە بارەی دیالێكتەكانی كوردییەوە (ل 67 — 71) ؛ وشەی كۆتایی (ل 71) .

**67 — عەبدولڕەحمان محەمەد ئەمــین زەبیحی ، قامــووسی زمانی كوردی ، بەرگی یەكەم ؛ بەغدا ، 1977 .**

ئەم بەرگەی فەرهەنگی مامۆستا زەبیحی لە دوو بەش پێكهاتووە :

1 — سەرەتایەكی مێژوویی زمــانی كوردی . ئــەم باســە (110) لاپەڕەیەو بریتییە لەم باسانــە : (پێشگۆتن ل 5 — 6 ؛ زمــانی كوردی لە قۆناغی ئێستایدا ل 7 — 10 ؛ زمانی هیندو ئەوروپایی بنەمای گەورەی زمانان ل 11 — 12 ؛ زمانی مادەكان چ بووە ؟ ل 13 — 16 ؛ زمانی ئاوێستایی ل 17 — 21 ؛ زمانی پارسیی كۆن ل

22 — 23 ؛ دەوری ناوەڕاستی خێزانە زمانە ئێرانی ل 24 ؛ زمانی پـارتی « پەهلەوی » ل 25 — 31 ؛ زمـانی کوردی ل 32 — 34 ؛ زمانی کوردی پاش ئیسلام ل 35 — 38 ؛ لە هجـەکانی زمـانی کوردی ل 39 — 44 ؛ لەهجەکانی کوردی چـۆن پەیـدابوون ل 45 — 55 ؛ گـۆرانـی « هــەورامی » زازا ل 55 ؛ دەربـارەی « دەنگ » ی کوردی ل 56 — 66 ؛ گیروگرفتی ڕێنووسی کوردی ل 67 — 71 ؛ فەرهەنگنووسی ل 72 — 92 .. ) .

67 — قـامووسی زمـانی کـوردی . ئـەم بـەشـە (246) لاپـەڕەو سـەرلەبەری ئـەو وشانـەن ، کـە بـە پیتی هـەمـزە دەست پێ دەکەن .

**68 — ی . ئی . کێدایتنێ ، کوردستان موکریانی ، ف . ئی . میترۆخینە ، فەرهەنگی ڕووسی ـ کوردی مۆسکۆ ، 1977 .**

فەرهەنگێکی ڕووسی ـ کوردی قوتابخانەیەو نزیکەی 2100 وشەیەکی تێدایە . بۆ ئەو کەسانە دانراوە کە تازە دەست بە فێربوونی زمانی ڕووسی دەکەن .

**69 — کەریم زەند ، زمانی کوردیو هـونەری وەرگیـڕان ، سلێمانی ، 1977 .**

ئەم کتێبە (78) لاپەڕەیەو بریتی‌یە لە باسی هەمەچەشنەو تێکەڵو پێکەڵی زمانەوانی .

**70 — فـارووق عومـەر صدیق ، ڕۆنـانی نـاو[12] لە زمـانی ئەدەبیی کوردی عێراقدا (کورتەی نـامەی دوکتـۆری) ، مۆسکۆ ، 1977 .**

نـووسەر لەم نـامیلکەیـەدا دەربـارەی ئـەو پێشگـرو پـاشگرانـەی ناوو ئـاوەڵناوو ئـاوەڵکرداری داڕێـژراوو ئـەو حاڵەتانەی ناوو ئاوەڵناوو ئاوەڵکرداری لێکـدراویان لێ پـەیدا دەبێ دواوە . ئەم بەرهەمە (24) لاپەڕەیەو بریتی‌یە لە پێشەکی‌و چوار فەسڵ .

**71 — فازیل نیزامەددین ، ئەستێرەگەشە ، بەغدا ، 1977 .**

فـەرهەنگێکی گـەورەی کـوردی ـ عـەرەبی‌یـە . (770) لاپەڕەیەو نزیکەی (20) هـەزار وشەیـەکی کوردی دەبێت کـە مانـاکانیان بە عەرەبی دراوە[13] .

**72 — ڕ . ل . تسابۆلۆف ، لە بارەی مێژووی مۆرفۆلۆژیی زمـانی کوردی‌یـەوە ، مۆسکـۆ ، 1978 .** (بڕوانـە : وێنەی ژ 1) .

ئەم کتێبە (92) لاپەڕەیەو بە زمانی ڕووسی‌یە . لەبارەی پەیدابوونو گۆڕانو گەشەکردنی بەشەکانی ئاخاوتنی زمانی کوردییەوەیە .

**73 — حـەمیدی ئێـزەد پـەنـاهـ ، فـەرهـەنگی لەكو لوڕ (لێدوانو بەراوردکردنی : مەحمـوود زامدار) ، بـەغدا ، 1978 .**

ئەم کارە لێدوانو بەراوردکردنی ئەو فەرهەنگـەیە کـە حەمیدی ئێزەد پەناهـ ساڵی 1964 لە تاران بڵاوی‌کردۆتەوە .. ئەم کتێبە (230) لاپەڕەیەو بـریتی‌یە لە : سـەرەتاو پێشـەکی (ل 3 — 22) ؛ فەرهەنگی لوڕی ـ کرمانجیی خـواروو ـ فارسی (ل 23 — 215) ؛ نـوێشکێ لە بـارەی ڕێـزمـانی لوڕی‌یـەوە (ل 216 — 229) .

**74 — د . عبدالرحمن معروف ، مـاكتب عن اللغة الكـردية (ترجمة : محمد امين غفور الهورامانی) ، بغداد ، 1978 .**

ئەم کارە (62) لاپـەڕەیەو کتێبی « چی لەبـارەی زمانی کوردییەوە نووسراوە » یە ، کراوە بە عەرەبی .

**75 — ق . کوردۆ (کوردۆییێف) ، دەستووری زمانی کوردی (بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروووو خواروو) ، مۆسکۆ ، 1978 .**

ئەم کتێبە کە (292) لاپەڕەیەو بە زمانی ڕووسی‌یە ، کاری هەرە گەورەو دیارو زانستی‌یانەی مامۆستا کوردۆیەو بریتی‌یە لە : پێشەکی (ل 3 — 23) ؛ فۆنەتیك (ل 24 — 42) ؛ مۆرفۆلۆژی (ل 43 — 280) ؛ ئـەنـجـام (ل 281 — 284) ؛ سـەرچـاوە (ل 285 — 288) .

**76 — مەسعوود محەمەد ، بەرەو ڕاستە شەقامی ئاخاوتنی کوردی ، بەغدا ، 1978 .**

ئەم نامیلکەیە (63) لاپەڕەیەو وەڵامی ئەو تارەی مامۆستا محەمەد ئەمین هەورامانی‌یـە ، کە لە ژمـارە (64) ی تشرینی دووەمو کانوونی یەکەمی ساڵی (1977) ی گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » دا ، بە ناوی « کوردواتەنی » یەوە بڵاوی‌کردۆتـەوەو کـۆمەڵێـك ڕەخنەی لە دوو نـووسینی مامـۆستا مـەسعـوود محـەمـەد : « فـۆنـەتیـك چیمـان بـۆ بکـا ؟ » و « چـەنـد حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی » گرتبوو .

**77 — د . ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، ڕێزمانی کوردی بەرگی**

**یەکەم (مۆرفۆلۆژی) ، بەشی یەکەم (ناو) ، بەغدا ، 1979 .**

ئەم کتێبە (284) لاپەڕەیەو ئەرکی سەرەکی توێژینەوەو لێکۆڵینەوەیە لەو کێشە گرنگانەی لە ڕووی مۆرفۆلۆژیو زانستی زمانەوە پێوەندییان بە بەشە ئاخاوتنی (ناو) ەوە هەیە لە زمانی کوردیدا ، بەتایبەتی وەك : (پێناسەی ناو ؛ ناو لە ڕووی ناوەڕۆکەوە ـ ناوی تایبەتیو ناوی گشتیو ناوی کۆمەل ؛ ناو لە ڕووی هەبوونەوە ـ ناوی مادیو ناوی مەعنەوی ؛ ناو لە ڕووی پێکهاتنەوە ـ ناوی سادەو ناسادە .. جنسەکانی ناو ؛ ژمارەی ناو ، نیشانەکانی ئیزافە ...

**78 ـ عەبدولڕەحمان محەمەد ئەمین زەبیحی ، قامووسی زمانی کوردی ، بەرگی دووەم ، بەغدا ، 1979 .**

ئەم بەرگەی « قامووسی زمانی کوردی » ی مامۆستا زەبیحی (232) لاپەڕەیەو بۆ ئەو وشانە تەرخان کراوە ، کە بە (ب) دەست پێ دەکەن . بەلام ئەو وشانەی تێدا نییە کە بە [ ب + (ی ، ێ ، بی) ] دەست پێ دەکەن .

**79 ـ کەمال جەلال غەریب ، فەرهەنگی زانیاری (عەرەبی ـ ئینگلیزی ـ کوردی) ، بەغدا ، 1979 .**

مامۆستا کەمال جەلال غەریب لە « فەرهەنگی زانیاری » دا بە گشتی وشەو زاراوەی زانستی لە بابەت : (پزیشکیو توێکاریو نەخۆشییەکان و گیانداروو ڕووەكو خواردەمەنیو زکماکیو کیمیاو بیرکاریو ئەندازیاریو ئەستێرەوانیو جیۆگرافیو جیۆلۆجیو کشتوکال ..) ەوە تۆمارکردووە . بەرگی دووەمی ئەم فەرهەنگە (404) لاپەڕەیەو ئەو وشەو زاراوانەی گرتوتە خۆ کە بە پیتەکانی (ج ، ح ، خ ، د) دەست پێ دەکەن .

**80 ـ د . مەکسیمی خەمۆ ، فەرهەنگی ئیدیۆمی کوردی ـ ڕووسی ، یەریڤان ، 1979 .**

ئەم فەرهەنگە (284) لاپەڕەی قەوارە گەورەیەو نزیکەی هەشت هەزار ئیدیۆمی کوردی تێدایە ، کە ماناکانیان بە ڕووسی لێکدراوەتەوە . لە (28) لاپەڕەی سەرەتادا دەربارەی ئیدیۆمی زمانی کوردی کۆڵیوەتەوەو لە چەند سەرێکەوە ، بەر لە هەمووش لە ڕووی پێکهاتنو ئەرکەوە گەلێ زانیاریی نوێی خستۆتە پێش چاو .. دواتر لە چۆنێتی کۆکردنەوەو هەڵبژاردنی ئیدیۆم بۆ ئەو فەرهەنگە دواوە .. باسی شێوەی ڕیزکردنو جیاکردنەوەیانی کردووە ... لە لێکدانەوەی مانایانو شێوەی جۆربەجۆری وەرگێرانیانی کۆڵیوەتەوە .. هتد . ئەم فەرهەنگە بە شێوەیەکی سەرەکی ئەو ئیدیۆمانەی گرتوتە خۆی کە لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروو (بەتایبەتی لە بەشە دیالێکتی کوردی یەکێتی سۆڤیەت)دا دەبینرێن . هەروەها بەشێك لەو ئیدیۆمانەش کە لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووداا بەکاردێن ، لەم فەرهەنگەدا تۆمارکراون[14] .

**81 ـ م ئەمین بۆزئەرسەلان ، ئەلفابێ ، سوید ، 1980 .**

ئەم کارە چاپی دووەمی ئەو کتێبی ئەلفوبێیەیە کە ساڵی 1968 لە ئەستەموول بڵاوی کردوتەوە . ئەمیش هەر 64 لاپەڕەیە . (بڕوانە : باسی کتێبی ژمارە ـ 27) .

ئەو وشەو زاراوانەی گرتونە خۆ کە بە پیتەکانی (ج ، ح ، خ ، د) دەست پێ دەکەن .

**82 ـ د . ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم ، ڕستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخواز لە گەڵ ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری لە دیالێکتە ناوەندییەکانی زمانی کوردیدا ، بەغدا ، 1980**

ئەم کارە (204) لاپەڕەیەو دەربارەی بابەتێکی سینتاکسی زمانی کوردییە . لە بنچینەدا نامەی دوکتۆرییەکەیەتی کردوویە بە کوردی .

**83 ـ ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم ، هەندێ ئامرازی سینتاکسی لە زمانی ئەدەبی ئیمرۆی کوردیدا ، بەغدا ، 1980 .**

ئەم کتێبە (93) لاپەڕەیەو لە پێشەکیو چوار بەشو ئەنجام پێکهاتووە : بەشی یەکەم سەبارەت مێژووی باسەکەیە (ل 5 ـ 20) . بەشی دووەم لە ئامرازەکانی سینتاکسی بەگشتی دەدوێو باسی ئەم بابەتانە : (زاراوەی ئامراز ، پێناسەی ئامراز ، ئامراز لە ڕووی دروست بوونو ئەرکەوە) دەکات (ل 21 ـ 29) . بەشی سێیەمی دەربارەی ئامرازی پەیوەستدارە لە ڕووی زاراوەو جۆرەکانییەوە (ل 31 ـ 49) . بەشی چوارەمی لەبارەی ئامرازی گەیەنەرەوە دەدوێو زاراوەو جۆرەکانی دەخاتە ڕوو (ل 51 ـ 72) ..

**84 ـ جویس بلو ، کورتەیەك لە زمانی کوردی (دیالێکتی سۆرانی ، پاریس ، 1980 .**

ئەم کتێبە (287) لاپەڕەیە . بریتییە لە : باسی ئەلفوبێو ڕێزمان ؛ تێکست بۆ خوێندنەوە ، فەرهەنگێکی کوردی

ـ فەرەنسی .. (بڕوانە : وێنەی ژ 2) .

**85 — سیامەند سەلیم ، چۆن فێری ئەم سێ زمانە دەبیت : هیندی ـ کوردی ـ عەرەبی ، بەغدا ، 1981 .**

ئەم فەرهەنگە (125) لاپەڕەیەو نزیکەی دوو هەزار وشەو ـ دەستەواژەو ڕستەی هیندی دەبێت ، کە بەرانبەریان بەکوردیو عەرەبی واتایان لێدراوەتەوە .

**86 — ڕەئووف ئەحمەد ئالانی ، کێشەیەك لە ڕێزمانی کوردیدا ، بەغدا ، 1981 .**

ئەم بەرهەمە (244) لاپەڕەیە . لێکۆڵینەوەیەکی دوورو ـ درێژو تێرو تەسەلە لەبارەی مۆرفیمی (ەوە / وە) وە و لەم بەشانە پێکهاتووە : پێشەکی (ل 3 — 7) ؛ نماییشێك (ل 7 — 11) ؛ هەڵسەنگاندنو بەراورد لەنێوان چەندان نووسیندا دەربارەی فۆرمو هەڵکەوتی مۆرفیمی دووبارەو بەردەوامی (ل 12 — 56) ؛ هەڵسەنگاندنی چەند نووسینێك لەبارەی نیشانەی کاری ڕابوردووی نزیکەوە (ل 57 — 74) هەڵکەوتی مۆرفێمەکان لە دەستە شێوەی شارباژێر (بابان) دا (ل 75 — 132) ؛ لەدەستەی شێوەکانی موکریو سۆرانیدا (ل 133 — 150) ؛ لە دەستەی شێوەی ئەردەڵانیدا (ل 151 — 160) ؛ لە مەڵبەندی گۆرانو لقی جافیدا (ل 161 — 166) ؛ لە مەڵبەندی گۆرانو لقی هەورامیدا (ل 167 — 175) ؛ لەلوڕیو فارسیدا (ل 177 — 190) ؛ لەکرمانجی سەروودا (ل 191 — 202) ؛ پاشگرو نیشانەی (ەوە / وە) لەڕووی ئەرکەوە (ل 203 — 237) .

**87 — د . کامیل حەسەن عەزیز بەسیر ، زانستی ئاوەڵواتا ، بەغدا ، 1981 .**

ئەم کتێبە (124) لاپەڕەیەو بریتییە لە : پێشەکی (ل 3 — 6) ؛ بەشی یەکەم ـ میتەفۆر لەڕەخنەسازیی یۆنانیو ڕۆمانیدا (ل 7 — 39) ؛ بەشی دووەم ـ مەجاز لە ڕەخنەسازیی عەرەبیدا (ل 40 — 61) ؛ بەشی سێیەم ـ میتەفۆر لەڕەخنەسازیی ئەورووپیدا (ل 62 — 71) ؛ بەشی چوارەم ـ خوازە لە ڕەخنەسازیی کوردیدا (ل 72 — 110) .

**88 — مستەفا نەریمان ، ڕێنووسی کوردی لەڕەنگەو ڕیشەوە ، بەغدا ، 1981 .**

ئەم کارە (68) لاپەڕەیەو باسی ئەو هەوڵو تەقەلایانە دەکات ، کە لە مەیدانی نووسینی کوردیدا دراون[15] .

**89 — محەمەد ئەمین هەورامانی ، زاری زمانی کوردی لەترازووی بەراورددا ، بەغدا ، 1981 .**

ئەم کتێبە (326) لاپەڕەیەو بریتییە لە : پێشەکی (ل 5 — 50) ؛ بەشی یەکەم ـ کورتە مێژوویەکی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی (ل 51 — 70) ؛ بەشی دووەم ـ بەراوردکردنی دیالێکتی هەورامانیو سۆرانی لەڕووی دەنگو دەنگسازییەوە ، واتە لەڕووی فۆنۆلۆژییەوە (ل 71 — 162) ؛ بەشی سێیەم ـ بەراوردکردن لەڕووی وشەسازییەوە ، واتە لەڕووی مۆرفۆلۆژییەوە (ل 163 — 299) ؛ بەشی چوارەم ـ سینتاکس ، یاخود ڕستەسازی (ل 301 — 315) .

**90 — ج . خ . بەکۆ (باکاییڤ) ، بنچینەی ڕێنووسی کوردی ، مۆسکۆ ، 1983 .**

ئەم کتێبە « 272 » لاپەڕەیەو بەزمانی ڕووسییەو باسی چۆنیەتی نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی سلاڤی دەکاتو بریتییە لە : پێشەکی (ل 3 — 8) ؛ 1 — ئەلفوبێو ڕێنووس (ل 9 — 60) ؛ 2 — خاڵبەندی (ل 60 — 70) ؛ 3 — فەرهەنگی ڕاست نووسینی وشە (ل 71 — 201) ؛ 4 — هەندێ تێکستی کوردی (ل 202 — 269) . (بڕوانە : وێنەی ژ 3) .

**91 — ق . کوردۆ ، ز . یوسف ، فەرهەنگی کوردی ـ ڕووسی ، مۆسکۆ ، 1983 .**

ئەم فەرهەنگە کە کوردی (دیالێکتی خواروو) ـ ڕووسییە ، (752) لاپەڕەو (25) هەزار وشەیەك دەبێت[16] .

**92 — فوآد حمه خورشید ، اللغة الكردية ، التوزيع الجغرافي للهجاتها ، بغداد ، 1983 .**

ئەم نامیلکەیە بە زمانی عەرەبییەو (52) لاپەڕەیەو بریتییە لە : پێشەکی (ل 7 — 8) ؛ بەشی یەکەم ـ زمانی کوردی (ل 9 — 18) ؛ بەشی دووەم دیالێکتەکانی زمانی کوردی (ل 19 — 29) ؛ بەشی سێیەم ـ نەخشەی دیالێکتەکانی کوردی (ل 30 — 45) ؛ بەشی چوارەم ـ ئەنجام (ل 46 — 47) ؛ سەرچاوە (48 — 52) .

**93 — دکتر محمد تقی ابراهیم پور ، واژەنامە فارسی ـ کرد ی (سنندجی ، اورامی ، کردی شمال) تهران ؟ .**

نووسەر لەسەرەتای ئەم فەرهەنگەدا کەمێ باسی زمانی کوردیو ئەلفوبێی کوردیو ڕێزمانی کوردیو فەرهەنگە کوردییەکانی دەکات (ل أ ـ ح) . لەلاپەرە (1) یشەوە تا (724) فەرهەنگێکی فارسی ـ کوردییە نزیکەی هەشت هەزار وشەی

فارسی دەبێت ، کە بەرانبەریان هاوواتایان بەشێوەکانی سنەیی و هەورامی و کوردیی ژووروو نووسراوە .

**تێبینی :**

أ) وێرای ئەو کتێب و نامیلکانە ، هەندێ بەرهەمی دی هەن ، کە بینیومن و ئێستا لەبەر دەستمدا نین ، یاخود هی ئەوتۆ هەیە ، خۆم نەمبینیوە ، بەلاَم لەم کتێب و ئەو کتێبەدا باسیانم خوێندوَتەوە ، وەك :

**94 — ئەبولحەسەنی ئەردەلاَنی ، کیتابی لوغەتی کوردی (کتاب لغت کردی)**

ڕێزمان و فەرهەنگی کوردییە ، کە بۆ ناسرەدین شای نووسیوە . (فارسی ـ کوردی) یە ، 1888 .

**95 — ئۆسکارمان ، زاراوی لوڕی ، بەرلین ، 1910 .** (بەزمانی ئەلەمانی یە) .

**96 — ئۆسکارمان ، زاراوی زازا ، بەرلین ، 1932** (بەزمانی ئەلەمانی یە) .

**97 — حامید فەرەج ، ئەلفوبێی کوردی ، چاپی سێیەم ، بەغدا 1948**

**98 ـ و . نارو ، زمانێ کورمانجی ، یەریڤان ، 1948 .** زماننامەو ڕاست نووسینی زمانی کوردییە ، بە ئەلفوبێی سلاڤی .

**99 — ئەمینێ عەڤدال ، میتۆدیکا زمانێ کورمانجی ، یەریڤان . 1950 .**

**100 — ج . خ . باکاییف ، پۆستپۆزیشن وەك کەرەستەی دەربڕینی پێوەندیی ڕێزمانی لەزمانی کوردیدا (کورتەی نامەی دوکتۆری) ، لێنینگراد ، 1950 (بە زمانی ڕووسی) .**

**101 — حاجی جندی ، ئەلفبا ، یەریڤان ، 1951 . ئەم ئەلفوبێیە بۆ گەورە دانراوەو بەپیتی سلاڤییە .**

**102 — عوبەیدیللا ئەیوبیان ، ، بررسی و تحقیقات زبان و ادبیات کردی ، تەورێز ، 1956 .**

**103 — ئەمینێ عەڤدال و ش . ئەمین ، کتێبا زمانێ کوردی ، یەریڤان ، 1957 .** بۆ فێرکردنی زمانی کوردی نووسراوەو بە ئەلفوبێی سلاڤییە .

**104 — حاجی جندی و ن . جەواری ، ئەلفبا ، یەریڤان ، 1957 .** ئەلفوبێیەکی وێنەدارەو بۆ مندالاَنە . بەپیتی سلاڤییە .

**105 — یو . یو . ئاڤالیانی ، کەرەستە لەبارەی کرداری لێکدراوی زمانی کوردییەوە ، سەمەرقەند ، 1962 (بەزمانی ڕووسی) .**

**106 — حمید ایزد پناه ، فەرهەنگی لڕی ، تهران ، 1964 .**

**107 — مصطفی خرم دل ، صرف دستور زبان کردی سورانی ، تبریز ، 1347 ك / 1968 ز . (بەفارسی) .**

**108 — د . جەمال نەبەز ، نووسینی زمانی کوردی ، هامبورگ ، 1960 (بە زمانی ئەلەمانی) .**

**109 — گیو موکریانی ، فێربوونی زمانی کوردی بەبێ ماموَستا ، چاپی دووەم ، هەولێر ، 1969 .**

**110 — سەدیق سەفی زادە واژەهای همانند در پهلوی و کردی ، تهران ، 1971 .** (لێکۆڵینەوەیەکە لە وشە هاوواتاکانی زمانی پەهلەوی و کوردی) .

**111 — عوسمان عارف ، چۆن فێری زمانی کوردی ئەبیت کەرکووك ، 1971 .**

**112 — ئەمینێ عەڤدال ، میتۆدیکا زمانێ کورمانجی ، یەریڤان ، 1973 .**

**113 — گیو موکریانی ، فێربوونی زمانی کوردی لەسێ مانگدا ، هەولێر ، 1974 .**

**114 — سۆران (حەسەن سەلاح) ، فەرهەنگی کوردی ـ فارسی لەگەل کورتەیەك سەبارەت بە زمانی کوردی ، لەندەن ، 1976 .**

ب) هەروەها لە هەندێ کاری وەك ئەنسیکلۆپیدیاو زمانناسی و مێژوو ..دا باسی زمانی کوردی کراوە . بەوێنە :

**115 — ف . ف . مینۆرسکی ، کورد . سەرنج و تێبینی ، پێترۆگراد ، 1953 .**

ئەم بەرهەمە (43) لاپەڕەیەو بە زمانی ڕووسییە . لە فەسلی چوارەم ـ زمان و ئەدەب و نووسین دا دەربارەی ئەسلی زمانی کوردی و دیالێکتەکانی دواوە .

**116 — محەمەد ئەمین زەکی ، خۆلاصەکی تەئریخی کوردو کوردستان ، جلدی ئەوەل ، جزمی دووەم ، بەغدا ، 1931 .**

بەشی سێیەمی ئەم کتێبە (ل 286 — 314) سەرلەبەری باسی زمانی کوردییە . لەسەرەتادا دەربارەی ئەسلی زمانی

کوردی‌و شوێنی له نێو خێزانی زمانه ئێرانی‌یه‌کانداو
به‌راوردکردنی له‌گه‌ل په‌هله‌وی‌و فارسیدا دواوه . دواییشی
سه‌رورو درێژی‌و نموونه‌وه له‌دیالێکته‌کانی زمانی کوردی
کۆلیوه‌ته‌وه .

117 – ئا . س . چیکۆبافا ، سه‌ره‌تاییکی زمانناسی ، ب 1 ، مۆسکۆ ، 1952 .

له لاپه‌ڕه (202) و (204) ی ئه‌م کتێبه ڕووسی‌یه‌دا باسی زمانی کوردی کراوه .

118 – ئه‌نسیکلۆپیدیای گه‌وره‌ی سۆڤیتی ، ب 24 ، مۆسکۆ ، 1951 (ل 91) – « زمانی کوردی » .

119 – ف . س . سۆکۆلۆفا ، له‌باره‌ی فۆنه‌تیکی زمانه ئێرانی‌یه‌کانه‌وه ، مۆسکۆ – لێنینگراد ، 1953 .

ئه‌م کتێبه (150) لاپه‌ڕه‌یه و به زمانی ڕووسی‌یه . له لاپه‌ڕه (75 – 103) دا ده‌رباره‌ی زمانی کورده‌کانی تورکمه‌نستان کۆلراوه‌ته‌وه‌و باسی بزوێن‌و کۆنسۆنانته‌کانی ئه‌و به‌شه دیالێکته کراوه .

120 – ف . س . سۆکۆلۆفا ، لێکۆڵینه‌وه له‌باره‌ی فۆنه‌تیکی زمانه ئێرانی‌یه‌کانه‌وه ، لێنینگراد ، 1954 (کورته‌ی نامه‌ی دوکتۆریی ناوك) .

ئه‌م نامیلکه‌یه (36) لاپه‌ڕه‌یه‌و به‌زمانی ڕووسی‌یه . له لاپه‌ڕه (15 , 20 , 32 , 35) دا باسی فۆنه‌تیکی زمانی کوردی کراوه .

121 – ف . ئی . ئابایێف ، فه‌رهه‌نگی ئێتیمۆلۆژی زمانی ئه‌سیتینی ، مۆسکۆ ، 1958 .

نووسه‌ر بۆ ئه‌م لێکۆڵینه‌وه‌یه‌ی له‌گه‌لێ شوێندا نموونه‌ی له‌زمانی کوردییه‌وه هێناوه‌ته‌وه .

122 – ئه‌نسیکلۆپیدیای بچووکی سۆڤیتی ، چاپی سێیه‌م ، ب 5 ، مۆسکۆ ، 1959 .

(ل 267 – « زمانی کوردی »)

123 – ڕ . س . گیلیاریڤسکی ، ف . س . گریڤنین ، جیاکردنه‌وه‌ی زمانه‌کانی جیهان به‌پێی نووسین ، مۆسکۆ ، 1960 .

ئه‌م کتێبه (296) لاپه‌ڕه‌یه و به زمانی ڕووسی‌یه . له لاپه‌ڕه 15 دا – «زمانی کورده‌کانی یه‌کێتی سۆڤیێت » . له لاپه‌ڕه (160 – 161) دا – « زمانی کورده‌کانی هه‌نده‌ران » .

124 – ئی . م . ئۆرانسکی ، زمانه ئێرانی‌یه‌کان ، مۆسکۆ ، 1963 . ئه‌م کتێبه (203) لاپه‌ڕه‌یه‌و به‌زمانی ڕووسی‌یه نووسه‌ری ئه‌م کتێبه له‌ژێر سه‌رناوی « زمانی کوردی » (ل 135 – 139) دا ده‌رباره‌ی ناوچه‌کانی کوردنشین‌و ده‌وره‌کانی زمانی کوردی‌و لێکۆڵینه‌وه‌ی کوردناسان‌و ڕێزمانی کوردی کۆلیوه‌ته‌وه . له‌باسی « زمانه ئێرانی‌یه‌کانی سه‌رووی ڕۆژئاوا » (ل 173 – 174) یشدا که‌مێ له‌زمانی کوردی دواوه .

125 – ف . ف . مینورسکی ، الاكراد . ملاحظات وانطباعات (ترجمه وعلق عليه وقدم له د . معروف خزندار) ، بغداد ، 1968 .

باسی زمانی کوردی که‌وتوته لاپه‌ڕه (37 – 39) وه (بڕوانه : باسی کتێبی ژ – 115) .

126 – ڕه‌شید یاسمی ، مێژووی نه‌ژادو په‌یوه‌سته‌گی کورد ، (به‌رچقه‌ی به ده‌سکاری‌یه‌وه : قانعی هونه‌رو که‌ریم زه‌ند) ، سلێمانی ، 1969 .

له‌م کتێبه‌دا ناوه ناوه به‌چه‌ند وشه‌یه‌ك باسی زمانی کوردی کراوه .

127 – ئه‌نسیکلۆپیدیای گه‌وره‌ی سۆڤیتی ، چاپی سێیه‌م ، ب 14 ، مۆسکۆ ، 1973 .

له لاپه‌ڕه (71) دا باسی زمانی کوردی کراوه .

128 – مه‌لا ڕه‌شید به‌گی بابان ، اقتران النيرين في مجمع البحرين (ئاماده‌کردن‌و پێشکه‌ش‌کردن‌و له‌سه‌رنووسینی : محه‌مه‌د عه‌لی قه‌ره‌داغی) ، به‌غدا ، 1973 .

مه‌لا ڕه‌شید به‌گی بابان سالی 1942 له ئه‌سته‌موول له نووسینی « اقتران النيرين في مجمع البحرين » بووه‌ته‌وه‌و سه‌ره‌تایه‌کی له‌باره‌ی نووسینی کوردی‌یه‌وه بۆ ئه‌و کتێبه‌ی نووسیوه وبه‌بیری خۆی هه‌ندێ چاره‌ی بۆ ده‌ربڕینی ده‌نگه کوردییه‌کان دۆزیوه‌ته‌وه .

ئه‌و نیگاره نوێیانه‌ی له‌م ڕێنووسه‌دا ده‌بینرێن ئه‌مانه‌ن :
1 – وێنه بۆ ده‌نگی (د) ی کلۆر که‌بریتییه له دانانی خالێك له‌ژێر پێتی (د) دا . 2 – بۆ ده‌نگی (ر) ی لاواز خالێکی له‌ژێر (ر) دا دانـاوه . 3 – بۆ (ل) ی قـه‌له‌و خالێکی له‌سه‌ر (ل) داناوه . 4 – بۆ (ی) ی درێژ که‌شیده‌یه‌کی له‌ژێر (ی) دا داناوه .[17]

129 – قه‌ناتی کوردۆ ، هه‌ندێك بیروباوه‌ڕی هه‌له له‌باره‌ی زمان‌و مێژووی کورده‌وه (وه‌رگێران‌و پێشه‌کی : د .

**ئەورەحمانی حاجی مارف) بەغدا ، 1973 — 1974 .**

لەلاپەرە (15 — 17) دا نووسەری پێشەکی باسی کارە زمانەوانییەکانی کوردۆ دەکات .

ق . کوردۆ لە (ل 44 — 45) دا ئەسڵی زمانی کوردی ڕوون دەکاتەوەو لە (ل 52 — 56) دا بەرپەرچی ڕەشید یاسەمی دەداتەوە ، کە زمانی کوردی بەبەشێك لەزمانی فارسی دادەنێ . لە (ل (69 — 105 ) دا ڕەخنە لە بیروباوەڕی هەڵەی ن . یا . مارر دەگرێ کە زمانی کوردی بە زمانێکی یافیتی لەقەڵەم دەدا . لە چەند شوێنێکی (ل 108 — 110) دا ڕەخنە لەڕای **فیلچێفسکیو** میللەر سەبارەت بەکورد ، دەگرێو لە (ل 115 — 120) یشدا مانای وشەی « کاردوخ » لێك دەداتەوە . لە ‹ل 125 — 127) دا دەربارەی ڕای **فیلچێفسکی** بەرانبەر دەورەکانی زمانی کوردی ، دواوە . لە (ل 149 — 152) دا ڕای **ئاکۆپۆف** سەبارەت بەزمانی کوردی ، ڕەت دەکاتەوە .

**130 — توما بوا ، مع الاکراد ، (ترجمة : آواز زەنگنە) ، بغداد ، 1978 .**

ئەم کتێبە بەعەرەبی (167) لاپەڕە دەرچووە . بەشێکی کەمی فەسڵی دەیەمی ئەم بەرهەمە (ل 131 — 134) باسی زمانی کوردی دەکات . نووسەر لە سەرەتادا ناوی هەندێ لەو کتێبانەی بردووە ، کە لەبارەی زمانی کوردییەوە نووسراونو ئنجا باسی ئەسڵی زمانی کوردیو دیالێکتەکانیو بەکارهێنانی ئەلفوبێی عەرەبیو لاتینی بۆ نووسینی کوردی کردووە .

**131 — د . کەمال مەزهەر ، « تێگەیشتنی ڕاستی » و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا بەغدا ، 1978 .**

نووسەر لەبەندی یەکەمی بەشی پێنجەمی ئەم کتێبەدا ، کە بەناوی « (تێگەیشتنی ڕاستی) و زمانی کوردی»یەوەیە (ل 148 — 154) ، سەبارەت بە ڕەوانی زمانو دارشتنی وشەی کوردیی نوێو دەستکاری کردنی ئەلفوبێی عەرەبیو بەکارهێنانی شێوەی (دە) و .. لەلایەن نووسەرانی ڕۆژنامەی « تێگەیشتنی ڕاستی » یەوە ، دواوە .

.... هتد .

حـ) چەند کتێبو نامیلکەیەك هەن ، کە بینیومنو خوێندوومنەتەوە ، بەڵام ئێستا ناوو نیشانی تەواویانم لەیاد نیە .

د) بێگومان ، دەبێ کۆمەڵێ کتێبو نامیلکەش هەبن ، کە ناویانم نەبیستبێ .

**لە گۆڤاردا**

**132 — م . ص . آزیزی ، حروفمزو تسهیل قرائت . گۆڤاری « ڕۆژی کورد » ، ژ 2 ـ ، ئەستەموول ، 6 ی تەمووزی 1329 ك / 1913 ز ، ل 2 — 3 .**

(کۆمەڵەی گشتی کردنی خوێندەواریو چاککردنی ڕێنووس) و (کۆمەڵەی هیڤی) بایەخێکی تایبەتییان بەچارەسەرکردنی کێشەکانی ڕێنووسی کوردی دابوو ، ئەو بەرهەمەی لەم بارەیەوە هێنابوویانە ئەنجام ، ئەلفوبێیەك بوو لەسەر بناغەی پیتەکانی عەرەبیو هەشت پیتی نوێیان بۆ زیاد کردبوو . پیتەکانی ئەم ڕێنووسە بەیەکەوە نەدەلکان . پیتە نوێ پێشنیارکراوەکانیش سەرو بۆرو ژێرو ئەلفو واوی کراوەو واوی درێژو یێی لارو دیفتۆنگی (وێ) بوون ، کە نیگارەکانیان شێوەیەکی تایبەتییان هەبوو وەك . ئەوانە بوون ، کە لەنووسینی ئەمڕۆی کوردیداهەن .

دەربارەی کێشەی نووسینی کوردیو ڕێگەی چارەسەرکردنیو پێویستی گرنگی پێدانیو خستنە پێش چاوی ئەو ئەلفوبێ نوێیە لەژمارە (3) ی گۆڤاری « ڕۆژی کورد » دا بە زمانی تورکی ئەو وتارە بەناوی « پیتەکانمانو ئاسانکردنی خوێندنەوە » دوە بڵاوکراوەتەوە .

**133 — (تعمیم معارفو اصلاح حروف) جمعیت محترمەسی طرفندن وارد اولمشدر : روژ کرد مجموعەسی مدیریت علیەسنە ، گۆڤاری « ڕۆژی کورد » ، ئەستەموول ، 6 ی تەمووزی 1329ك1913 ز ، ل 13 — 16 ك**

ئەم نامەیە کە ، کۆمەڵەی گشتی کردنی خوێندەواریو ڕێنووس سەبارەت بەکێشەی نووسینی کوردیو ڕێگەی چارەسەرکردنیو پەسەندکردنی ئەو ئەلفوبێ نوێیە (بڕوانە : وتاری ژمارە : 132) بۆ گۆڤاری « ڕۆژی کورد » یان ناردووە .

**134 — م . م . عرفان ، گۆڤاری « کوردستان » ، ئەستەموول ، ژ 1 ، 30 ی کانوونی دووەمی 1335 ك ، ل 12 ؛ ژ 2 ، 9 ی شوباتی 1335 ی ك ، ل 22 — 24 ؛ ژ 4 ، 15 ی مارتی 1335 ك ، ل 43 — 44 ؛ ژ 10 ، 30 ی حوزەیرانی**

1335 ك ، ل 125 — 126 ؛ ژ 15 ، 29 ی تشرینی یەکەمی 1335 ك ، ل 189 — 190 ؛ ژ 16 ، 27 ی تشرینی دووەمی 1335 ك ، ل 204 — 205 ؛ ژ 18 ، ؟ ، ل 227 — 228 ؛ ژ 19 ، 29 ی مارتی 1336 ك ، ل 244 — 245 .

ئەمە زنجیرە وتارێکی محەمەد میهری‌یە بە ناوی « عیرفان » ەوە بە زمانی تورکی لەژمارە (2، 4، 10، 15، 16، 18، 19) ی گۆڤاری « کوردستان » ی ئەستەموولدا ، کە ڕێکەوتی سالانی 1919 ـ 1920 دەکات ، بلاوی کردوتەوە .

لە بەشی ژمارە (1) دا لەوە دواوە ، کە ئەوەی لەلایەن زانایانی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاواوە لەبارەی زمانی کوردییەوە نووسراوە بۆ مەبەستی سیاسی بووە . لەنێو ئەو کارانەی ڕۆژهەلاتدا باسی بەرهەمەکەی یوسف ضیا پاشای خالدی کردووەو لەگەل ئەوەی بەکارێکی باشی داناوە ، ڕەخنەی توندو تیژیشی لێگرتووە .

لەبەشی ژمارە (2) دا ڕەخنە لە یوسف ضیا پاشا دەگرێ و دەلێ ئەو عەرەبەو ویستوویەتی کورد بکا بە عەرەب .. نووسەر لێرەدا چەند نموونەو بەلگەیەکی مێژوویی دێنێتەوە بۆ نیشاندانی ئەوەی کە کورد میللەتێکی ڕەسەنە ، نە عەرەبەو نە فارسە .

لەژمارە (4) دا وارادەگەیەنێ کە یوسف ضیائەدین هەموو شێوەکانی کوردی نەزانیوەو بۆیە نەیتوانیوە بچێتە نێو زمانی کوردییەوە . لەبەر ئەوەی خۆی عەرەبەو کورد نییە توانای ئەوەی نەبووە قوول ببێتەوە . هەروەها دەلێ : ئەگەر لەزمانی کوردیدا وشەی تورکی و عەرەبی .. هەبێ وا ناگەیەنێ کە ئەم زمانە ڕەسەن نییە ، چونکە هەموو زمانێکی سەر ئەم زەمینە هەر بەو چەشنەیە .

لە ژمارە (10) دا باسی کتێبێکی چاپنەکراوی (خەلیل خەیالی) دەکات و دەلێ ، ئەمیش هەلەی ئەوەیە کە هەر دەربارەی شێوەی زووررووەو وێرای ئەوەش کتێبەکەی یوسف ضیائەدینی کردووە بە سەرچاوەی سەرەکیی خۆی ... نووسەر پاشان دێتە سەر باسی کتێبەکەی خۆی و دەلێ : هەرچەندە بەشێکی زۆریم لەوەی (خەلیل خەیالی) یەوە وەرگرتووە ، بەلام زادەی بیری خۆم بەکارهێناوەو بەزمانی کوردیدا گەڕاوم . ئەگەر چی لە شێوەی جیاجیاوە وشەم کۆکردۆتەوە ، بەلام ئەوەی منیش هێشتا لەسەدا دەی زمانی کوردی نییە .

لەژمارە (15) شدا باسی هەندێ کێشەی ڕێنووسی کوردی کراوە .

لەژمارە (16) و (18) و (19) یشدا کۆمەلێ وشەی کوردی و تورکی و عەرەبی هێنراوەتەوەو لەگەل یەکتر بەراورد کراون . (بڕوانە : وێنەی ژ 4) .

135 — م . م . اساس ، گۆڤاری « کوردستان » ، ئەستەموول ، ژ 2 ، 9 ی شوباتی 1335 ك ، ل 21 — 22 ؛ ژ 4 ، 15 ی مارتی 1335 ك ، ل 42 — 43 ، ژ 10 ، 30 ی حوزەیرانی 1335 ك ، ل 126 — 127 ؛ ژ 15 ، 29 ی تشرینی یەکەمی 1335 ك ، ل 193 ؛ ژ 16 ، 27 ی تشرینی دووەمی 1335 ك ، ل 201 — 203 ؛ ژ 18 ، ؟، ل 229 ؛ ژ 19 ، 29 ی مارتی 1336 ك ، ل 245 ـ 246[18] .

ئەمەش دیسان زنجیرە وتارێکی محەمەد میهری‌یە بەناوی « اساس » ەوە بە زمانی تورکی لەژمارە (2، 4، 10، 15، 16، 18، 19) ی گۆڤاری « کوردستان » ی ئەستەموولدا (1919 — 1920) بلاوی کردوتەوەو باسی ڕێزمانی کوردییە .

لە ژمارە (2) دا هەندێ ڕای شتی لەبارەی ڕێزمانی کوردییەوە خستۆتە پێش چاوو ئنجا دەلێ : هەولی لێکۆلینەوەی ڕێزمانی کوردی دەکرێ بە دوو بەشەوە : ڕۆژهەلاتی و ڕۆژئاوایی ... ڕۆژئاوایی زووتر دەستی پێکراوە .

لەژمارە (4) دا وا رادەگەیەنێ ، کە ئەوەی دەربارەی ڕێزمانی کوردی لەڕۆژهەلات نووسراوە زوربەی چاپ نەکراوە . ئەوەی لەلایەن (حاجی فخر المالیکی ئەردەلانی ناظری مالیەی ئێران) ەوە نووسراوە ، چاپکراوە . ئەم کتێبە کە (30) سالێك لەمەوبەر چاپکراوە من تا ئێستا نەمبینیوە ... لەکۆتایی ئەم بەشەدا دێتە سەر باسی کتێبەکەی خۆی و دەلێ : من کە باسی شێوەکانی کوردی دەکەم و نموونەیان لێ دەهێنمەوە بەستم یەك خستنیانە .

لە ژمارە (10) دا باسی چۆنیەتی دانانی کتێبەکەی دەکاو دەلێ . هەرچەندە پێویست بوو کارێکی وا لە لایەن لیژنەیەکەوە بکرێ ، ئەگەرچی ئەمە بۆ کورد هەلنەکەوتووە ، بەلام منیش درێغیم نەکردووە .. پاشان باسی گیروگرفتی نووسینی کتێبەکەی دەکات و بەتایبەتی ئەوەی کە نەیزانیوە کام شێوە بکا بەبناغە .

لەژمـارە (15) و (16) دا باسی چـاوگی کوردی کـردووەو بەسەر چەند جۆرێکدا دابەشی کردوون .

ئـەوەی لەژمارە (18) دایـە دەربـارەی کـرداری کـاتی ئێستایە . ئەو بەشەش کە کەوتۆتە ژمارە (19) ەوە لە بـارەی کرداری فەرمانەوەیە . (بڕوانە : وێنەی ژ 5) .

**136 – کوردجە حرفلری ، گۆڤاری « ژین » ، ئەستەموول ، ژ 18 ، 8 ی مایسی 1335 ك .**

گۆڤاری « ژین » ی ئەستەموول لەژمارە (18) یدا ، کە ڕێکەوتی 8 ی مایسی 1919 دەکات لیستەی ئەلفوبێیەکی کوردی بـڵاوکردەوە(**) . لەو ئـەلفوبێیـەدا پیتە بـزوێنـەکـان و پیتـە کۆنسۆنانتەکان جیاکراونەتـەوە و بۆ یـەکەمیـان (8) پیت و بۆ دووەمیان (34) پیت دیاری کـراوە . لەنێو پیتـە بزوێنـەکانـدا نیگاری (ە ، ی ، و) هەیە . (بڕوانە : وێنەی ژمارە : 6)

**137 – تۆفیق وەهبی ، کوردییەکەمان بەچۆن حرووفێك و چۆن بنووسین ، گۆڤاری « دیاریی کوردستان » ، بـەشی یەکەم ، ژ 5 ، بـەغدا 12 ی مـایسی 1925 ، ل 5 – 6 ؛ بەشی دووەم ، ژ 6 ، بەغدا ، 29 ی مایسی 1925 ، ل 5 – 6 .**

نووسەر لەم وتـارەدا ئەلفـوبێی عەرەبی بـۆ نووسینی کـوردی پەسـەند دەکـاو نیشانی دەدا ، چـۆن فارسـەکان و تورکەکان لەڕێگەی هەندێ دەستکاری کردنی ئەو ئەلفوبێیەوە گیروگرفتی نووسینی خۆیان ڕەواندۆتەوە ، هەروەها کوردیش بـەهەمـان شێواز دەتـوانێ کەم و کـورتی ئەو ئـەلفـوبێیـە ڕەبکاتەوە .

**138 – حەقی شاوەیس ، نووسینی کوردی چـۆن بێ ؟ ، گـۆڤاری « دیـاریی کوردستـان » ، بەشی یـەکەم ، ژ 5 ، بەغدا ، 12 ی مایسی 1925 ، ل 8 – 9 ؛ بەشی دووەم ، ژ 6 ، بەغدا ، 29 ی مایسی 1925 .**

ئەم وتارە بەنموونەو بەڵگـەی زۆرەوە وا دادەنێ کە : 1 – وشـە چـۆن لەدەم دەربچێ بـەو جـۆرە بنـووسـرێ ؛ 2 – وشەی بێگانە بخرێتە سەر ئاهەنگی کـوردی ؛ 3 – دەبێ (ە ، ی ، و ) لەبریتی سەرو ژێروبۆر بەکاربهێنرێ ؛ 4 – دەبێ ئامرازی پێوەندی و پریپۆزیشن و .. بەجیا بنووسرێن ...

**139 – حـەقی شاوەیس ، ئیمـلای کـوردی ـ حـرووفـاتی عەرەبی ، گۆڤاری « دیاریی کوردستان » ، بەشی یەکەم ، ژ 8 ، بەغدا ، 14 ی تەمووزی 1925 ، ل 7 – 9 ؛ بەشی دووەم ، ژ 10 ، بەغدا ، 21 ی تشرینی یەکەمی 1926 ، ل 9 – 12 .**

مـامۆستـا شـاوەیس لێـرەدا بـەدوورو درێـژی بـاسی گیروگرفتەکانی نووسینی کوردی بەئەلفوبێی عەرەبی دەکـاو لەو ڕایەدایە ، کە ئەو ئەلفوبێیە بۆ نووسینی کوردی دەست نادات .

**140 – حەقی شاوەیس ، لاپەڕەی نووسینی تازەو کوردی پـەتی : لە نووسـین و شێوەدا سـەربـەخـۆ ، گـۆڤـاری « دیاریی کوردستان » ، بەشی یەکەم ، ژ 13 – 14 ، بەغدا ، 5 ی مارتی 1926 ، ل 18 – 20 ؛ بەشی دووەم ، ژ 15 ، بەغدا ، 18 ی مارتی 1926 ، ل 11 – 12 .**

نـووسەر لەم وتـارەدا داوا دەکـات بـەرگی عـەرەبی نەکرێتـەبەر نـووسینی کوردی و بـاش پەیـڕەویی فۆنـەتیك و دەستووری زمانی کوردی بکرێت .

**141 – پیرۆت ، کوردی بەچی حەرفێ بنووسرێ ، گۆڤاری « دیاریی کوردستان » ، ژ 11 – 12 ، بەغدا ، 5 ی کانوونی یەکەمی 1925 ، ل 9 – 11 .**

خاوەنی وتار لەسەرەتادا کۆمەڵێ کـۆسپ و گیروگـرفتی ئەلفوبێی عەرەبی خستۆتە پێش چاوو ئنجا لە ئەنجـامدا بـۆ نـووسینی کوردی بـەکارهێنـانی ئەلفـوبێی لاتینی پەسـەند دەکات .

**142 – حـەسەن کـوردستانی ، لەحـەق نـووسـین تـازە ، گـۆڤاری « دیـاریی کوردستـان » ، ژ 16 ، بەغـدا ، 11 ی مایسی 1926 ، ل 8 – 10 .**

نووسەر لایەنی بیروڕای مـامۆستـا شاوەیس و پیـرۆت دەگرێ و دواتر خـۆشی هەنـدێ پێشنیار بـۆ چارەسـەرکردنی گیروگرفتەکانی ئەلفوبێی عەرەبیی دەستکاریکـراو دەخاتـە پێش چاو .

**143 – ئەلفوبێی کوردی ، گۆڤاری « هاوار » ، ژ 1 ، شام ، 1932 ، ل 3 ، 4 ، 5 .**

لەژمارە (1) ی گۆڤاری « هاوار » دا بـەسێ زمان بـاسی ئەلفوبێی کوردی کراوە : أ ـ بەفارسی (الفبای کردی) ، ل 3 ؛ ب ـ بـە تورکی (کـردجـە الفبـا) ، ل 4 ؛ جـ ـ بـەعـەرەبی (الاحرف الهجائية الكردية) ، ل 5 . بەهەرسێ زمانـەکە هـەر هەمان باسە . نووسەر (8) پیتی بزوێن (ە ، ا ، و ، آ ، ێ ، ی ، وو ، ۆ) و بیست و سێ پیتی کۆنسۆنانت (ب ، ج ، چ ، د ، گ ،

ﻫـ ، خ ، ژ ، ك ، ق ، ل ، م ، ن ، پ ، ر ، س ، ش ، ت ، ڤ ، ف ، و ـ W ، ی ـ Y ، ز) ی دەست نیشان کردووە[20] .

144 — جەلادەت عالی بەدرخان ، ئەلفابێیا کوردی ، گۆڤاری ، « هاوار » ، بەشی یەکەم ، ژ 1 ، شام ، 1932 ، ل 3 — 4 ؛ بەشی دووەم ، ژ 2 ، شام ، 1932 ، ل 5 ـ 6 ؛ بەشی سێیەم ، ژ 3 ، شام ، 1932 ، ل 3 — 5 ؛ بەشی چوارەم ، ژ 4 ، شام ، 1932 ، ل 4 ؛ بەشی پێنجەم ، ژ 5 ، شام ، 1932 ، ل 7 ؛ بەشی شەشەم ، ژ 6 ، شام ، 1932 ، ل 6 ، بەشی حەوتەم ، ژ 7 ، شام ، 1932 ، ل 6 ؛ بەشی هەشتەم ، ژ 8 ، شام ، 1932 ، ل 7 ؛ بەشی نۆیەم ، ژ 9 ، شام ، 1932 ، ل 7 ؛ بەشی دەیەم ، ژ 10 ، شام ، 1932 ، ل 4 ؛ بەشی یازدەهەم ، ژ 11 ، شام ، 1932 ، ل 5 .[21]

ئەم زنجیرە وتارەی جەلادەت عالی بەدرخان لە بەشە لاتینی‌یەکەی گۆڤاری « هاوار » دایەو بە دیالێکتی کرمانجیی ژووروە . نووسەر لەم وتارانەدا بە دوورو درێژی لە ئەلفوبێی کوردی کۆڵیوەتەوەو یەك بەیەکی پیتەکانی بەنموونەوە نیشان داوەو چۆنیەتی دەربڕین و نووسینیانی باس کردووە . (بڕوانە : وێنەی ژ 7) .

145 — هەرەکول ئازیزان ، فەرهەنگۆك ، گۆڤاری « هاوار » ، ژ 1 ، شام ، 1932 ، ل 7 ؛ ژ 2 ، شام، 1932 ، ل 6 — 7 ؛ ژ 3 ، شام ، 1932 ، ل 5 — 6 ؛ ژ 4 ، شام ، 1932 ، ل 4 ؛ ژ 5 ، شام ، 1932 ، ل 7 — 8 ؛ ژ 7 ، شام ، 1932 ، ل 5 ؛ ژ 8 ، شام ، 1932 ، ل 8 ؛ ژ 19 ، شام ، 1932 ل 4 — 5 ؛ ژ 20 ، شام ، 1932 ، ل 7 .

ئەم فەرهەنگۆکە لە بەشە لاتینی‌یەکەی گۆڤاری « هاوار » دایە . بریتی‌یە لەوشەو زاراوەی هەمەچەشنەی کوردی‌و ماناکانیان هەر بەکوردی (شێوەی ژوورو) لێك دراونەتەوە . (بڕوانە : وێنەی ژ 8) .

146 — هەرەکولێ ئازیزان ، فەرهەنگۆك ، گۆڤاری « هاوار » ، ژ 6 ، شام ، 1932 ، ل 5 — 6 ؛ ژ 9 ، شام ، 1932 ، ل 6 — 7 .

ئەم فەرهەنگۆکە لەبەشە بەئەلفوبێی عەرەبی چاپکراوەکەی گۆڤاری « هاوار » دایە . بریتی‌یە لەوشەو زاراوەی هەمەچەشنەی کوردی‌و ماناکانیان بەعەرەبی لێك دراوەتەوە .

147 — جەلادەت عالی بەدرخان ، ئەلفوبێی کوردی ، گۆڤاری « هاوار » ، بەشی یەکەم ، ژ 1 ، شام ، 1932 ، ل 8 — 9 ؛ بەشی دووەم ، ژ 2 ، شام ، 1932 ، ل 8 — 9 ؛ بەشی سێیەم ، ژ 3 ، شام ، 1932 ، ل 7 — 9 ؛ بەشی چوارەم ، ژ 4 ، شام ، 1932 ، ل 8 — 9 ؛ بەشی پێنجەم ، ژ 5 ، شام ، 1932 ، ل 5 ؛ بەشی شەشەم ، ژ 6 ، شام ، 1932 ، ل 9 ؛ بەشی حەوتەم ، ژ 7 ، شام ، 1932 ، ل 9 ؛ بەشی هەشتەم ، ژ 9 ، شام ، 1932 ، ل 9 ؛ بەشی نۆیەم ، ژ 10 ، شام ، 1932 ، ل 5 ؛ بەشی دەیەم ، ژ 11 ، شام ، 1932 ، ، ل 7 — 8 ؛ بەشی یازدەهەم ، ژ 12 ، شام ، 1932 ، ل 4 ؛ بەشی دوازدەهەم ، ژ 15 ، شام ، 1933 ، ل 6 — 8 ؛ بەشی سیازدەهەم ، ژ 16 ، شام ، 1933 ، ل 10 ؛ بەشی چواردەهەم ، ژ 17 ، شام ، 1933 ، ل 9 ، ژ 18 ، شام ، 1933 ل 3 ؛ بەشی پازدەهەم ، ژ 18 ، شام ، 1933 ، ل 5 .

ئەم زنجیرە وتارەی جەلادەت بەدرخان بەزمانی فەرەنسی‌یەو لەبەشە فەرەنسی‌یەکەی گۆڤاری « هاوار » دایە . نووسەر لەم وتارانەدا بەدوورو درێژی لەئەلفوبێی کوردی کۆڵیوەتەوەو تیکرای پیتەکانی بەنموونەوە نیشانداوەو چۆنیەتی دەربڕین و نووسینیانی باس کردووە .

148 — جەلادەت عالی بەدرخان ، زمانی کوردی ، گۆڤاری « هاوار » ، بەشی یەکەم ، ژ 1، شام ، 1932 ، ل 11 ؛ بەشی دووەم ، ژ 2 ، شام ، 1932 ، ل 9 — 11 ؛ بەشی سێیەم ، ژ 3 ، شام ، 1932 ، ل 9 — 11 .

نووسەر لەم وتارانەدا ، کە بەزمانی فەرەنسی‌یە باسی ئەسڵی زمانی کوردی‌و دیالێکتەکانی دەکات .

149 — جەلادەت عالی بەدرخان ، ڕێزمانی کوردی ، گۆڤاری « هاوار » ، ژ 16 ، شام ، 1933 ، ل 5 — 10 ؛ ژ 17 ، شام ، 1933 ، ل 5 — 9 ؛ ژ 18 شام ، 1933 ، ل 5 — 8 ؛ ژ 25 ، شام ، 1934 ، ل 16

نووسەر لەم زنجیرە وتارەدا ، کە بەزمانی فەرەنسی‌یە لەبارەی ناوو نێرو مێ‌و تاك‌و کۆو جێناوو ژمارەو هەندێ مەسەلەی تری ڕێزمانی زمانی کوردی دواوە .

150 — ب . میللیر ، ڕێزمانی کوردیی بێیدار ، گۆڤاری « نووسین‌و شۆڕش » ، ژ 1 ، مۆسکۆ ، 1933 ، ل 227 — 233 .

ئەم وتارە کە بەزمانی ڕووسی یە ڕەخنەو نرخاندنی ئـەو کتێبی « ڕێزمانی کوردی » یەی پاول بێیدارە کە ساڵی 1926 لە پاریس بڵاوی کردۆتەوە .

**151 — ع . شـەمـۆ ، ق . کـوردۆ ، ئی . تسـوکـەرمـان ، دەربارەی ئیزافە لەزمانی کوردیدا ، گۆڤاری « شـۆڕش و نووسین » ، مۆسکۆ ، 1933 ، ژ 1 ، ل 51 — 56 .**

بۆ یەکەم جار لەمێژووی کوردناسیدا لەم وتارەدا (کە بە زمانی ڕووسی یە) نیشانەکانی ئیزافە دیاری کراوە .

**152 — ع . شەمۆ ، ئی . تسوکەرمـان ، لەبارەی کێشـەی بـزوێنی (ا) ی کـوردییـەوە ، گـۆڤـاری « نـووسـین و شۆڕش » ، ژ 1 ، مۆسکۆ ـ لێنینگراد ، 1933 ، ل 179 — 180 .**

ئەم وتارە بەزمانی ڕووسی یەو لەبارەی بـوون و دەوری بزرۆکە (کسرە مختلسە) ی (ا) وە دەدوێ .

**153 — ع . شـەمـۆ ، ئی . تسـوکـەرمـان ، ق . کـوردۆ ، دەربـارەی کێشەی جنس لەزمـانی کوردیـدا ، گـۆڤـاری « نووسین و شۆڕش » ، ژ 1 ، مۆسکۆ ـ لێنینگراد ، 1933 ، ل 160 — 178 .**

بەر لە بڵاوبوونەوەی ئەم وتارە مەسەلەی جیاکردنەوەی نێرومێ لەزمانی کوردیدا باس نەکرابوو . لەم وتارەدا (کە بە زمانی ڕووسی یە) لە ڕێی کۆتایی وشەوە لەحاڵەتی جیاوازدا سێ جنسی نیرو مێ و بێ لایەن دیاری کراون .

**154 — ئۆ . ل . ڤیلچێڤسکی ، لەبارەی زاراوەی « پاڵە » ی کوردییەوە ، گـۆڤاری « زمـان و بیر » ، مـۆسکۆ ، 1935 ، ب 5 ، ل 97 — 102 .**

ئەم وتارە بە زمانی ڕووسی یـەو نووسـەر لە چۆنیـەتی پـەیدابـوون و گەشـەکردنی وشـەی (پاڵە) ی کـوردی دواوە تێیدا .

**155 — ئی . ئی . تسـوکـەرمـان ، دوو کتێبی ڕێـزمـانی پرۆفیسۆر خاچاتۆریان ، گۆڤاری « زمانناسی سۆڤیەتی » ، لێنینگراد ، 1937 ، ب 4 ، ل 153 — 172 .**

ئەم وتارە بەزمانی ڕووسی یەو ڕەخنەیە لە : 1 — کتێبی « زمـانناما کورمـانجی » ی پرۆفیسـۆر خاچـاتۆریـان ، کـەساڵی 1932 لەیـەریڤان بـڵاوی کـردۆتـەوە ؛ 2 — کتێبی « زماننامە ژە کورمانجی » ، کە پـرۆفیسۆر خـاچاتـۆریان و حاجی جندی ساڵی 1935 لەیەریڤان چاپیان کردووە .

**156 — ئی . ئی . تسوکەرمـان ، ئەنـدامی نادیـاری کۆ لە زمـانی کوردیـدا ، گۆڤـاری « زمـانناسی سۆڤیـەتی » ، لێنینگراد ، 1937 ، ب 4 ، ل 101 — 103 .**

ئەم وتارە بەزمانی ڕووسی یەو لەو حاڵەتانە دەدوێ ، ک چـۆن ناو بێ ئـەوەی نیشانـەی کـۆی پێوەبێ مـانـای کـ دەگەیەنێ .

## پەراوێزەکان :

(12) مەبەستی (باب الاسماء) ە .

(13) لەبارەی ئەو فـەرهەنگـەوە ، بڕوانـە : د . ئەوڕەحمـانی حاجی مـارف ئەستێرەگەشە لەژێر هەوری هەڵەو ناتەواوی‌دا ، ڕۆژنامەی «بیری نوێ بـەشی یەکـەم ، ژ 447 ، بەغـدا ، 1977/7/2 ، ل 4 : بەشی دووەم ، ژ 448 بەغدا ، 1977/7/9 ، ل 4 .

(14) سەبارەت بەم بەرهەمە ، بڕوانە : د . ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، کـارێکو گەورە لەباسی ئیدیۆم لەزمـان و فەرهـەنگ نـووسیی کوردیـدا ، گۆڤـاری « بەیان » ، ژ 63 ، بەغدا ، 1980 ، ل 2 — 6 .

(15) بـۆ زانینی زیاتـر لەم بارەوە ، بـڕوانە : د . ئـەوڕەحمانی حـاجی مارف ڕێنووسی کوردی لەڕەگەو ڕیشەوە ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ 4 ، هـە ولێر 1983 ، ل 39 ـ 47

(16) دەربـارەی ئەو فـەرهەنگـە ، بڕوانـە : د . ئەوڕەحمـانی حـاجی مـارف هەولێکی مەزنی نوێ لە جیهانی فـەرهەنـگ نووسیی کـوردیدا ، گـۆڤاری «کاروان» ، ژ 17 ، هەولێر ، 1984 ، ل 22 — 29 .

(17) لەبارەی ئەو کارەوە ، بڕوانە :

ا ـ محەمەدی مەلا کەریم ، هەنگاوێکی‌تر بە ڕێگای دانانی دەستوورێکدا بۆ نووسینی کوردی ، گۆڤاری « نـووسەری کـوردی ، ژ 8 ، بەغـدا ، 1973 ل 7 — 12 .

ب ـ د . ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، کورتەیەکی مێژووی نووسینی کوردی بەئەلفوبێی عەرەبی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد ب 8 ، بەغدا ، 1981 ، ل 85 — 87 .

(18) ڕەنگە چ ئەم وتارەو چ وتاری « عرفان ، بەشی تریان هەبێ .. جا ئێمە لەبەر ئەوەی چەنـد ژمارەیـەکی گۆڤـاری « کوردستـان ، مان دەست نـەکەوت نەمانتوانی بکەینە ئەنجام .

(19) ئەو ئەلفوبێ‌یە لەژمـارەکانی دواتـریشدا بـڵاوکراوەتـەوە . بەدوا ژمـارە (18) دا ، من تەنیا ژمارە (19) و (21) ، بینیوەو لەهەردووکیاندا هەیە .

(20) ئەگەرچی ئەم وتارانە ناوی نووسەرەکەیان لەسـەر نییە ، بـەڵام هەمـوو بەڵگەیەك وا دەگەیەنێ ، هی جەلادەت بەدرخان بن .

(21) ڕەنگە ئەم وتارە بەشی تری هەبێ ، بەڵام لەبەر نەبوونی هەندێ ژمارەی ئەوەمان بە ئاڵۆزی لامایەوە .

هەردەوێل کاکەیی
30 ئازار 84

# داستانی (بَدیع الملك وَبَدیع الجمال)

ئاشنایەکی دلْسۆزم بەناوی (بورهان ئەسعەد قادر) ەوە دانشتوی شاری سولەیمانیە گەڕەکی کانی ئاسکان کەشکۆڵێکی دەس نووسی بەدیاری پێش کەش کردم ،ناوەڕۆکی کەشکۆڵەکە بریتیە لەداستانێکی کوردی بەناو نیشانی (بَدیع الملك وَبَدیع الجمال) ، دانەری داستانەکە (مستەفا دولی دولی) یە ، بەشێوەی هەورامی (گۆران) دایڕشتووە .

کەشکۆڵەکە لەساڵی 1948ی ز . دا نوسراوە ،قەوارەکەی (17سم × ½ 10سم)ە ، (77) لاپەڕەیە هەر لاپەرەیەکی بریتیە لە (15 بۆ 16 بۆ 17) خشت ، بەمرەکەبی رەشو مۆر نوسراوە ، زوربەی ناونیشانی بابەتەکانی بەمرەکەبی سوور نوسراوە ، بەداخەوە نووسەری کەشکۆڵەکە ناوی خۆی نەنووسیوە .

ئەم داستانە واتە داستانی (بَدیع الملك وَبَدیع الجمال) چیرۆکی دوو دلْدار دەگێڕێتەوە کوڕەکە ناوی (بَدیع الملك)ە ، کوڕی سنجەر شایە ، گوایە پادشای وڵاتی (مصر) بووە ، کچەکەیش ناوی (بَدیع الجمال)ە ، کچی سەلیم شایە ، گوایە پادشای وڵاتی (شام = سوریا) بووە لەشاری (حەلەب) .

پێشەکی داستانەکە بەم جۆرە دەست پێ دەکا :ـ

پادشای بێ چون ، پادشای بێ‌چون
شوکرانەم بەتووەن پادشای بێ چوون
کیاستی بەوار حەرف کافو نوون
دنیا فانی کەر بکون فەیەکوون
لاشەریکە لە ئەوەڵ ئەبەدی
سیاو سفیدی تۆ ئیجاد کەردی
بەقەوڵ سابق پێشینان پێش
هەرکەس مەیاوا وەئەعمال وێش
من جوزو فەقیر بەندەی موعیفم
عاسیو عوسیان بار خوارو خەفیفم
نەجات دەر پەنەم بەشق پێغەمبەر
بکەرۆن سەنای فرزەند سنجەر
ئەو جەمسر شار پادشایی بی
شاهان کول جەلاش چون گەدایی بی
چەند ساڵ پادشای مسر وڵات بی
پەرەی فرزەندێ فراوان مات بی

وا لێرەدا بە کورتی باسی چۆنێتی عاشق بوونی (بدیع الملك)و (بَدیع الجمال) دەکەین .

شا (بَدیع الملك) لە تاق لاوێتیدا دەبێ ڕۆژێ لەگەڵ چەند وەزیریکیا دەچنە ڕاو ، لە دەشتێکی بەرێنی بیاباندا دەبینێ پیاوێکی هەژاری سەر لێ شێواو لە پەنایەکدا دانشتووەو بەکول دەگریێ ، هۆن هۆن فرمێسکی زەردو سوور بەسەر گۆنا ڕەقو قۆپاوەکانیدا دێتە خوارێ .

(بَدیع الملك) کاتێ ئەم پیاوە هەژارە دەبینێ گەلێ خەمبار دەبێ ، وردە وردە دەچێتە لایەوەو سڵاوی لێ دەکاو لێی دەپرسێو دەڵی ..

ئەرێ مام عەودال ئەوە بۆچی لەم دەشتی چۆڵو هۆڵە بەم چەشنە دەگریو خاكو خۆڵ بەسەرتا دەکەی ؟ هەژارەکە لەوەلامدا دەڵێ .

تۆ هێمان منداڵی ، تازە پێ گەیشتوی ، ساردیو گەرمی دنیات نەچێشتووە . لەدڵم نایە کارەساتی دڵ تەزێنی خۆمت بۆ بگێڕمەوە .

لەپاش تەقەلاو تکا کردنی پاشا هەژار ناچار دەبێ ڕووداوی خۆی بۆ دەگێڕێتەوەو دەڵێ :ـ

من بازرگانێکی دەوڵەمەند بوم . ڕۆژێ بۆ شتو مەك کڕینو فرۆشتن ڕێگام کەوتە شاری (حەلەب) لەوێ چاوم بە (بَدیع الجمال) کچی (سەلیم) شاە کەوت ، دەست بەجێ عاشقی بووم ، هەرچی ماڵو سەروەتم هەبوو لەپێناویا دامنا ،



شا دەس بەجێ لەگەڵ هەواڵەكانی دەگەڕێنەوە بەرەو ماڵ ، خەمو پەژارە دای دەگرێ ، ڕەنگی زەرد هەڵ دەگەڕێ ، بیری لەوە دەكردەوە چۆن خۆی بگەیەنێتە ئەو كچە ناسكۆڵە هەر چەند وێنەكەی دەبینی ئارامی لێ دەبڕا ، بۆ ڕۆژی داهاتو فەرمان دەدا وەزیر (جادار) بێ بەجێ نشینی تا ئەم خۆی بڕوا بۆ شاری (حەلەب) بە نیازی ئەوەوە چاوی بەدلدارەكەی بكەوێ ، چەماوەرەكەو وەزیرەكانی قایل نابن بەم كارە ، زۆر لێی دەپاڕێنەوە ئەم ئیشە نەكا ، هەر چۆنێك بێ ڕازیان دەكا ، شمشیرەكەی باوكی هەڵ دەگرێو سواری ئەسپەكەی دەبێو بەرەو حەلەب ئۆغر دەكا ، لەپاش ئەوەی دەگاتە ئەوێ بەهۆی باغەوانەكەی شاە (سەلیم)ەوە واتە باوكی (بدیع الجمال) چاوی بەدلدارەكەی دەكەوێ ئەمیش نموونەیەكە لە وتوویژ كردنی نێوانی (بدیع الملك)و (بَدیع الجمال) .

شـای (بـدیـع الـملك) ئـامـا وەجـەواب
جـە دیـدە ڕێـزا قـەتـرەی گـوڵ گـوڵاب
واتش ئـەی نـازدار نـوور بـیـنـایـی
مـوڵكو مـاڵو گـەنـج كـەوكـەبـەی شـایی
من شـەهـزادەی مسر نـەوەی سنجـەرم
پـەرێ خـاڵ تـۆ مـن دەربـەدەرم
یـەك سـاڵەن تـەمـام ئـاوارەی تـوونـم
پـەرێ خـاڵ تـۆ وێـنـەی مـەجـنـوونـم
ئـەر خـەبـەر پـرسی حـاڵاتـم ئـێـدەن
وەرنـە جـی دنـیـا دڵ نـائـومـێـدەن
نـازدار نـەوخـێـز شـەهـزادەی حـەلەب
پی حـەرفـو گـوفـتـار یـاوا بـەمـەتـڵەب
فـەرمـا بـەسـاقـی بـەشـەوق سـادە
بـەشـەهـزادە دەر جـامـێ جـەبـادە
بـدەرە پـەنـەش نـۆش كـەرۆ یـەك جـام
بـەیـاد دەوران شـاهـان ئـەیـام
سـاقـی دەر لەحـزە جـامێ بـادەی نـاب
داوەشـازادە بـۆی عـەتـرو گـوڵاب
سەندش مەی جە دەست ساقی سەمەنبەر
نـۆشش كـەرد وەیـاد دوو دیـدەی دڵبـەر
كـێـشـا وەسـەردا شـەراب گـوڵ ڕەنـگ

لە پاشا كەزانیم هیچ بەهیچ نـاكەم چـوومە لای نیگـار كێشێ نیگاری ئەو شۆخەی بۆ دروست كردم ، وێنـەكەم هـەڵگرتو لەچەشنی مەجنوون ڕووم كردە دەشتو چۆڵ ، بووم بە عەوداڵی دێوانە ، سەبووری من ئەم نیگارەی (بَدیع الجمـال)ە ، جار جارێ دەری دەهێنمو تەماشای دەكـەم ، بەسـەریدا تـاوێ دەگـریم ، بە هـەردوو دەس دەدەم بەتـەپڵۆكەی سـەرمدا ، لەجیاتی نوستنو خواردنەوەم خەمو پەژارەو گریانە .

شاە (بدیع الملك) داوای بینینی وێنەی (بدیع الجمـال) دەكا .

عەوداڵ ئەڵێ حەز ناكەم پێتی پیشان بدەم دەترسم وەك من شێتوویت بیتو دەشتو دەر ببێتە جێگات .

(بَدیع الملك) هەر چۆنێك دەبێ ڕازی دەكاو وێنـەی پێ دەردەهێنێ ، پاشا بەبینینی وێنەكە لەهۆش خـۆی دەچێ لە پاش سەعاتێك دێتەوە سەر خۆیو پاداشتی دەكاو نیگارەكەیشی لێ دەكرێ .

واتش خاكو پای شەیدای شۆخو شەنگ
داوه جەوابش عومرو گیانو ماڵ
بەمزەی تۆ بۆ (بَدیع الجمال)
(القصە) ئەو شەو تاوەنیمەی شەو
بادە مەنۆشان هیچ نەكەردن خەو
دمای نۆشا نۆش بادەی لاله ڕەنگ
دەست وەست نەگەردەن شەهزادەی فەڕەنگ
گرتش نەئاغۆش بۆ نیا وەبۆش
بەبۆسە بازی شەیدای شەڕ فرۆش
پێچیان بەهەم چون توولی لاو لاو
بەبۆسە بازی بەر كەردن زوخاو
دمای نۆشا نۆش بار لەب وەردەن
بەبۆسە بازی دوو دەست نەگەردەن
(بدیع الجمال) وات گیانی شیرین
نەوا بشنەوان ئەغیاران دین
نامەی بەد نامیم بوانان جە ئەیام
ببین بەواتەی خەڵق خاسو عام
هوریزە بشین پەریٚ باغ من
ساكن بەر پەی ویٚت نی زیدو زامن
ئەگەر خوداوەند بدەرۆم نەجات
سەرو ماڵو عومر گشت مەنیۆ نەڕات
ئەگەر خوداوەند نەسیبت كەردەن
من یاری تۆنان تا بەڕۆی مەردەن

داستانەكە بەم چەند دیٚڕەی خوارەوە كۆتایی پیٚ دیٚ :ـ

بەعزیٚ ڕوو نیان پەریٚ شیٚری نەڕ
ڕژیان نەڕووی هەم شیٚران سەفدەر
ئەوەند زەخم سەخت دیٚوان مەلعوون
دان وەشەهزادە ئەعزاش بی نەگوون
شەهزادە جەقەهر دلیٚر بیٚ باك
غیرەتدا بەویٚش بەور سینە چاك
هورگرتش شەهباڵ بەرد نەفەرق سەر
وەستش نەڕووی خاك عەرسەگای خەتەر .

تكاو بانگەوازم ئەوەیە داوا لە هەموو ڕۆشنبیرانو خویٚندەوارانی نەتەوەكەمان دەكەم ئەوەی نوسخەی ئەم بابەتەی لا دەس دەكەویٚ ئاگادارمان بكاتەوە بەم ناو نیشانە (كركوك ـ مكتبة الطليعة) بۆئەوەی بەراوردی بكەین لەگەڵ ئەم كەشكۆڵەی كەوا لەبەر دەس دایە بە هیوای ئەوەوە بتوانین لە دەرفەتیٚكدا بەچاپی بگەیەنینو بیخەینە بەر دەستی خویٚندەوارانی گەلەكەمان لەپیٚناوی خزمەت كردنی وشەی پیرۆزی كوردیو زیندو كردنەوەی كەلەپووری نەتەوایەتیمان .

* كاكەیی بەدیٚڕی شیعر دەڵیٚن (خشت) ئەم وشە وشەیەكی كوردی ڕەسەنە لەوشەی (بەیت) پەسەند ترە .

## فەرهەنگۆكی شیعرەكان

كیاست : ناردی
سیاه : ڕەش
سفید : سپی
بەشق : بەعیشق
فرزەند : كوڕ
جە : لە
گەدا : سواڵكەر ، دەروازەكەر .
پەریٚ : بۆ
ئاما : هات
ئیٚد : ئەمە
نەوخیٚز : تازە پیٚ گەیشتو ، نەونەمام
حەرف : قسە .
پی : بەمە
دما : پاش ، دوا
ئاغۆش : باوەش
بۆسە : ماچ
ئەغیار : دوژمن ، بیٚگانە
هوریٚز : هەستە
ویٚت : خۆت
زەخم : برین
چاك : زامدار
هورگرد : هەڵی گرد

# گوتنێت پێشیاو چەند لایەکێت ئابوری

نزار محمد سعید

لدرێژیا قوناخێت مێژووا مللەتێ کورد ، سامانەکێ گران بهـا یێ کەلەپـورێ فولکلورێ نـەتەوەیی پێـك هاتیـە . لایێت ئابوری‌و کۆمەلایەتی لژینگەها وی خویا کرینە . یا زانایە کو هەر ئێکی دناڤ کۆمەلیدا ، برێکا خو یا تایبەتی باسێ ئارمانجێت خوە کریە . وە رویدانێت جڤاکی‌و ئابوری لدویڤ تێکەهەشتنا خوە . هەروسا لدویڤ کارێ جڤاکی یێ‌کو پێ رادبیت . ئەڤ رویدانە دەستکـەڤتێ سەربـورانە ئـەڤێت بسەرێ کـورێت مللەتی‌ڕا بورین . هەر سەربۆرەك ژڤانا ژمەرا ئاشکـرا دکەت هـەبونـا پەیوەندێت ئابـوری لناڤ چینێت خـەلکی ، دیسا چـارچوڤێ پەیوەندێت جڤاکی لناڤ بەرا ڤان چینا دەستنیشان دکەت[1] . ئەڤ چەندە بزلی‌و بەربچاڤی دگۆتنێت پێشیادا هاتینە . ئەوژی توخمەکن ژتوخمێت فولکلورو سامانێ نەتەوەیی . بسپـورێت کەلەپوری دبێـژن «گۆتنـا پێشیا رەنگـەکێ تورەی‌یـە مشتی راستیە ، دوو تاییێ نزانیت . ئەڤ رەنگێ تورەی دویر ما ژژێر دەستیا میرو قرالان ، ئەڤێت کو های ژڤان گۆتنـا هەیـە ، لێ نکارن بەرامبەر چ بکەن .

ئەو دکارن نەهێلن سترانـەك بەلاڤ ببیت ، لێ نکـارن بەرسینگا گۆتنەکا پێشیا بگرن . چمکی ژهەڤ تێنە دەر ، دناڤ کۆمەلیدا بەلاڤ دبن مینا بەلاڤبونو بێڤەچونا ئاگری بهویشیڤە . ئەڤ هونـەرە گش تەوژمێت جڤـاکی لناڤ مللەتی پێشچـاڤ دکەت . ژبەر هندێ گۆتن زۆر یا گرنگە دلێکولینێت تورەیی‌دا[2]

وەیا گرنگە لبا مللەتا ، هەتا بوێ چەندێ بویە موڵکێت ئاسونی ، دئاسونێت واندا ، دیسا بوینە دروڤێت رامیـاری . گۆتنا پێشیا لایەکێ ژیانێ نەهێـلایە دەرگـەهـ لێ نەڤـوتای . نەمازە لایێت ئابوری ، بابەتێت دبنە بناغێ ئابورێ تامینا کاری‌و بەرهەمی . رێزکێت ژوری بکورتی روناهیەکێ بسەر ڤان لادا بەرددەت .

## هەرِەشو بدەستی‌خو ...

لپـاناڤێت کـاری ، چەلەنگی‌و دەستهـەلیا رێنجبـەرا پێ‌گۆتیە . نە ژ سینجا وانە ئەو روژەکێ خوە بهویڤیـا ئێکیڤە بهێلن . لبا وان زیرەکی‌و نەزیرەکیا وان ئەوە یاکو دشـولی‌دا دیاردبیت . شەڤ لڤێری‌و دەق لوێراهـە شەڤ‌و روژا ، هـەتا دکارن پاریێ ژیارا خوە دەستەسەر بکەن . خەمساری‌و ترالی ژوانرا دەست نادەت . بێ‌کاری یا کێم بو ، ئەم دکارین بێژین نەبو دناڤ رێزێت مللەتێ مەدا .

هەر کەسێ هێزا کاری هەبیت دخێزانیـدا تڤی‌یا شـول بکەت ، زەندکێت خـوە هەلدەت ، بـەرپێکا گـرێدەت . سـەر بەرزی‌و سەربلندیا وی ئـەوە یا دشولی‌دا دبینیت . دەرباری خوە بستۆخوەڤەگرتنێ دشولی‌دا ، وە نەهێلانا کارێ خـوە ، ژیارا خوە ، نانێ خوە لهویڤیا خەلکی ، گۆتنێت پێشیا هاتینە بشێوەکی شیرەت‌و ئاموژگاریا . گازینە ژبو کارکرنێ . یا فەرە لڤێرێ ئەم بێژین کو ئەڤ گۆتنێت ئابوری ، بەندکێ هاریکاریێ دنـاڤ بەرا کـورێت مللەتی‌دا ناپچینیت ، بـەلکی شـەمـایێ تێ‌ددەت وە موکم‌و قایمتر لێ دکەت . ژڤان گۆتنا :

- رِەشو بدەستێت خو هەکە ئاڤێ تو بری .

- هویڤیا دەرا خولیا لسەرا[3] .
- کەسێ منو دەستێ منو[4] .
- شولێ خەلکێ ئاڤا د سەلکێ .
- بهویڤیا وەریسێ خەلکی ، نەچە کەڤری .
- نانێ مروڤی هەکە دچانتکێ خەلکیدا بیت دێ هەر برسی بیت . ؛

ماندلا[5] نـاهێت کرن کـو کار شێنکستێ وەرارا[6] ژیـانا مـروڤییـە . هێـزا مـروڤییـە . تـەنهـا کـار تـوزا هـەژاریو سـەرگەردانیێ ژخودانی داتقوتیت . چاوا «ناسن ژبێ شـولی ژەنگی دبیت» نو بویچ دبیت بکێر چ ناهێت ، وسا مروڤ ژی ژبێ شـولی ژار دبیت ، سـار دبیت ، تـەنگـاڤییو نـەخـوشی لتم لێهڤانداریا وینە . خەلك بێزا خوە ژێ دکەت . نان ژێرا دچ کولینادا ناهێتە خار «نانێ نەکەرا ل چ ئەردا نینە»

## بەتالی خراب مالی

مروڤێ نەکەر چ جارا خوە نابینیت تشتەکێ بسەر بێژنگا وی کەتی «بێ حم حم چێ نا بیت[7]» .

کەسێ نەکەر ، بێکار دناڤ کومەلیدا ، یا بێ گومانە ئەو زیانێت خوە ئو بێت خەلکی تەڤدا دکەت . بێت خوە ئـەوە چ بدەستڤە ناهێت ، برسییە ، کەس بویتە پێ ناکەت . ئـو بێت خەلکی ، مروڤێ بەتال ژبەتالیا خوە دێ گلێیت خرابو بویچ دەرهەڤا خەلکیدا بێژیت ، خوە لحەفکا وان دەت ، ژبل هندێ چ کریارەکا نە ژ هەژی مروڤی درست ژڤـان چێ دبیت ، مینا دەروزنیو دزیـیـا وە خارنـا مالێ خـەلکی ئو فێـلو فـەنـدو تەشقەلا : لسەر ڤان دەستـەکا هـاتیە گـوتن «بەتـالی خراب مالی[8]» .

وە «شەر ژبەتالیێ چێترە» ، لڤێری پێشیا بیرا خوە یا تییژ لسەر بەتالیێ خویا کریە ، بەلێ .. شەر شولەکێ خرابە کەس حەژێ ناکەت ، نەمازە هەکە لسەر نەهەقیێ بیت . لێ چەندێ خراب بیت بو خرابیێ ناگەهیتە رێزا بەتـالیێ . ژبەتـالی هەر وەکی هاتیە دیارکرن ، مـروڤ بێنگاڤێت خـارو ڤیچ تـاڤێت . «ژبەتالی (....) بابێ خوە دا بەر داسا[9]» ئەڤ گوتنە ژی مانایەکا کویر رون دکەت ژئێشێت بەتالی دبیتە خەتاکێت وان .

## کەرەوو خورەوو نەکەرو دل کەسەرو

ژرەخەك دنڤە کەسێ کارکـەرو رێنجبەر ، خـوەشتڤیێ خەلکییە ، شرینە بدلێ وانڤە دنویسێت . ئەو تەنایە ترسێ ژپاشە روژا خوە ناکەت . لتم سەربلندو سەرڤەرازە ، تاما دەڤێ وی خوەشە ، خوەرێ وی شیرە ، ئاڤاهیێ وی عولیە . مـروڤێ هەییو کەدخودا دکاریت چـاکیو ڤەنجییـا لخەلکی بکـەت ، دەستێ هاریکاریێ ژوانرا درێژکەت . مەرڤ دکاریت ڤێ بکەت بنانێ خوە یان بزارو ئەزمانێ خوە میناد گوتنادا هاتی :

«یان . نانێ تە گەنم ، یان زارێ تە گەنم» .

دەرهەڤا بەرزیو مەزنیـیا کاری دژیـانا مـروڤیدا ، پێشیا گوتیە :

- **شولکەرێ خوەبە خوشتڤیێ خەلکی .**
- **کەرەوو خورەوو نەکەرو دل کەسەرو .**
- **هەتا مرنێ چەعف لکرنێ[11] .**
- **هەتا کەڤا دەستـا رەش نەبیت تـاما دەڤی خـوەش نابیت[12] .**
- **گەریان دریانە رزق لسەر پیانە .**
- **رویڤیێ گەروك چێترە ژشیرێ خەووك[13] .**
- **مالخوێیێ من پەزداربە ، دێ هـەر خوەرێ من شـیر بە[14] .**
- **حولێ گوت گولێ هەکە ئەم ملێ خوە نەدەین لبەر شولی کولکێ مە نابت عولی[15]**
- **شول چەکە هەوجەبویێ ڤەکە .**

دناڤ چینێت مللەتیدا ، کەسی هەنە چاڤێ وان لدەستێ خەلکییە . ئەڤە نە وجێ ژخوە دگرن ئو نە ژخەلکی . پێشیا مینا سها بەلگی دانانە . نە سهێ ددەتە خوە ئو نە خەلکی . نـە مافای دگەهینیتە خوە و نە خەلکی . ژڤان توخمارا گوتیە !:

«سها بەلگێیە نە لخوەیە نە لخەلکێیە»[16] .

هندەك هەنە ، بێ خوە ژ بەرکا خـوە زێدەتـر تاڤـێن . ژبەرهەمێ هێزا خوە ژکارێ خوە بتر دخون . ژڤـان کەسـارا هاتیە گوتن :

«بو خارنێ جەنجەرن بو کرنێ نێرەکەرن»

## رێبەری وئابور

چاخێ دنێرینە کاری ، هەر کارەکێ هەبیت . دێ شێین بێژین ،

ڤی کاری شەهرەزای‌یا تی‌دا ، وێ‌هە شەهرەزایی تی‌دا نینە . کارێ باش یێ دیارە ، لگەل شەهرەزاییێ ، خودانێ رێبەر بیت ، دێ هەمی دەما فەرسەت بدەستڤە هێت ، ئودێ یێ سەرکەفتی بیت دکارو کەسپا خوەدا . رێنجبەرێ لبیرێ کو «روژان رۆژ لدوی تین» برس لێ نابیتە مێهڤان . ترسا روژێت رەش ، خەلك فێری دەستڤەگرتن‌و رێبەریێ دکاری‌و بەرهەمی‌دا هوسا هاتینە :

«مال زێ‌یە ئابور تێ‌یە» وە «خابورە بەلێ بئابورە» دیسا دبێژن «هەکە بنێ کارێ ئابور نەکر سەری کارێ فایدە نەکر» وە «رێبەری چێترە ژ رێنجبەریێ» بەرو ڤاژی زیرەکی‌و چەلەنگیێ ، پیشیا ترال‌و تەمبەل ژبیر نەکرینە . هەر وەکی ژوان‌را دبێژن : «پالێ پیس داسکا باش دهەلگریت» ، «پاژو نیکلێ وێ شتی دەڤێ شالوکێ یێ تێتە پێش چاڤێت من» چیروکا ڤێ گوتنێ : دبێژن مروڤەکێ ترال‌و تەمبەل لگوندەکی هەبو ، گوندیا تەکبیرا خوە کر لگەل خوە ببەنە زبارەکا دروینێ . شالوکەك کرنە دلەپاداو بر . هندی جگارە کێشانەکێ دروین کر کەسیرەبو ئینا رونیشتە خار ئو هێدی هێدی شالوکا خوە فدەخل‌را دئیناو دبر دا هەڤالێت وی نەبێژن شول ناکەت .

بیستەکا دی پێڤە چو خوە درێژکر . هەڤالێت وی هێلا لپشت خوە ، یێ بەروکێ ددەنە بەر سینگێ خوە ئودشەقینن . ئێڤاری یێ لسەر شیڤی هند دیت مریشکەك نێزیکی سفرا زادی بو ، ئینا لژنکا خوە حەیتاند : فاتو هەکە عەیشو کا وەرە ڤێ مریشکێ پاژو نیکلێ وێ شتی دەڤێ شالوکێ یێ تێتە پێش چاڤێت من زانایێت ئابوریێ دبێژن لهەر سەردەمەکێ هەبیت ، دبیت هەژاری‌یا هەژارو سەرگەردانا ، خەتاکێت رژێما ئابوری بن لوی چاخی . ئو دبیت ژی ، هەر لوی چاخی کەسێت هەیی‌و کەدخودا ، ببنە خەتاکێت هەژاربونا خوە . دەر هەقا ڤێ چەندێ‌دا پێشیا ئەڤێ پەیڤە کرینە : ● «مالێ نەخوەری رزقێ زالمی‌یە» ● «مام هەمەدان مە چێل‌و گول ل‌دەردان مانە ئەم‌و ئەڤ خەبەردان»[17] ● «یێ نەکەت هزرا پاش‌و پێش دێ بیتە دەروێش» ● «ژمالێ پڕ مابو گیسکێ کڕ»

## شول جوته

دەمێ مروڤ کارا بەرهنگاری هەڤ دکەت . عەیان دبیت



جیاوازی‌یا دنێڤدا ، ژئالێ بەرهەمی‌ڤە . کار هەمە مافایێ وان پێش چاڤ‌و بەردەستترە ژهندە کارێت دی . ژلەوما رێنجبەرا زوی بزوی خوە بسەرو چاڤ‌ڤە تالوقەتی هەمی کارا نەدکر ، بتایبەتی ئەڤ کارێت هات‌و بات . جوت هەر وەکی یا ئاشکرا بناغێ سامانێ ئابوری‌و چاندنێ یە ل‌هەمی گوندا . جوتیار ب چ شولا دابین[18] نابیت ، دێ بەرهەمەکێ باش‌و بەرفرهە کەڤیتە لەپا ژبلی جوتی . ئەڤ دیتنا جوتیارێ مە ، دیتنەکا ئابوریا ملل‌یا راست‌و درستە . ژبەر هندێ هەر شولەکێ مافایەکێ بوش ژکومەل‌را تێدا خوە تاڤێتێ‌و جەفا[19] پێڤە دبر . پێشیا بگوتنێت خوە ، خەلکی های‌ددەن باوەریێ لشولێت هاد ات‌و کێم مافا نەئینن دەمێ دبێژن :

- «سولتەو سویتە مالا رویتە»
- «شول جوتە ، تاجرڤانی ، سەد گوڕ بابێ خودانی»

دیسا لسەر تەقوابونێ دژڤانێت شولی‌دا گوتن هاتیە دبێژیت .

«خوەرنا ئیشەڤ بهێلە سبەهی لێ شخولێ ئیشەڤ مەهێلە سبەهی» .

## هشیاری دکاری‌دا

لسەر خەمخارنێ ، تەقواو هشیاریێ دشولی‌دا پێشیا



گوتیه : «زله‌هـ لکوڕێ خوه دا هێـژ چه‌رم بناڤێدا به‌ر نه‌دای»[21] . دبێژن مروڤه‌کی روژه‌کێ گوته کوڕێ خوه : ڤی چه‌رمی ببه سه‌ر روبیاری بکه دناڤێدا دا نه‌رم ببیت ، به‌لێ هشیاربی هه‌ما ته بناڤیدا به‌ردا من تو په‌قاندی . کوڕی گوت : باشه باب . چه‌رمێ خوه راکر قه‌ستا چونێ کر . بابێ گازی کرێ : کا وه‌ره بێژمه ته . کوڕك چاوا نیزك بو بابێ ده‌ستێ خوه دا پاش چمزڕ !! زله‌هه‌ك تێ وه‌راند . دجهدا دونیا لپێش چاڤێت کوڕکی زڤڕی . زه‌لامه‌ك لدوکانا وی یێ ڕوینشتی‌بو گوتێ : ئه‌ڤه ته‌خێره مال ئاڤا ، هێش نه‌چویه ! ما چه‌رم بناڤێدا به‌ردایه دا وێ زله‌هێ داینێ ؟ !

ئینا لێ ڤه‌گێڕا : هه‌که چه‌رم به‌ردا ئو چو ، ما بوچیه ئێدی ئه‌ز زله‌هێ دانمێ . دێ دانمێ هێش چه‌رم به‌ر نه‌دای . داکو چه‌ند چاڤێت وی ڤێ بکه‌ڤن بیرا وی‌و زله‌هێ بێت لچه‌رمی هشیاربیت .

ژڤێ پێشچاڤی‌کرنا بله‌ز ، گه‌له‌ك هزرو بیر سه‌ری هه‌لدده‌ن بێت کو دبه‌لاڤ دناڤ رێنجبه‌رێت کوردا دا ئو ژڤان هزرو بیرا !

- دخوڕا دیتن‌و خوه هاڤێتن بو کاری لدویف شیانا خوه ، ژبو په‌یدا کرنا پێ‌تڤیاتێت ژیارا خوه یا روژانه .
- خوه دویر ئێخستن ژخوه هێلانێ لهویڤیا خه‌لکی ، کوێر چوبو دمه‌ژیی وی‌دا ، که شولێ ده‌ستێ وی بتنێ ناڤێ وی بلنددکه‌ت ، میرانی‌یا وی دیاردکه‌ت ، که بشانازیی‌و سه‌رفه‌رازی بژیت
- دیسا پێش چاڤ دبیت ڕێبه‌ریه‌کا ساده ، لدویف ساده‌ی‌یا ژیانا رێنجبه‌ریت کوردا ، دژیان‌و به‌رهه‌مێ خوه‌دا . ئه‌وژی ئه‌گه‌ره‌ك بو ژبو مالکه‌ریێ‌و پێش ئێخستنا ژیانا چڤاکی یا کارکه‌رو رێنجبه‌را .

## ژێده‌ر


1 — د . عبدالملك مرتاض العلاقات الاقتصادية بين الطبقات الاجتماعية في الأمثال الجزائرية . کوڤارا « التراث الشعبي » ژماره 1 — 5 ب 12 / سالا 1980
2 — کوڤارا « التراث الشعبي » ژماره 9 ب 26 سالا 1980
3 — مه‌لا مه‌حمودێ دیرشه‌وی - مشتاخا چیا ژگوتنێن پێشیا - ب 73 به‌غدا 1980
4 — هه‌ر ئه‌و ژێده‌ر ب 233
5 — ماندلا : انكار
6 — وه‌رار : نمو - تطور
7 — مشتلخا چیا ب 26
8 — ڤه‌ناڵتێ کوردو کومه‌له تێکستێ فولکلوری کوردی ب 226 به‌غدا 1976
9 — مشتلخا چیا ب 136
10 — هه‌ر ئه‌و ژێده‌ر ب 41
11 — ڤه‌ناڵتی کوردو کومه‌ل تێکستی فولکلوری کوردی ب 252
12 — مشتلخا چیا ب 78
13 — هه‌ر ئه‌و ژێده‌ر ب 127
14 — ڤه‌ناڵتی کوردو کومه‌ل تێکستی فولکلوزی کوردی ب 246
15 — مشتلخا چیا ب 79
16 — هه‌ر ئه‌و ژێده‌ر ب 199
17 — هه‌ر ئه‌و ژێده‌ر ب 266
18 — دابین : إقناع
19 — جه‌ڤا : ڕه‌نجی - زه‌حمه‌ت
20 — ڤه‌ناڵتی کوردو کومه‌ل تێکستی فولکلوری کوردی ب 239
21 — ئه‌ڤ گوتنه وه‌ هنده‌ك گوتنێت دی دڤێ نڤیسینێ‌دا . هاتینه وه‌رگرتن ژبه‌ر هه‌ڤوکه‌کا گوتنێت پێشیا . کومکرینه نڤیسه‌رێ ڤان ڕیزکا .


تێبینی :

ئه‌ڤ نڤیسینه هاتیه خاندن ل کوڕانکه‌هه‌کا ئالخویی . یا ئێکه‌تیا نڤیسه‌ڤانێت کورد - تایێ دهوکێ .

عەلی فەتاح دزەیی
- محامی -

# هونەرەکانی بەلاغەت لە مەمو زینی ئەحمەدی خانیدا [1]

بەلاغەت ، لەلای یۆنانییەکانەوە مانای ئەوە بووە کە (قسە) بە گوێرەی دەقی هۆش و بیری گوێگرەوە بێت ؛ بۆیێکە هەر جێگاو شوێنێك جۆرە قسەیەکی لێ دەوەشێتەوە[2] .

(ئەرستۆ) ی مەزن ، لە کتێبەکانی شیعر (پۆیتیکا) و خیتابە (ریتۆریکا) یدا ، بەتایبەتیش لەمەی دواییاندا ، بەدرێژی لە بابەتەکانی جۆراو جۆری هونەرەکانی بەلاغەتەوە دوواوەو باسی (مەجازو تەشبیهو ئیستیعارەو کینایەو ئیتنابو ئیجازو فەسلو وەسلو موبالەغەو جیناسو سەجەعو تیباقو گێرانەوەی عەجز بۆ سەر سەدری کردووە[3] .

لەسەردەمی (عەباسی) یەکاندا . ئەم دووکتێبانەی ئەرستۆو کەلێکیتر لە زمانی یۆنانیو لەهەندێ زمانەکانی رۆژهەڵاتەوە کرابوون بە عەرەبی .

زانایەکانی ئەم زمانە (واتا زمانی عەرەبی) ، لەم سەرچاوانەوە سوودیان بینیوەو باسەکانی نەزەریو دەستوورەکانی زانیاری بەلاغەتیان لەمانەوە وەرگرتووەو ، سەر لە نوێ پەروەردەیان کردووەو کردوویانە بەزانیارییێکی ئێجگار فراوانو تەواو . لەبەر ئەوەی کە بەلاغەتی عەرەبیش کارێکی زۆری لەزمانو لە ئەدەبیاتی هەموو نەتەوەکانی ئیسلامی کردووە ، پێویستی بە باسکردنێکی کورتەوەهەیە .

مانای (بەلاغەت) لە زمانی عەرەبیشدا ، هەمان واتای بەلاغەتی یۆنانییەکانی هەیە وەك لەپێشەوەدا باسمان کردووە . بەڵام لەزمانی عەرەبیدا زاراوی (بەلاغەت) بۆ ناساندنی (قسە) و(قسەکەر) بەکاردەهێندرێت کەچی ووشەی (فەساحەت) بۆ ناساندنی (ووشە) و (قسە) و (قسەکەر) بەکاردێتو ماناکەی لەمانای بەلاغەت فراوانترە[4] .

بەلاغەتی عەرەبی لە سێ بەشی (مەعانی) و (بەیان) و (بەدیع) ەوە پێکهاتووەو هەر بەشێك لەمانەش بەزانیارییێکی سەربەخۆ دەژمێردرێت .

**١ - زانیاری مەعانی :**

**باسی ئەو دەستوورانە دەکات ، کە بەهۆیانەوە . قسەی عەرەبی چۆن هەم بەگوێرەی مەبەستی قسەکەرو هەم بەگوێرەیحالی گوێکرەوە دەبێت . هەروەها باسی چۆنیەتیی رێکخستنو دەربڕینی مانای ووشان لەرستەیەکدا دەکا[5] .**

زانیاری مەعانی لە زۆر باسو لقانەوە پێکهاتووە . هەندێکیان پێوەندییان بەبنچینەو دەستوورەکانی زمانی عەرەبییەوە هەیەو تایبەتیی ئەم زمانەن ؛ هەندێکشیان باسی گشتینو لە هەموو زمانێکدا وێنەیان هەیە وەك (فەرمانی مەجازیو نەهی کردنی مەجازیو پسیار کردنی مەجازیو خەبەری مەجازیو قەسر کردنو ئیجازو ئیتنابو موساواتو فەسلو وەسل .

## 2 – زانیاری بەیان

ئەم زانیارییەش باسی ئەو هونەرانە دەكا كە قسەكەر ، بۆ دەربڕینی مەبەستەكانی دەبێ بەكاریان بهێنێ بۆ ئەوەی بەسووك و ئاسانی گوێگرەكەی لەمەبەست و واتای قسەكانی خۆی حاڵی بكات . هەر دەستە گوێگرێكیش (بەپێی پلەی خوێندەواری و هەواڵی تایبەتیان) بە هۆی بابەتە هونەرێك حاڵی دەكرێن . هونەرەكانیش ئەمانەن : (تەشبیە ، مەجاز ، ئیستعارە ، كینایە) . هەریەكیش لەمانە چەند لقێكی لێ دەبێتەوە .

(عبدالقاهر الجرجانی) كە لە ساڵی (471 كۆچی) دا مردووە ، بەدانەری دەستوورەكانی هەردوو زانیارییەكانی (مەعانی) و (بەیان) ەوە دەناسرێت . هەتاكو ئێستاكەش ، كتێبەكانی (دلائل الاعجاز) و (اسرار البلاغة) ی ئەم زانایە سەرچاوەی ئەم دوو زانیارییەن . لەدوای ئەمیش ، (جار الله زمخشري) لە تەفسیری (الكشاف) یدا و (یوسف السكاكی) لەكتێبی (مفتاح العلوم) یدا بۆ یەكجاری دەستوورەكانی ئەم هەردوو لقەی بەلاغەتیان دارشتووە[5] .

## 3 – زانیاری بەدیع :

ئەم زانیارییە لەبارەی چۆنیەتیی ڕازاندنەوەو ئاراییش كردنی ووشەو قسانەوەیەو لەگەڵێك جۆرە ووردەكاری پێكهاتووە دەكرێن بەدوو بەش :

**یەكەم** : ووردەكارییەكانی مەعنەوی كە ئەمانەن (تەورییە ، تیباق ، موقابەلە ، موراعاتی نەزیر ، لەففو نەشر ، كۆكردنەوە ، جوداكردنەوە ، كۆكردنەوەو جوداكردنەوە ، دابەشكردن ، كۆكردنەوەو دابەشكردن ، موبالەغە ، ئاوڕدانەوە ، حوسنیتەعلیل ، مەدحكردن لە شێوەی تانە لێداندا ، تانەلێدان لەشێوەی مەدحكردندا ، تەردوعەكس ، خۆ لێنەناسكردن .

**دووەم** : ووردەكارییەكانی لەفزی (المحسنات اللفظية) : كە ئەمانەن (جیناس ، سەجع ، تەسحیف ، تەرسیع ، قافیەی توند ، گێڕانەوەی میسراعی دووەم بۆسەر میسراعی یێكەم ، تەسمیت ، هەڵگێڕانەوە ، جووت‌قافیە ، تەلمیع ، ئیشارەتدان ، سەربەندی جووان دووابەندی جووان .

(عبدالله ابن المعتز العباسی) و (قدامة إبن جعفر الكاتب) و (ابی هلال العسكری) . بەدانەری ئەم زانیارییە دەناسرێن[6] . زمانی فارسیش ، كە لە سەدەی دووەمی كۆچی بەدوواوە ، لە شێوەی تازەیدا ژیایەوەو ، سەر لەنوێ بووەوە بەزمانێكی ئەدەبی ، هەم لەسەرچاوەكانی كۆنی پەهلەوی و هەم لەسەرچاوەكانی زمانی عەرەبییەوە دەستوورو بابەتەكانی زانیاری بەلاغەتی وەرگرتوتەوە . (فەرۆخی و بەهرامی و سەرخەسي ) كە لەسەدەی چووارەمی كۆچیدا ژیاون و هاوچەرخی (فیردەوسی) بوون ، بەدامەزرێنەری بناغەی بەلاغەتی زمانی فارسی دەژمێردرێن .

دووای ئەمان ، (رشید الدين وطواط) كە لە (1182ز) مردووە ، كتێبی (حدائق السحر في دقائق الشعر) ی بەفارسی داناوەو ، (شەمس قەیسی شیرازی ـ 1218 ز ـ مردووە) كتێبی (المعجم في معايير اشعار العجم) ی داناوە ، ئەم دووكتێبانەش ، كۆنترین سەرچاوەی زانیاری بەلاغەتن لەزمانی فارسیدا ، كە بەدەستەوە ماون[7] . (قیوامی گەنجەوی) كە لەسەدەی شەشەمی كۆچیدا ژیاوە قەسیدەیەكی سەدبەیتیی لەژێر ناوی (بدايع الأسحار في صنايع الأشعار) ەوە رێكخستووەو ، تیایدا ، هەموو هونەرەكان و ووردەكارییەكانی زانیاری بەلاغەتی بەكارهێناوە . رۆژهەڵاتناسی بەناوبانگ (ئەدوارد گرانفیل براون) ، لە لێكدانەوەی ئەم هەلبەستەدا هەموو جۆرە ووردەكارییەكانی دیاری كردووەو بەرامبەر بە بەشێكی زۆریانەوەش ، نموونەی شیعری ئینگلیزی و لاتینیی هێناوەتەوە[8] .

ئەگەرچی هیچ سەرچاوەیەك و هیچ باسێكی نەزەریی كۆنی كوردی لەبارەی زانیاری و هونەرەكانی بەلاغەتی زمانی كوردییەوە نیە ، ئەمە مانای ئەوە نادات . كە زمانەكەمان ، لەسەردەمانی كۆنیدا ، لەم هونەرانە بێبەش بووە . بەڵكو هەر

زمـانێك هـەرچەنـدە ساواو دوواكـەوتـووش بێ . دیسـان ، لەبەشێكی زۆری هونەرەكانی بەلاغەتەوە بێبەش نابێ ، با ، بۆ بەكارهێنانی ئەم بابەتە هونەرانە هیچ دەستوورو ڕێبازێكی تۆمار نەكردبێت . بێگومان ، شاعیرە كۆنەكانی كورد ، كە بەشی هـەرە زۆریـان (مـەلا) بـوون ، شـارەزاییـەكی تـەواویـان لەزانیاری‌یەكانی بەلاغەتی عارەبیدا هەبـووەو ، هەنـدێكیان ماموٚستای ئەم زانیاری‌یانەبوون . جگە لەمەش ، لەبەر ئەوەی كە زمانی فارسی پایەیێكی بەرزی ئەدەبی‌ی هەبووە لە هەموو وولاتەكانی ئیسلامی‌ی ڕۆژهەلاتداو ، بەهۆی هەندێ ئاكاری تایبەتی‌ی هەردوو زمانـەكانـەوە ، شاعیـرانی كورد ، وەكـو شاعیرانی نـەتەوەكـانی دیكەی ئیسـلامی ، لەبەكـارهێنانی هونەرەكـانی بەلاغـەتدا ، پێـرەوی‌ی شاعیـرانی فارسی‌یـان كردووەو سوودێكی زۆریان لە شیعری ئەوانەوە وەرگرتووە .

(مەلای جەزیری) ئەوەندە خەریكی ووردەكـاری‌ی بەدیعی‌و وەستـاكاری‌ی ووشـان نەبـووە . لەجیاتی ئـەم لایەنـانـە ، لەمەیدانی هونەری قافیەبازیدا ئەسپی خۆی تاوداوەو شۆرە سـوارێكی بێ‌هاوتـابووە . بـابەتـە شیعری (تـەرجیع‌بـەندو تـەركیب‌بەنـدو موسـەممەت‌و مـووەشەح) دەستنیـژی ئەم شاعیرەگەورەیەن لە شیعری كوردیداو ، هەمیشە وێنەیان بۆ نابێ .

بەپێچەوانـەی ئەمـە ، (ئەحمـەدی‌خانی) ، سـەرتا سـەری شیعـرەكـانی مـەم‌وزینی بـەهـونـەرەكـانی بـەلاغـەت‌و ووردەكاری‌یەكانی بەدیعی‌یەوە ڕازاندۆتەوەو ، دەڵێی هەر بۆ ئەم مەبەستە مەم‌وزینی هۆناندۆتەوە . بەلام ، خوداكردان ، شـاعیرێكی ئـەوەنـدەجیسن‌و هـونـەرمـەنـدێكی ئـەوەنـدە دەسـەلاتـدار بـووە ، مـاوەی نـەداوە كـە ئـەوهـەمـوو بەلاغەت‌كاری‌یە زیان بە ناوەرۆكی داستانەكەی بگەیەنێت . ئەم سەركەوتنی هونەری‌یە بەرزەش كە دەربڕینی جووانترین مانایە لە جووانترین قالب‌و شێوەدا ، لە دووای (خانی) ، هەر لەتووانایی (نالی) دا بووە .

ئیتر كە لێرەوە بەدوواوە ، هەندێ نموونەی ووردەكاری‌یەكانی بەلاغەت لە (مەم‌وزین) دا ، دەستنیشان دەكـەم ، نالێم كـە حـەقی خۆیم داوەتێ‌و هـەمـوو گـەوهـەرێكم لەم كـانـە پـڕ لەساحانەدا دەرهێناوە . بێگومان ئەم ئەركـە گرانـە پێویستی بەلێكولینەوەیەكی گەلێك لەمـە فراوانتـرو قوولتـری هەیـە . هەروەها ، ڕامان‌و زەوقی شەخسی‌ی خۆم ، كارێكی تەواویان هەبووە لە هەلبژاردنی ئەو بەیتە شیعرانەی كە بە نموونـەی هونەرەكانم داناون‌و دەشێت خوینەرانی مەم‌و زینی پێوەرازی نەبن‌و خۆیان نموونەی چاكتری تیادا دەستبژێربكەن :

**بـەشی یـەكـەم : لەووردەكـاری‌یـەكـانی زانـیـاری مەعانی‌یەوە :**

1 — هەوال‌و فەرمان‌و پسیار كردنی مەجازی :

مەبەستی قسەكەریان ڕاگەیاندنی هەوالێكە بەگوێگرەكەیەوە ، یا فەرمانێكی پێدەدات ، یـاخود پسیـارێكی لێ دەكات . بـەم بـابەتـە قسانـە دەگوتـرێ (هـەوال‌و فـەرمـان‌و پسیـار) ی بەراستی . گەرهات‌و بابـەتەكـانی ناوبـراوی (قسە) مـانای ڕاستی‌یـان نەبـەخشی ئەوا (هـەوال‌و فەرمـان‌و پسیاری) ی (مەجازی) ی پێ‌دەلێن‌و بۆ ئەم مەبەستانە دەبن :

**أ - بەخووە نازین : كە هەوالێكی مەجازی‌یە : وەك :**

من دێ عەلەما كەلامی مەوزوون
عالی بكرا ل بانی گەردوون

بیناڤە روحا ملی‌ی جزیری
پی حەی بكرا عەلی حەریری

كەیفەك وەبدا فەقیهی تەیران
حەتتا بـئەبەد بمایە حەیران

**ب : ئامۆژگاری (ئەسیحەت) ، كە فەرمانێكی مەجازی‌یە :**

مالێ مەحوبین توو ئەی نكۆنام
حوببا وی د كەت مروڤ بەد نام

**(جـ) پاڕانەوە (سكالا) : كە فەرمانێكی مەجازی‌یە :**

خانی كو نەهن ب قەلبی ذاكر
باری بدەوی زوبانی شاكر

**(د) سەرسامی : كە پسیاری مەجازی‌یە : وەك :**

میرگۆ د مەكرن خەیالی باطل

ئەو بێهشە ئەز نەبوومە قاتل

ژینێ د کوژم مەگەر ب عەمدا !!
طووبایە د جەننەتی حەرەمدا !!

یا :
گۆتن عەجەب ئەڤ کچێد کینە !؟
یان هەر دوو مەلا ئکێد خودینە !؟

سەروێد چ جۆیە بارەکینە !؟
مورغێد چ مێرغوزارەکینە !؟

**2 – کورت کردنەوە (ئیجاز) .**
ئەوەیە کە مانایێکی زۆر لەچەند ووشەیەکی کەمدا دەرببرێت وەك :

میرن هەنە عاقلن عەزیزن
لێ سادە دلن دبێ تەمێزن

وان ، دلگوهە ، گوڵب دل فەنینە
رەش چاڤن و مەردمەك سپینە

مانای بەیتی دووەم پوختەی هەوالی میرەکانی کوردستانی ئەو سەردەم دەبەخشێت و ئەوەندە قوول و فراوانە هەر ئـەوەتە جێگای لە قالبی ووشەکاندا دەبێتەوە .

یا :
ئەو موژدە وەکی مەگۆتی گۆتن
ئەو سۆتی وەکی نەسۆتی سۆتن
خـانی بۆ ئـەوەی سەربـردەو رووداوەکانی چیـرۆك دووبارە نەکاتەوە بەم جۆرە باس لەکاری ئەوموژدەیە دەکات کە (حەیزە بوون) بۆ (مەم و تاجدین) ی بردووە .

**3 – درێژە پێدان (ئیتناب = اطناب) :**
پێچەوانەی ئیجازەو ئەوەیە کە مانایێکی کەم ، بەهۆی گەلێك ووشـانەوە دەربـبـرێت . شاعیـرەکەمـان لە دەربڕین و روون کردنەوەی بیرو باوەری ئـایینی و فەلسـەفیدا هـەمیشە ئـەم هـونەرەی بـەکارهێنـاوە ، وەك ئەو میسـالەی کـە لەبـارەی (بەکر) ی هێناوەتەوەو دەیەوێ ئەوە بچەسپێنی کە چـاکەو خراپە ئەزەلین و ئەو کەسەی لەئـەزەلدا سروشتی بـەخراپی دروستکراوە ، هەرگیز نابێ بەمروڤێکی چاك سروشت :

خەلقێ کو بەئەسلی بەدسروشتن
ئەو ئەسل ژوان قە تێتە شوشتن !؟

چل سالی تو حەنزەلی بچینی
سەد ئاڤی بدەی ب هەنگفینی

پەروەردە بکی ب ئافتابی
هەردەم بڕەشینی لێ ی گولابی

هەر رۆژ رەهاوی لێ بکەرکەی
وێ فاسیلەیێ تژی شەکەرکەی

خزمەت بکری تو هیندە وانە
ئەو بۆ تە دبێتە هیندووانە !؟[10]

دافکری نەکی دەماکو بەردەت
ئەو غەیری ژ تەحلیێ سەمەردەت[11]
ووردەکاری ی تێ ئاخنین (حەشووکردن) یش بابەتێکی گرینگی درێژە پێدانەو بۆ زۆر مەبەست بەکار دەهێندرێت ، وەك :

**ا ـ بۆ بادانەوە (استدراك) :**
لاوەك کربوو برا ژ بۆ خووە
ئەی ئەز غەلەتم ـ چرا ژ بۆ خووە

**ب ـ بۆ مەدح کردن :**
گۆتی چ کەسی تو ـ ئەی نیکۆنام ـ
بۆچی دگری وەها ب ناکام !؟

عیبارەتەکانی (ئەی ئەز غەلەتم) و (ئەی نیکۆنام) حەشـوێیان پێدەلێن و یەکەمیان بۆ بادانـەوەو دووەمیان بـۆ مەدح کـردن بەکارهاتووە .

**٤ – ترازاندن و لکاندن (فەصل و وەصل)**

لەزمانی کوردیدا قسەووشە بەهۆی ئەمرازی (ئو ، یش ، ژی ، هەم) و گەلێك ئەمرازی دیکە ، بەیەکتری دەلکێندرێن ، ئەمەش باسێکی سەربەدەستووری زمانە . لێرەدا مەبەست لە ترازاندن ئەوەیە کە دێرە شیعر (Line) ێك ، مانایێکی تەواوی هەبێت و بەدێرە شیعرەکەی دوایەوەی نەلکابێت ئەمە بەرامبەر بەدێری شیعری (end — stopped) ی ئینگلیزییە : وەك :

دەهقان تووی ئەم وەکی نهالین
ئەزمان تووی ئەم وەکی دِ لالین

ئاشکرایە کە هەردوو دێرە شیعرەکان ، لەگەل دوواووشەکانیانەوە مانایان تەواو دەبێ .

کەچی ، مەبەستمان لە لکاندن (وەصل) ئەوەیە کە مانای دێرە شیعرێك بەمانای دێرە شیعرەکەی دوایەوە لکابێت ، ئەمەش بەرامبەر بەدێرە شیعری (run — on) ی ئینگلیزیە[11] : وەك :

حاصیل کو ژ پاشی سەر خەیالان –
خاصییەتی بۆیی زولف و خالان

زینێ کو گەهاندە بەرمەشامی
صەبری مری زیندە کر بدامی

گەرهەرچووار دێرە شیعرەکان بەیەك هەناسە نەخوێندرێنەوە ماناکەیان پچر پچر دەبێت . مەبەستی شاعیریش ئەوەیە کە (زین) زولف و پەرچەمی خستە بەرلووتی (مەم) ی بێهۆشکەوتوو ، بە بۆنی داوی زولفەکانییەوە ، نێچیرە مردووەکەی زیندووکردەوە[12] . ئەگەر لەسەردەمانی کۆندا ، تەکنیکی نوختەکاری بەکار نەدەهات ئێستا بەهۆی (نوختە) و (فاریزە) و نیشانەکانی (پسیار) و (سەرسامی) (استفهام وتعجب) ئەم ئەرکە گەلێك ئاسانبووەو دەتوانرێ بە هۆی یەکێك لە نیشانەکانی باسکراوەوە ، دێرە شیعری ماناتەواو ، لە دێرە شیعری دوایەوەی بترازێندرێ ، یاخود هیچ نیشانەیەکی بۆ دانەندرێت بۆ ئەوەی بەیەك پشوو ، لەگەل دێرە شیعرەکەی دوایەوەی بخوێندرێتەوە .

**بەشی دووەم**

ووردەکارییەکانی زانیاریی (بەیان) . راستییەکەی ئەم لقەی بەلاغەت و رەوانی بڕبڕەی پشتی زانیاری بەلاغەت و لە هەموو زمانەکانی جیهاندا بەکاردە هێندرێ و لەم ووردەکارییا نەوە پێکهاتووە :

**١ – وێچوون (تەشبیه) :**

ئەوەیە کە دووشت یان دوو مانا (واتا) ، لەگەل یەکتری بەراووردبکرێن ئەم بەراووردی کردنەش هەمیشە لەنێوانی (شتێکی نادیار) یاخود (واتایێکی توند) و (شتێکی ئاشکرا) یاخود (واتایێکی ئاسان) ەوە دەبێت بۆ ئەوەی خوێنەر و گوێگر بەهۆی شتەکەی ئاشکراو واتایە ئاسانەکەوە ، لەشتەکەی نادیار و واتایە توندەکە بگەن . وێچواندن و بەراووردی کردنیش ، چەند جۆرێکی هەیە :

**١ ـ وێچوونی سادە (بسیط) :**

ئەوەیە کە هەردوو سەرەکەی وێچوون ، بەهۆی یەکێك لەئەمرازەکانی وێچواندن بەراوورد بکرێن کە ئەمانەن : (وەك ، وەکی ، چەشن ، مینا ، رەنگ) سەرەرای ئەمانەش ، شاعیرانی پێشوو ، بۆ ئەم مەبەستە ، ئەمرازی (مانەند ، چون) فارسی و ئەمرازی (مثل و مثال و شوبهەت و عەین) ی یان بەکارهێناوە . وەك :

لەوراکو جیهان وەکی عرووسە
وی حوکمی ددەستی شیری رووسە

کە جیهان بەهۆی ئەمرازی (وەکی) بەبووك چووێنراوە .

یان

سەد تازە جەوان ، ژ رەنگی سەروان
دیباو حەریرو خەز دبەروان

کە جەوانەکان (لاوەکان) بەهۆی ئەمرازی (رەنگ) لەگەل ئەمامی سەروو بەراووردکراون .

یان

ئەو هەردوو نهالی عەرعەرا شەنگ
روونشتی میسالی خونچە دلتەنگ

# چەپکێکی نێرگز بۆ سەر گۆڕم

دوکتۆر وهبیة شوکت محمد

زۆر شت لەکاتی خۆی روو دەدات ، زۆر لێی ناکۆڵینەوە ، لەپاشان دەردەکەوێ کەئەو رووداوە زۆر سەیرەو چۆن لەکاتی خۆیدا لێی نەکۆڵراوەتەوە ؟

لە دەرەوەی وولات دەمخوێند هەموو ساڵێک منو خوێندکارانی کورد ئاهەنگی نەورۆزمان ساز دەکرد .

من هەمیشە چەپکە نێرگزم بۆ پەیدا دەبوو بۆنی نەورۆزی دوورە وولاتم لێ هەڵ دەمژی ، ساڵێ لەشارێک بووم ... ئەو ساڵە ئاهەنگی نەورۆزمان سێ رۆژ دواخستبوو .

هەرچەندە بەتەنێ بووم . بریارمدا لەکاتی خۆیدا نەورۆز بکەم .. نێرگزم لەشارەکە دەست نەکەوت .. بەلام کۆڵم نەدایەوە ئەورۆژە زوو ئیشم تەواو کردو چوومە شارێکی تر کە (دە) کیلۆمەتر دوور بوو لەوێ نێرگزم دەستکەوتوو سەندم .

کەگەرامە ماڵەوە جارێ دوو سعاتی مابوو کە خۆر لەوولاتی خۆشەویستی خۆماندا ئاوا بێو تاریکستانی نەورۆز بەئاگر روون بکرێت .

بەشێنەیی چەپکە نێرگزەکم رێك خستو لە گوڵدانێكدا نەخشاندم ... دانیشتم قاوەیەك بخۆمەوە بۆنو بەرامەی نەورۆزو نێرگز بیری هەژاندم بۆلای بیرەوەری ساڵانی پێشوو .

هەرچەندە گوڵی نێرگزی ئەوروپا گەشو جوانە بەلام بۆنە نەرمو خۆشەکەی نێرگزی چیاکانی خۆمان نابەخشێ .

هەر چۆنێك بێت هەر ئەم نێرگزە بوو کە بیرەوەری یەکەم ساڵی دوور لە وولاتی شیرینم بێنێتەوە یاد کە بۆیەکەم جار ئەم جەژنەم کردو بۆیەکەم جاریشم بوو جوانترین چەپکە نێرگزم بوبێت .

خاوەنی ئەو چەپکە نێرگزە لاوێکی زۆر ڕوو خۆشو ناسكو پر لەهەستی پاكو ژیان پەرست بوو .

(بدر) بێ گومان ناوێکی کوردی نییە .. ! بەلێ (بدر) کورێکی کوێتی بوو ، یەکەم جارم بوو کە ناسیم لە کتێبخانەی زانستگا .

منو چەند کچانێکی هاورێم لە کتێبخانەدا ریزمان گرتبوو کە نۆرەمان بێت بۆ کتێب وەرگرتن .

ریزەکە زۆر دوورو درێژ بوو ئێمەش لەدوای هەموو خوێندکاران بووین ... لەریزی پێشەوە کورێکی ئەسمەر ، نەختێ کورتە بالاو خوێن شیرین لەگەڵ کورێکی ئەفغانی ناسیاوم وەستابوو و هەر لە دوورەوە بەپێکەنینەوە لێم نزیك بووەوەو ووتی :-

(الأخت عربیه طبعاً) منیش چونکە ئەم پرسیارەم لا ناخۆش بوو بەتوندی وەلامم داوەو ووتم :-

(لا .. طبعاً کردیه) بەم وەلامە کورەکە هیچ تێك نەچوو جارێکی تر پێکەنیو ووتی :- (باکورد بێت عەرەب نەبێت من هیچ جیاوازییەك نابینمو بەلامەوە زۆر گرنگ نییە ... فەرموو وەرە پێشەوە بوەستە زوو نۆرەم دێت باتۆ زۆر نەوەستی)

زۆر پەشیمان بووم لەو وەلامە توورەییەی کە دامەوە ... شێوەی قسەو نەرمی یەکەی سەرنجی راکێشام

ـــَـ ن هەردووكمان كتێبمان وەرگرت‌و بـووین بەئـاشنا ، لەو ...ڕدوە من‌و (بدر) بووینە هاورێ : .. هەرچەند ئەوكوێتی بوو ..ـ كـورد ، بەڵام زۆر لاوێكی نـاسك‌و بـەئەدەب بـوو ، زۆر ..ـحوێندكاران لەكۆلیج وایان ئەزانی ئێمە خوشك‌و براین .

لە ساڵی یەكەمدا ئاهەنگی نەورۆزمان زۆر خۆش بوو .. ..ـێـ زۆر لەخوێندكارانی بێگانە بەكچ‌و كوڕەوە بانگ كـرد ، ..ـەڵام ئەوەی راستی‌بێ (بـدر)م لەبـیر نـەبـوو یـان خـۆی ..ـەهـتبوو ...

بۆ بەیـانی نەورۆز من زۆر زوو هـەڵسام‌و (دیمتـرا)ی ..ـوریم هـەڵسـانـد دیمـتـرا كچـێكـی یـۆنـانی بـوو ، ..ـزوورەكەمانبوو ، كچێكی باش‌و هاوڕێی گیانی بەگیانیم بوو .

سەماوەرێكی كارەبایی خنجیـلانەمـان هەبـوو ... ئەو ..ـەیانی‌یـە سەمـاوەرەكەم جـۆشدا ، من‌و (دیمتـرا) نانمـان ..ـەخـوارد لەدەرگادرا ... كـە دەرگام كـردەوە بینیم بـەدرەو ..ـە چەپكە نێرگزێكی گەش‌و جوان لەبەر دەرگا وەستاوە ، كەمنی ..ـی چەپكە گوڵەكەی پێشكەش كردم ..

حەپەسام ... زۆر دڵم پێی كرایەوەو سوپاسی گەرمی بەدرم كرد . ئەوەی راستی بێ هەتا ئێستا چەندەها چەپكـە گوڵ‌و نێرگزم وەرگرتووە لەهاوڕێ‌و ناسیاوان . بەڵام هیچیان وەكو ئەوچەپكە نێرگزە دڵ تەزێن‌و جوان نەبوو ڕەنگـە لەبەر ئەوەكە (بدر) كورد نەبوو .. یان لەبەر ئەوەكە من (بدر) م لەبیر نەبوو لە ئاهەنگی نەورۆز ؟ .. یان هەر لەبەر ئەوە كە یەكەم چەپكە گوڵ بوو لە دەرەوە پێشكەشم كرابوو ؟ ...

وەكو (بدر)و (دیمترای) هاوڕێم كەسەیری منیان كـرد بەچەپكە نێرگزەكەوە زۆر گەشامەوە ... داوایان لێ كردم باسی نەورۆزیان بۆ بكەم ... منیش باسی جەژنی نەورۆزم بۆكردن .. پاشان (دیمترا) هەڵی دایەوەو وتی :

«ـ لە وولاتی ئێمە گوڵی نێرگز پەیوەندی هەیە بە ئەفسانەیەكی ئەغریقی كۆنەوە ..»

من‌و (بدر) یش دیمترامان ناچاركرد باسی ئەفسانەكەمان بۆبكات ... دیمترا ووتی :ـ

«ئـەڵێن گوایـە لە خـوداوەنـدەكـانی ئـەغـریقی كـۆن خوداوەندێك ناوی نێـرگز بـووە .. ئەمـە لاوێكی زۆر شۆخ‌و شـەنگ یـەجگار جـوان بووە .. بـەرێگادا رۆیشتـووە بەلای روبارێكدا تێ‌پـەڕیوە ... روبـارەكە زۆر پـاك‌و خاوێن‌و روون بووە ... ئەمیش دانیشتووە دەم‌و چاوی لەئاوەكەدا بشوا خۆی لەئاوەكەدا دەبینێ لەو كاتەوە نێـرگز خـولیای جـوانی خۆی دەبێ ، نان‌و ئاوی دەبێتە سەیر كردنی خۆی رۆژ لە دوای رۆژ زەردو لاوازو بێ هێز دەبێت .. هەموو خوداوەنـدەكانی ئـەو سای ئەغریقی هەوڵی چاك بوونەوەی بۆدەدەن بەڵام چاریان بۆ ناكرێت .. خوداكان لەپاشان بریاریان دا كە نێرگز بكەنە گوڵێك‌و لەقەراغی روبارەكانا بیڕوێنن ...

بۆیە گوڵی نێرگز وا جوان‌و ناسك‌و بۆن خۆشە ... (بدر) كەمێ مات بوو پاشان بەشێنەیی لەگوڵە نێرگزەكە نزیك بووەو بۆنێكی قوڵی كردو ووتی :ـ

«توخوا ئەگەر هـات‌و من مردم چـەپكێ نێرگـز لەسەر گۆڕەكەم دانێن ...»

دیمترا بەپێكەنین ووتی :

« ـ (بدر) تۆ لە هەموو كەسێ زیاتر ژیانت لا خۆشە ... ژیانت بەرابواردن‌و گەش بینی گرتووە ... ڕەنگە وا زوو نەمریت تاپیر نەبیت لەوانەیە ئێمەش بمرین تۆ هەر بمینیت .

هەرچەندە (بدر) ئەمەی بەپێكەنینەوە ووت .. نازانم بۆ زۆرم پێ ناخۆش بوو ... لەپاش ماوەیەك بێ دەنگی ووتم :

«ـ بدر ئەگەرهات‌و لەپێش من مردیت مەرج بێت ئەم ئاواتەت بەجێ بێنم ... !»

من‌و (بدر) كۆلیجمان تەواو كرد ئەو گەڕایەوە بۆ كوێت من‌چوومەوە وولاتێكی بێگانەی تـر .. لەیەك پچـراین هەواڵی یەكتریمان نەبیست .. پاش دوو ساڵ هاوڕێیەكم نـامەیـەكی بۆنووسیم پێی ڕاگەیاندم بەداخەوە كەوا (بدر مەلەی كردووەو خنكاوە) .

بەڵێ بەدر لەدڵی چەسپی بوو كەزوو ژیان جێ دێڵی‌و ماڵ ئاوایی لەسەر خاك دەكاو جوانیەكەی دەڕزێنی لەژێر خاكدا ...

وا دە نـەورۆزم بـەرێ كـرد ... دە چـەپكـە نێـرگـزم سپیس‌كرد ... هەرچەندە من لەسەر پەیمـانەكـەی خۆمم ... بەڵام بە داخەوە گۆڕی بدر لەكوێ بێنم چەپكە نێـرگزەكـەی لەسەر دانێم ... ڕەنگە رۆژێ لە رۆژان چەرخی چەپ گەرد رێم بخاتە سەر گۆڕی بدرو چەپكە نیرگزەكەی بۆ بەرمەوە .

# کانێ گوندی

هشیار ریکانی

ستوینێ وی یێ خویلەو دەستێت وی ژ پێت وی درێژترن ، یێ هوڤە ڤەدپەشیت وێڤە ڤەدپەشیت ، نزانیت دێ کیڤە چیت ، داڤا زوها ل جلکێت وی نەمایە ، یێ وەکی چویچکێ ڤەدلەرزیت ، تو سەرێ دفنا وی بگڤێشی گیان تێ نامینیت .

پشتی قویناغەکا دویرو درێژ بری ژ پێلێت وی روبیارێ مەزن رزگاربووی‌و سینگێ خو یێ رویس دایە قەرەم‌و دەحلێ رەخێ روبیاری‌و ل بەر وی کاڤلە گوندی رابووری ئاگرەك ژ دویرڤە دیت .

● ئاخ ئەز چ بکەم .. ؟ ئەز باریێ خو دانم .. قەستا ئاگرێ هە بکەم ، نە نە .. ئەز باریێ خو نادانم .. ب چ هێزا هەی دڤێت خو بگەهینمە وی ئاگری نەکو دێ ڤێ شەڤا تاری ژ سەرمادا مرم ، قرچە قرچا ددانێت وی‌یە ، پێت وی بێت جڤا بووین ، لەشێ وی یێ خاڤە ، جاربوجار پێت وی ل کەڤرو تەراشا دەهلنگڤن ، چەند نێزیکی ئاگری دبیت ئاگرێ گەشتر لێ دهێت ، گەلەك بێچارەبوو نەشیا پێنگاڤەکا دی بهاڤێژیت ، دڤیا بکەتە هەوار لێ دەنگێ وی بسەرناکەڤیت ، بکوتەکی خو گەهاندە ناڤ شکەفتەکێ ، روینشتەخوارو یێ ڤەدلەرزیت‌و بزاڤێ دکەت ، دەستێ وی کەڤتە سەر خولی‌یێ هەست بتێهنا گەرماتی‌یێ کر خولی ڤەدا هندەك پەلا چاڤێت خو زلکرن ، ملەك چیلکێت ل وێرێ بوون دەستێ خو گەهاندێ‌و کێشانە سەر پەلاو هەلبوو ، پشتی خو گەرم‌کری‌و جلکێت وی زوهابووین سەرخو چوو بەردەرێ شکەڤتێ .

● خوزی من زانیبا کا چ ل هەڤالێت من هاتی‌یە پاشی بلا مربام .

دەنگەکێ کویرو دویر گەهشتە پەردا گوهێ وی :

■ چیایی .. هو چیایی .. کانێ تو ؟

● ها برا ها .. ئەز ئەڤەمە !! .

دلێ وی گەش بوو پشتی گوهـل دەنگێ ـ گارە ـ ی باریێ خو کـرە پشتا خـو لەزاندو ل پـەی وی دەنگی چوو ، گەهشتە جهێ گـازی لێ هاتی بـەرێ خودایێ ـ گـارە ـ و ـ کوڤان ـ ل رەخ ئاگریڤە دروینشتینەو چاڤێت وان بێت وەکی پەلا سوربووین .

● ها برا .. شەڤا وە باش !! .

■ : (بدەنگەکێ پەژارەو نزم) جانێ تە باش .

● خێرە چ هەلکەفتی‌یە ؟

■ : برا چ ل تە ڤەشێرین چەند مە گوتـە ـ گونـدی ـ خو نەهاڤێژە ئاڤێ تـو نەشێی دەربـازبی بلا ـ رێڤینـگ ـ بچیت سەرێ کەلەکێ بکێشیت ، نەهەرێ نەهاتە سەر چ رێکا ، خو هاڤێتە ئاڤێ چیا وە نەمابوو بگەهیتە کنارێ دی لێ زڤروکەکێ نوقومکر ، سەرێ خو ژ ئاڤێ ئینادەرو گوتی : هەوارە .. وەرنە من !!

تاکو ئەم چووینێ ژبەر چاڤێت مە بەرزەبوو و مە نەدیت .

مە ژی بوان خـەم‌و کوڤـاناڤـە دا رێکێ‌و پشتی بوویـە تەحل‌و لێسەر رابووین‌و باروڤەو بابەلیسکا خو نیشا مە دای ئەم ژ هەڤ بژالەبووین .

تەزینکەك بسـەرێ ـ چیایی ـ دا هـاتەخـوارو موییێت سەرێ وی قژبووین‌و دەڤێ وی ما بەش‌و کرەهەوار :

● هەوارە .. تالانە .. نەمانە .. کانێ ـ گوندی ـ ؟

کانێ رۆناهی‌یا رێکێت تاری‌و ئالوز ؟ .. کانێ ئێکانەیێ مالێ ؟ .. ئەی زڤروك .. ئەی پێلا رەش .. ئەی روبیار .. چەوا وە هونەر سەرژێکر ؟ .. چەوا وە ئاواز داعیران ؟ .. پا کی دێ تەمبویرێ ژ ئاهەنگەڤان‌و شەهیانڤانارا لێدمت ؟ ..

عەبدوڵلا سەراج
جۆزەردانی 1984

# بازنەكان

مانگی جۆزەردان تازە بە نیوە ببوو کە جووتە منارەکەی مزگەوتی گەورە بوونە ئامێژەنی لێکدانەوەکەت . کۆنەکەیانت بە لوولەیەکی کورتەبنە زانی ، نوێیەکەش وەکو چوار پاڵوویەکی چەتەول .

[میعمارباشییەکە ، بناغە بازنەییەکەی بە چوار گۆشەیی ئاڵشت کردووە ! ئای چەند گەرمە .. گڕڕە ، ئائەمەیە . دەبێ چوارگۆشە لە بەراوردکاریی ڕۆژگارو ستاتیکدا ، خۆ ڕاگرترو جـوانتـربێ لە بـازنـە ! ؟ دەبێ تـرومبێلم دەسبکـەوێ بـۆ کـەرکووك .. ڕوو لە خـۆر دانانیشم . جـاران ، ئەوی گـڕڕە بیبردایە ، سەرتاپایان بە ماستو تۆراخ دەسوی . .. دیـارە دەلاقەی بایەکەمان لێگیراوە ! دەنا ..]

پاسە شلۆقەکە هاتو چەندانێك خۆیان تێئاخنی . دوو هەرزەکار لە سیلەتەوە دانیشتن . یەکەمیان بـەو گەرمـایە ، چاکەتو پانتۆڵو یەلەکی قەدیفەی ڕەشی لە بەر دا بوو لە گەڵ قەراوێتێکی گوڵهەناری ! هاورێکەی ، ستارخانییەکی میلپانی دامە دامەی کردبووە بەر کە تۆ ، تەختـەی شانیت بـە چوار گۆشەی سێریزکانت چوواند . ئەمیان ، لووتە سوورەکەی بە ڕەگە چەوەندەری دەکرد .

پـاسە زەیستـانەکـە ، بە نـاڵەو نرکـەوە ، دەروازەی مزگەوتەکەی تێپەڕاند . ئەو دەمە وەك ئەوەی زەنگی کارگەی کوێران لێبدرێت ، دەیان گۆچان بە دەست وروژمیان هێنـایە دەر . دەنگیان پێش خۆیان کەوتبوو . تۆ بە ریزێ فیلت هاتنە پێش چاو کە لە سێرکا ، هەریەکەیان کلکی ئەوەی نوای گرتبێ ! لە گەڵ خۆتا دوواپت (بازنە هەمیشە پیرۆز بـووە ، چونکـە هێمای دروشمی ئەمریو خولانەوەو گۆڕانە)

بلیتبڕە شرپۆشەکە ، سەرو بلیتی داینێو پشکنەرەکە بە دواوەی ، پەرۆش بوو بۆ قرتاندنی کونچکەی بلیتـەکان . تـۆ سەوزە خەندەیەکت بۆ ئەو پشکنەرە هەڵوەراند .

- بـڕوام پێبکـە دە سـاڵیش دەبێ کـە چـاوم بـە پشکنـەر نـەکەوتـووە .. کەچی ئێـوە بـە جـووتـە .. دە .. پشکنـەرە دەمەوەرەکە ، گورج ڕێسەکەتی قاچی :
- دیارە خەڵکی ئەم شارە نیت !
- لە ئارابخا جێنشینم .
- ئارابخا ! ؟
- دیارە تۆش لە جوگرافیاو ماتماتیکو پەیکەر تاشیو ڕێزمانو مێژوو دا کۆڵەواریت !
- ... !!
- ئـارابخا ، پـارێزگـایـەکی گـەرمـەسێـری دێـرینـە کـە نەبوخوزنوسەر ...

پاسە شڕە وەستا . ئافرەتێك ، بە کۆشێ منداڵی وردیلەوە ، لای (قـوڕیە شکـاوە) کـەی جـاران دابـەزین . پشکنـەرەکـەش دابەزی . شوفێرەکە ، منجە منجێکی لێوە هات لەوەی کە بۆ سێ نەفەر دەچێتە نەقلیات . تۆ بۆ چاو قوچانێك ڕامایتو دەستت کردە ئەستونگەی چەناگەت . زەلامی ناو ستارخانییەکە دەمی لە زەلامی ناو قەدیفە ڕەشەکە نا :

- ئەمەی من ئەبلەقی بەرزنجەیە . ئەوەکەی تـۆش حەمـە سوورییە .
- بە پێچەوانەوە . ئەوەکەی تۆ ئەبلەقی دەستکردە . ئەوەتا جێ نوخانی کلکە سماقییەکانی پێوەیە . حەمە سوورییەکـان ئەم جووتە ئیمامەی بۆ ناکەن .
- بەم سەرە فڕی لێنازانیت .
- ئەی چۆن ! جەنابت وەستای تەزبیحو زۆر شتی ..

لە عاست تەپۆلکەیەکدا ، پاسە کە جیڕاندیو مەشکە ژەنەی کردن . بە هەڵەداوان خلۆر بوونەوە . شالاوی هەتاو پێستی ڕووی دەبرژاندو کسپەی لە هەناوەوە دەهێنا . تۆ ڕووت کردە پەنا سێبەری کۆستەرەکەو لەوێ خۆت مەلاس دا . دوو کچی ناسکۆڵ بۆ کن ترومبێلە نورەدارەکە دەخزان . باریکەلەکەیان دەتوت ناسکە ڕێواسە لە ناو دەستە چلە کوردییەکەیدا ، مەگەر خۆی بزانێ چۆن ڕەگەکانی گونجاند بوو . ئەوی تر بە هەرمێ دەچوو . کراسە مۆدێرنە شینکارە کەی ، لەشێکی خڕپنی بە خـۆڕایی دەفرۆشتـە بازنـەی چاوان . بـە جووتـە جـوانیو نارەقەیان لێدەتکا ، بە تایبەت بەژن ڕێواسەکە : چاوو برژانگی چێژبەخشی هەبوو . دەمت تامی کەزۆی خاوی تێزا .

[نەمگوت بازنە مەزن و پیرۆزە . ئەو چاوانە بە بـازنەی شینی ژێر پیالەی چینی دەکەن . دە سێرکە پەروەردگار چۆن جەستەی بنیادەمی بە بازنەو کەوانە ڕازانـدوّتەوە ! بـازنەی هەمەجۆر ـ چاڵ و قوّقزو هێلکەیی و گوێپاو بادەمی و .. و ..دە چوارگۆشەیەکم لە بەدەنی مرۆدا بۆ بدیننـەوە ، دەی .. هەر بازنەیەکیان شێوەو ئەرکی خۆی هەیە ! هەر بازنەیەکیان لەوی دیکە ناکات ! هەر بازنەیەکیان ڕەنگ و بۆو تامی خۆی هەیە ! ئەمەیە ئەفرین و داهێنان .]

ـ برایان ، سەرکەون ، بـا نەکـەوینە درەنـگ و .. قەدیفـە ڕەشەکەو ستارخانییە سێریزکانەکە فسکەیان دەهات . تاو نا تاویش ، دزە ئاوڕیان لەو دوو لەیستوّکەی لای چەپتەوە دەدا . تۆیش کۆمەڵە چیرۆکەکەی دەستت کردەوە . کە کەوتیتە وێزەی چیرۆکێك بە ناوی «ڕیشۆڵە» .

لێژییەکەی تاسلوجە وای لێکردی کە قوّچەقانیی نیگات بە شەیداییەوە ، بە لای چەپدا هەڵدەیت . خانووچکە وێکچـووە ڕەق و تەقەکانت بە ریزە پاکەتی قاچاخ هاتە پێش چاو کە ڕانك لەبەرێکی سوورفلی پێخاوس بـە دیارییـەوە هەڵکـورما بێت . (ئاخ .. لەو جێگایەی ئاو هەیە عەرد نییە . کە عەرد هەبوو ئاو نابێ . کەی ئاوو زەوی لە ژوانگەی دڵارا دا زاوا دەبن ؟)

چـاوت لە دێراوی لاپـەڕەکەوە ، تـەشەنـەی دەکرد . سەرت لە گەڵ لەنجەی کۆستەرەکەدا ، دەلەنجا . ئیتر بێئاگا بووی لە دوو ڕیشۆڵەکەی پێشت و جووتە کەنـارییەکـەی باڵی چەپت . لە ناختا ورووکایتە خوردکردنەوەیەك .

[باشە . کەسی ناو چیرۆکەکە ، بابایەکی لە خوا ترسـە چلۆن ڕیشۆڵە قڕکردنی کردە پیشەی خۆی ؟ ! خۆ لە بەرەی جـووتیارەو .. ئـاتاج و دامـاویشە ! هـەمینی هـەڵگرتـووەو سەرانسەر ژیانی ، لە ترسی کەسوکاری ژنەکەی ! بە دڵەڕاوکێ بردوّتە سەر ! واتە ترسی چوونی ناو توّڕی هەیەو لە بازنەیەکی تەسکدا ! دەجـووڵێتەوە ! دووریش نییـە ، هەمـان بازنـە لە بناقاقای گیر بێ . دونیایەکی سەیرە ! خەڵکی پیلان و کـوّت و تەڵەی بۆ دەنێنەوە لەمەڕ شوڕەیی و ئابرووی ڕەدووکەوتەیان ، کـەچی ئەویش تـوّڵەی خۆی دەهـاوێتـە سـەر پـەلەوەرانی سروشتی میهرەبان !! سەیـرێکەو نـەبێتەوە .. کـەسی تریش هەیە ، پەڵەی خۆماڵیتی و حێلو مێخەك و پانی بەرزو پەستەك و کـلاشی و پەڕۆیـن و هەرسینی لێـدەداو .. لێـرەو لەوێ ، بـە کـەتیرەو مـاستیـك خـوّی دەلکێنێ بـە چینی پـەڕوّو قـوڕە سوورەوە ! وەلێ ، ڕەشەبـا هوّشمـەندەکـەی دوّلی گوێـژە ، دەمـامکی ڕووی لوول دەداو ئـالّدووزەکـەی دەبـزرکـێ . ئـەوسـاش ، دژوارییـەکی نـاقـوّلا ، دزێـو لوّدەکـای درۆو فیشاڵەکانی شەنوکەو دەکات . هیچ ڕەوەسەش لە گوڕێ نییە ! لای ئەو زەلامە دژوێنفرۆشە ، ڕاستوچەپی قەترانی ، چەموّڵە لە «پیشانگا» دەنێ و بە مەرەکەبی ئاڵ دەنووسێ : گەلەری .. گەلەری . پارەن واریسە گێلبەری . پـارەن یوّخیسـە ، هەی نابووت هەروو لۆ دەری .. ئەو دەمە ، ئەو کاتە ، ئەو ئانـە ، زەماوەند ڕەنگی موقەدەس لە جێ خەرمانی تابلۆکاندا ، دەبێتە شین و پرسە . زەرد ئەشك دەڕێژێ سوور فرمێسـك دەڕێژێ شـین ئەسـرین دەڕێژێ . بگـرە بێچووە ڕەنگـەکانیش هـەتا هەتایە ، ئاو لە چاویان نابڕێ . وەنەوشە گەڵا پرتەقاڵ کوژەکە خەنە زەیتوون پەرەنگ ، گشت دەکەونە گریەو زارو بۆ وێرانە خاك ، باڵایان لە خم هەڵدەکێشن]

دەنگێکی گڕ ڕاتیچەنـاند . تـابلۆیەکی دڵگـیر لە مینای ترومبێلەکەوە ، چووە ناو هەر دوو بازنەی چاوتەوە . نا .. چووە بازنەی چەپتەوە چونکە چاوی ڕاستت بووە خوّراکی نەهەنگی کتێبخانەکان . بەو جوّرە ، تابلۆکان بە گوێری گۆشە نیگات ، نوێ دەبنەوە دەزایین . هەر تابلۆیەك شوێنی ئەوەی پێشـوو دەگرێتەوە ، لە جوانترەوە بۆ هەرە جوانتر . لووت و هەناسەو دەروونت پڕ دەبن لە بۆنی سمڵ و جاترە . دەنگ گرەکە وتی :

ـ ئەو بەردە فیلەتەنەت بینیوە . کە پێکایان ، بە سکە خشکێ خۆی گەیاندە ساباتی ئەو بەردە بە سۆزەو ڕاکشاو . کاتێکی زانی وەکو بازنەیەکی ژەنگن و شکاو گەمـارۆیان داو بـە دیل بردیان .

پەپوولە سولەیمانێك ، لە ژێر بنجە گێوژێکـەوە فرتـەی کردو شا باڵەکانی لە سەر بەردەقارەمان شی کردوەوە . توّ ئەو حەلە ، بەردەکەت لە ناو سیم و تەلدڕەکەدا ، بە پلنگێکی بیمار دانا .

ـ لە شوێنانی تر بوایە ، چیمەن و گوڵزاریان بۆدەکردە چێوە . لای ئێمە وا بێنازو ئیفتادە کەوتووە .

ڕەوە قەتێیەکیش لە شێوەی ژمارە حەوت ، ڕوو لە گەرمیان بەرز دەفڕین . دەنگت وەکو بەردە هەسان قورس بوو کە گوتتەوە :

ـ هەر ئەوەندەو بەس ! (توّ جوّشا بوویت . لە ناو عیشقی پڕ

سوێدا تووابووبوویته‌وه ، بۆیه به تاسه‌وه هاو ده‌نگیان بووی) ..
هه‌ر ئه‌وه‌نده‌وبه‌س .. ئه‌وه‌ی تازه ڕسکاو ئاشنایه‌تیی ئه‌وتۆیان
به باره‌ی ئه‌م ده‌ربه‌نده‌وه نییه . ده له‌و کوڕو کالانه بپرسن .
ئه‌وسا ، قسه‌که‌م ده‌سه‌لمێنن .

هێمینیه‌کی ئه‌فسووناوی کۆسته‌ره‌که‌ی له ئامێز گرت .

- سینگی فراوانی ئه‌م ده‌ربه‌نده (تۆ گوتته‌وه) .. شوێنه‌واری قه‌لای - بابێت - بووکه بازیان‌و لازیانی لێك جودا ده‌کردنه‌وه .

له یه‌قینی خۆتدا ئه‌وه‌ت چاك ده‌زانی که مێژوو ، چه‌ندین بازنه‌ی جیلوه‌داری پێکه‌وه به‌ستراون . بچڕانی هه‌ر یه‌که‌یان ، ده‌بێته که‌له‌به‌رو که‌لێنی پێشوازیکه‌ری گه‌رده‌لوول‌و لێشاوو هه‌ر تۆفانێك .

له پشته‌وه ، ده‌نگێك هات وه‌کو له که‌وێله‌وه بێت وابووه .

- من خه‌لکی ئه‌م ته‌کیه‌یه‌م . چاوم کوێر بێ ، هه‌تا ئێستا سێ جاران ...

قه‌دیفه ڕه‌شه‌که جگه‌ره‌یه‌کی سوپه‌ری له لالێوی چه‌قاند . ئاورێکی له تۆ دایه‌وه . داوای ئاگری کرد . چاوێکی سیمۆرانه‌شی له جووته که‌ناریه‌که گرت . ئه‌تۆش ، داواکارییه‌که‌ی ئه‌وت ؛ گه‌یانده دواوه . ده‌ستێك ، شقارته‌یه‌کی ڕه‌وانه کرد . که گه‌یشته ناو له‌پت ؛ گوتت :

ئه‌وی ریشی به‌ردایه‌وه ، ده‌بێ شانه بخاته گیرفانی .

نه‌تزانی له مه‌به‌ستت حالی بوو یان نا . وه‌لامی ئه‌و ، ته‌نیا ئه‌وه بوو که دوکه‌لێکی چڕی له مینای پێشه‌وه ؛ گرت‌و هاوڕێکه‌ی کۆکاند . ڕوخساری تۆش گرژ بوو . ئه‌وجا به خوتت گوت : (چاکه ئاگرناك‌و تووڕه‌و تروێ نییه کلپه بسێنێ ، ده‌نا پلاره‌که‌م به جۆرێکی تر ده‌که‌وته‌وه .)

ده‌مه‌کان کلۆم درا بوون . ورته‌یه‌ك چییه نه‌هات . (شیوه‌سوور) یش ئه‌و ئانوساته ، کسپ‌و مات بوو .

[شیوه سوور تۆش ڕه‌فتاری خۆت گۆڕیوه ! پێشووتر وا نه‌بان‌و ته‌ریك نه‌بووی لێمان ! دیاره ئێمه مانان بێنه‌مه‌کین له عاستت ، چاوی سوزو نه‌وازش له ته‌له‌زم‌و تاشه به‌رده‌کانت نابڕین . ئه‌میش هه‌ورازه‌که‌ی بانمه‌قانه . وا دیاره تۆش زیزو زوویری‌و دلت لێمان ڕه‌نجاوه . مافتان به لاوه‌یه . ئێوه نه‌گۆڕاون . ناڕه‌واییه‌که .. له ئێمه‌وه‌یه ..]

هه‌تا بانمه‌قانیش ده‌مێك نه‌کرایه‌وه . له «قه‌ره هه‌نجیر» هۆشت بووه سیمرغ‌و هه‌لیدایه ناو باخه هه‌نجیره‌کانی کاریزه‌و دووشیوان‌و ئۆمه‌ره‌مه‌ندان‌و ... هه‌نجیرت ده‌وێ ، له‌وێ بیخۆ . له ناو ده‌متا ده‌بێته ئاو . تام ده‌مت خۆش بوو . سیمرخه‌که‌ی هۆشت نیشته‌وه . رووت کرده شوفێره‌که‌و په‌رده‌ی بێده‌نگیت هه‌لتلیشاند .

- ڕه‌شه هه‌نجیر له (به‌هار)دا ، پێناگات ئه‌و کاسه‌ی سه‌ری هه‌ژاند . که‌نارییه‌که‌ی ته‌کت بۆ یه‌که‌م جار جریواندی :

- کوا ؟ هیچ دار هه‌نجیرێك نابینم ! تۆ به ده‌نگی که‌له‌باب گوتت :

- ئه‌و بنجانه‌ی که ماونه‌ته‌وه ، له ناو دار بییه‌کاندا خۆیان شاردوته‌وه ..

- خۆیان شاردووه‌ته‌وه ! ؟

هه‌ردوو برۆی هاتنه‌وه یه‌ك‌و تۆ ده‌نگت گۆڕی به ده‌نگی هه‌لۆ :

- ئا .. چونکه هه‌رچی‌و په‌رچی‌و چرووکی داخ له دل ، باقۆکان ده‌ڕننه‌وه .. هه‌ژگ‌و لقه‌کان ده‌بڕنه‌وه .

کۆسته‌ره‌که له‌کن (کوێره‌که) شۆڕ بووه‌وه‌وه . ره‌شماری جاده‌که پێچی خوارده‌وه . دیسانه‌وه نشێوێکی بڕی‌و یه‌کسه‌ر لایه‌کی شاره‌که‌ت لێوه ده‌رکه‌وت . گه‌شایه‌وه . خاکبازیت هه‌لایسا وه‌کو ئه‌و ئاگره‌ی که له دووره‌وه ، مه‌شخه‌ل ئاسایی ، به‌شێکی بازنه‌یی له ئاسمانی شاره‌که‌تی ؛ ئارگۆن کرد بوو .

[مندال بووین ده‌هاتینه ئێره بۆ دۆزینه‌وه‌ی حه‌به‌لوول . حه‌به‌لووله‌کانمان ده‌هاویشته بان خۆله نه‌رمه‌و به چاو تروکانێك له ژێر خۆله‌که‌دا ده‌گیرسانه‌وه . ئێستاکه ڕکم له‌و که‌سانه‌یه که وه‌ك حه‌به‌لوول وان ، یان له هه‌لوێستدا حه‌به‌لوولی ده‌نوێنن .]

- کاکی شوفێر . بۆ له ڕۆخی ئه‌م شه‌قامه‌دا هه‌لمان ناڕێژی . ؟

- چاکه . وا ده‌که‌م .

گشت به په‌له دابه‌زین . تۆش له گه‌ل ئه‌واندا ، خێرا تێکه‌لاوی جاده‌که بوویت . خۆت ته‌کاند . ده‌ستت به کاکۆلتا هێنا . ئاوڕت دایه‌وه . ڕاسته‌و ڕاست ، مناره‌که‌ی به‌ر ته‌کیه‌ت دی که وه‌کو دره‌وشه له سپلی ئاسمان چه‌قیبوو

**له‌یستۆك : بووکه شووشه .**

**حه‌به‌لوول : زینده‌وه‌رێکی بچکه‌یه که هه‌میشه له ژێر خۆلدا ده‌ژی . که لوولی خوارد ، چالاییه‌ك پاش خۆی جێده‌ێلێ‌و منداڵان به‌وه ده‌یدۆزنه‌وه‌و گه‌مه‌ی پێده‌که‌ن .**

# چیرۆکی لەنگە

زایەر عبداللە

1983 / 11 / 17

هەولێر

دواجار هەرکە دایکت زۆر کروزایـەوەو بە تکـاوە پێی ووتی « رۆڵە باپیری خۆتە ، بە خراپەی ئەو مەکە ... بچۆ سەرێکیشی لێدە ؛ داوای شۆربای برنجی کردوە بۆی بەرە» .. دڵت نەرم بوو ... سەری رەزامەندیت بۆ هەژانـد .. دایکیشت یەك پێ رابوو تا شۆربا برنج ئامادە بکات .

لەوەتەی وەبیرت دێو دەفامی ؛ بەچاوی خۆت نەتدیوە ئـەو بنیـادەمـەی پێی دەڵێی بـاپیـرە ، بـزەییکی بێتی ... ددانەکانی وە دەرخا .. تەنیا زەردخەنەییك نەوەك پێکەنین .. سەرەرای ئەمەش لەخت و خۆڕایی تف و تێهەڵدان و ئەتك وجنێو فرۆشتن ... ، هەر بەلاییکە بۆ خۆی ؛ جنێوو قسە نـاخۆش و تێهەڵدانەکەییت بیرکەوتەوە ... پەشیمانی دایگرتی بچی ؟ یان نەچی ؟ ئاخر ئەوە گفتت بە دایکیشت دا کە سەردانی بکەیت ، رقت هەڵسا ، ئێ توخوا ئەمە داوایە کردویەتی ،؟ ئەم شۆربا بـرنجە سنـدان کـوشتی یـە چ بـوو داوای دەکـات .. دەك بـەرەشاوی بێت ، هـەرکـە زرفنجی کـرد یـەکسـەر گیـانی دەرچێت ... نانا خوا نەکا .. مرۆڤ کە پیربوو پێویستە رێزی بگیرێت ، دەستی یارمەتی و بەزەیی بۆ درێژ بکرێت ... راستە لەگەل گشتمان هەر خراپە .. شەراوی یە بە گلەیی یە ... لەزۆر گلەیی کردنی ، ناومان ناوە « سەلیم بەگلەیی » هەر کەسێك جـارێکی دیتبێ وزاری لەزاری دا گـەرابێت زوو شـارەزای دەمارگیری یەکەی دەبێت .. بریا وەها زوو بەم چـوونە رازی نـەبایت .. خـۆزگە بـە دایکت ووتبا « کـەی ئەم » سـەلیم بەگلەیی یە » باپیری منە ؛ من تا ئێستا هەستم بەهیچ سۆزو نزیکێکی ئەم نەکردوە » ، لەپڕ هەڵسایتە سەرپێ ، چی تێدایە هەر ئێستا دەچیتە لای دایکت و پێی دەڵێی « دایە گیـان چ خۆت ماندومەکە نەدەچمە لای نەخواردنیشی بۆدەبەم » .. لەم کەین و بەینەدا بوویت نەتدەزانی چی بکەی ، بچی یانەچی ؟ دیسان دەمارە سندان کوشتی یەکەت دڵی خاو کردیتەوە .. لە شوێن خۆت حەپەسایت ، کەوتیتە خەیـاڵێکی قووڵ ؛ چـاوت لەمۆلەق راوەستا .

خوشکە دەساڵی یەکەت لەبەر هـەیوان بـوو هەرکـە تۆ بڕیاری چـوونە لای بـاپیرەت دا ...، بـە زەردەخەنـەوە هاتـە بەردەمت و بەتکاوە گووتی « کاکە گەر دەچیتە لای باپیرە منیش بەرە » .. دەفەرموو ! مرۆڤ وا دڵ نەرم و بەسۆزە نەخوازەلا منداڵ ... خوشکەکەت دەڵێی لەیـادی چووە چـەندان جـار دراوەتە بەر « سۆلە » رەشە قالب بەتاڵەکە تەنیا لەبەر ئەوەی سەرێکی لەدەرگای حەوشە هەڵکێشاوە ! یـان قۆڵ و بـاسکی رووتە وکراسێکی نیو قۆڵی لەبەرە ... منداڵی واچی یـە ؟ گەر

قۆلی رووت کات یا بچێتە بەر دەرگا ... تۆش هیچ وەلامت نەدایەوە تەنیا بەتیل چاو سەیرێکت کردو بۆی گرژی‌یەوە وەك بی‌ی بلێی « هەی نەفام ... بەستە زمان ، ئێستاش داغی پشتی دەستت هەر ماوەو بۆتە نیشان و لێت نابێتەوە چۆنە وا زوو بیرت چۆتەوە ؟ » ئەمیش تێکەیی و گەراوە بەرەبەیوان .. نە ئەم دەنگ و نەتۆش دەنگ .

تا پۆلی پێنجەمی سەرەتاییش وەك زۆربەی منالەکانی گەرەك پاش قوتابخانە خەریکی یاری کردن بوویت ... جیهانی منالی یەکجار بێ دەخلە .. پڕە لە ساکاری و دل پاکی .. گریان وپێکەنین و حەزو بزێوی و تورەیی و ئیرەیی بردن وجار جارەش خەم ! منال سەیرە ، هەندێ جار مرو مۆچ و تورەو تۆش و گرینۆك و دل ناسك دەبێت بێ ئەوەی بزانێت بۆ ؟ هەر بەم شێوەیەش دەداتە تریقەی پێکەنین وبزە ، باوەش لەکەس وکارە نزیکەکانی وەردێنێ و مرچ مرچ ئەم لاو ئەو لایان ماچ دەکات ؛ سەرتا پای یاری‌یەکان هەر لەخۆت دەهات ؛ پەلیکانێ و کەلایانێ و کۆلارە فرانـدو تۆپی پێ و جارجارەش لگاوو شێروخەتیش .. یەکجار زۆر حەزت لەیاری تۆپی پێ بوو ، کە لە قوتابخانە دەگەڕایتەوە پەرتوکە کانت تور فرێ دەداو « لای حەساری » خۆت بگرە هاتم .. لەگۆلچیاتی مەعلان بووی .. هەرکە دەگەیشتیتە گۆرەپانی یاری گۆلیان بۆ چۆل دەکردی ، دەبوویتە گولچی .. زۆرت کەیف بەخۆت دەهات .. بەحیسابی خۆت هیچت لە « یاشین » کەمتر نەبوو ... دار با بەرد با تۆپیان بۆ هەلدابای خۆت فرێ دەداو دەتگرتەوە ! هەرگیز بە هەوەنتە تۆپت لێ نەدەرۆیشت ئێستا پاش ئەمەندە سالە کە جارجارە لە « دەوام » دەگەڕێیتەوە لەبێ تاقەتی دەبیتە میوانی « تەلەفزیون » گەلێك جار یاری تۆپی پێ‌پێشان دەدات ، زۆر مەیلی پێ‌نادەیت ، واق وورماو لەدیار گولچی ئەم سەرو ئەوسەر دادەنیشیت ، مندالی و گۆلچیاتی خۆت بیرچۆتەوە کەچۆن خۆت لە خرتۆرێ وەردەدا ! ... سەیرت پێ‌دێ چۆن بیست و دوو کەس بە دوای تۆپێکی لاستیق دەکەون .. چما لەبیرت کرد تاقە گولچی گەرەکی خۆتان هەر تۆ بوویت ، کامە یاری وقۆشمە تۆ بەشدار بوویتایە حەتمەن سەرکەوتن بۆ ئێوە دەبوو ، بەتایبەتی گەر بەر لەچوونە یاری پارچە سەمونێك‌یان دوو سێ‌کێکی بە « عەینەگت » خواردبا ، هەر دەبوویتە پەلیك ..

زستان و هاوینت بۆ نەبوو .. قوڕ چ دەلێ تۆزو خۆل چ دەلێ .. ئەرز هەر ئەرزە ...

رۆژانی باران و قوروچلپاو سەرتاپای جل و بەرگت بگرە دەم و چاویشت جێ‌جێ بە قوڕ سواق دەدرا ... شەلوارەکەشت جگە لەقورێکی ئەستوری سەرچۆکەکانت و بەرسکت ، لای دواوەی بەهۆی قۆندەرە لاستیقە فش و فۆرەکە دیمەنی سوار پاسکیلێکی دەنواند کە پاسکیلەکەی چاملغی لێ کرابێتەوە ... هەموو رۆژێ ئەمە حالت بوو ... ئێوارانیش پاش کۆتایی هاتنی یاری دەگەڕایتەوە مال ... بە نهێنی و بێ دەنگ دەرگای حەوشەت دەکردەوە بە ژوور دەکەوتی .. تاوەکو باپیرەت نەتبینێ زوو خۆت لەژووری بنەبان دەکوتا ... بە پەلە پەل شەلوارەکەت لەبەر دەکردەوەو بە هەلگێراوەیی هەلتدەواسی ، ئێوارەییکیان هەرکە بەم بەزم و رەزمە گەرایتەوە « بۆسەت » بۆ نرابۆوە ، لەناکاو بە سەریاکەوتیت ، پاش تێهەلدانێکی موستەهەق هەرەشەی لێکردیت . لە بەیانی‌یەوە کەلەقوتابخانە گەرایتەوە دەبێ بچیتە لای ئەم بۆ دوکان ... دوکان خۆ دوکان نەبوو کاول بێت لەناو پیرە قەیسەری لەنگە فرۆشی دەکرد .

بنیادەم لە هەرەتی لاوی و کامل بووندا گەر تورەو تووش و شەر فرۆش بێ ، ئاخۆ لەپیریدا چۆن دەبێت ؟ سەرەرای ئەمەش هەتا بلێی پیرێکی خۆپەرست و پارە پەرست و دلرەقە ؛ بۆ پەنجا فلس دلی ئازیزترین کەس لەخۆی دەشکێنێ ... کاتی خۆشی پۆلیس بووە ... لەگەل سەرەتای قەید کردنی پۆلیس لەم وولاتە ناوی « سەلیم ئەحمەد قادر » ی « سەلیم بەگەیی » لەمەر خۆمان لەیەکەم لیستەی ناوەکانی پۆلیس لەم شارە تۆمار کراوە .. جا هەر لەوکاتەوە لەژیانی پۆلیسیدا زۆری شەر دیوە .. هەر لەشۆرشی بیستەوە تا دەگاتە شورشی شێخ مەحمودی نەمرو چەندانی تریش .. هەموو تەمەنی پولیسی بە نەقل بوون لەم شار بۆ ئەو شار بردۆتە سەر ... لێرەوە بۆ ئەوێ .. لەم ناحیە لەگەل فلانە قۆمیسەر بە دەمەقار دەهات دەیان ناردە شوێنێکی تر ... لەم شوێنەش فلانە نەفەر لەناکاو لە خەوی بەیانی بە ئاگای هێناوە ئەمیش لەرقان چینێکی باشی تێهەلداوە . بۆیە ئەم تورەو توشی یەو شەر فرۆشی‌یەی بۆتە هۆی ئەوەی سی سالی رەبەقی پۆلیسی تەنیا دووخەت لەقۆلی چەپیدا نەبینێت ، بگرە چەنداجار کار دەگەیشتە رادەییك کە فنیش بکرێت ... کەچی پۆلیسەکانی رەفیقی هەموو سێ خەت و

چوارخەت بە قۆڵیانەوە بەسترا ، ئەمیش بەخێری بە « شرطی ئەوەل » خانەنشین کرا ... بۆیە باری ژیانی لەهیچ شوێنێك بە یەکجاری نەدەگیرسایەوە ...، هەر لەواجیبو تفەنگ خاوێن کردنەوەو پۆستاڵ بۆیە کردن بوو ، ئەئاوا کەم تا زۆر هاودەنگیو هاونشینی دووپیاوی قسەزانی نەکردوە ... لەلای هەموان بە کەونە پۆلیسێکی هیچ لەبارا نەبووو قسەنەزان ناسراوە .. بەرێکەوت گەرلەگەڵ چەند کەسانێك دانیشتبێ ... لەقسە کردنا هەر باسی شەرکردنی خۆی بووە ، کەچۆن بە نیتاق سێ نەفەری سەرشکاندوەو نەیهێشتوە دەست بکەنەوە ... لەنیشان شکاندن ودەست راستی خۆی دەدوێ .. گوایە جارێکیان بەسواری سەردانی گوندێك دەکەن .. بۆ ئێوارە لەبەردەم دیوەخان ئاغەوات لەگەڵ معاون بەگ دەکەونە نیشانە شکاندن ... فیشەکان بەخەسار دەدەن ... شتاق نیشانە ناپێکن ئەویش مەرەخەس لەمعاونبەگ دەخوازێت ، هەر لەقایدەی خۆی چۆن دانیشتوە هەروا سیرەی تفەنگ دەگرێت ، لەگەڵ پەلاپیتکە بزاوتن نیشانەکە هەڵدەگرێت !

دایکت دەست مەنجەڵێکی پڕ لە شۆربا برنجی لەبەردەم دانای .. « هەستە کوڕم .. کاتی دالغە لێدان نییە .. باپیرەت ئێستا دەهری بووە ... دەڵێ کەس نییە خواردنم بۆ بێنێ » هەلسایت پەقرەجە شۆربات هەڵگرت ، کەوتیتە رێ ... هەرباشە نەخۆشخانەکە هێندە دوور نییە هیلاك ببی ...، بەینی خۆشمان بی زۆریش نزیك نییە .

گوایە شاگردیتو لای باپیرەت رۆژانەت هەیە ... خوا هەڵناگرێ دەخیلێکی هەر بەرۆژانەی خۆت بۆکڕی ... دەخیل لەم جۆرانە بوو کە شەربەی ئاوێشی لێ درووست دەکەن دەخیلی لە دەلاقە دانا ...، ئێوارەو ئێوارە « 10 » دە فلسی بۆ دەخستیتە ناو ... کات زستان بوو ... زستانو ژیان لەقەیسەری بەم سەرماو سۆڵە پیاو ووشك دەکاتەوە دراوسێ دوکانداره‌کان ، هەریەکە بەگوێرەی توانای گیرفانی خۆی ، تەباخ یا سۆبە ...، پڕ نەوت کراویان دادەگیرساند خۆیان پێگەرم دەکردەوە ... باپیرەشت لەپول پەرستی نەسۆبە نەتەباخ شتاقی نەکری ... تەنیا تەنەکەیێکی کونکون کەس نازانی لەکوێی پەیدا کردوە پڕ لە چیلکە دارو پارچە مقەباو کاغەزو کۆنە پەڕۆ دەکردو بە یەك دوو دڵۆپ نەوت ئاگری تێ بەردەدان ... دەبووە چرە دوکەڵێك چاو چاوی نەدەدیت .. بۆنو بەرامێکی بۆگەنوپیس

سەرانسەری قەیسەری دەتەنیەوە ، تۆش ئەمەندە لەتەنەکە رەشداگەڕاوەکە دەچوویتە پێش هەر هێندە نەدەچویتە ناو ئاگرەکە ، ئیتر بۆنی چیو تەڕەماشی چی ... سەرماو دەستو پێ تەزین ئەم شتانە نازانێ .. جا چۆن بۆن بکەیت ؟! بۆچی تۆ لەبەر هەلامەتو ئاوو لیچقاوی لووتت هەستی بۆن کردنت مابوو ؟! ئاگات لێ بوو دەرو دراوسێ دوکاندارەکان هەر پرتەو بۆڵەیان بوو ، بە بۆنی کۆنە مقەباو گوونیە و تەرکە دارهێڕوکاس دەبوون نەشیان دەوێرا روو بەروو بۆ باپیرەت دەرببرن بۆیە لەتۆ مۆڕ دەبوونەوەو تۆیان دەبوغزاند ... تا خێرەو مەندێك پێی ووت « مامەگیان .. تەباخێکی نیوداشت بکڕە .. ئەو خەڵکەت کوێر کرد بەچڕە دووکەڵ » .. لە ڕقی ئەم قسەیە نەتەباخی نیوداشتی کڕی نە ئاگری ناو تەنەکەکەش چڕە دووکەڵی دەرو دراوسێی بێزار کرد .. ئەوەی قەوما هەر لەتۆ قەوما ... ئاخر نە رۆژێك و نەدوو نەسێ ... ساردو سەرما کاری خۆی کردو لە لەشە لەروو لاوازەکەتیدا ...، رۆژ نەبوو دووجار نەڕشێیتەوە ... بوو بوویتە چیلکە دارێكو هەناسەت دەدا .

خەریکی پەرینەوەی شەقامەکە بووی ...، یەك دوو تاکسی لە حەندی تۆ گرانیان دەکردو دیدەیان بۆڵێ دەدای تۆش رووت لێ وەردەگێران .. ئەوان دەکەوتنەوە گەڕ .. لە شەقامەکە پەڕیتەوە .. هێشتا ماوتە بگەیتە سەری شۆستەکە ، تا پێچکەیتەوە بەرەو نەخۆشخانە .

وارێکەوت دوو رۆژان دوکانتان داخست ... چوو بۆ پایتەخت چەند فەردەییێك لەنگە بکرێت .. هەرکە گەڕایەوە بۆ بەیانی چوار فەردە جلی لەنگە گەیشتە بەر دوکان . دووفەردەیان پاڵتۆ بوو یەکێکیشیان بلوزو کراسی زستانە بوو ، ئەوەکەی تریشیان قەمسەلەی رەقەم دارو نووسراوە گەورەو بەزاقو زریقەکان بوو .. ئیتر ناوی خوای لێهێنا یەك لەدوای یەك کەوتە فەردە شکاندن سەرەتا لە فەردەی قاپوتەکانی هەلپچڕی ، بە دەستی خۆی لەسەرییێکی هەڵدەگرتن هەموو گیرفانەکان دەگەڕا بەڵکو ئەوە خوایە شتێکی بەقیمەتیان تیا لە بیرچوبێت ... پاش پشکنینی هەر قاتێك بەتەواوی تۆ وەرتدەگرتو لەسەر یێکت دادەنان ... یەکێکیان لە دیوی ناوەوەی یەکێك لە گیرفانەکان کات ژمێرێکی دۆزیەوە .. ژنانە بوو ... لەخەنی خۆشیان نەیدەزانی چیبکات ... ئیدی وەك بۆنو بەرامی ئاگری ناو تەنەکە کون کونبوەکە لەسەرانسەری

قەیسەری هەواڵ بڵاوبۆوە ، لەتەك دەخیلە تۆز لێكەوتوە كەت ـەدەلاقە داینا ، بۆنوێژ چووە مزگەوت ئاگاداری كردیتەوە كە لە جێگای ئەم دانیشیت دەست لە هیچ شتێك نـەدەیت تاخـۆی دەگـەڕێتەوە .. یـەكێك لە دراوسێكـان بـە هـەڵی زانی هـات سەیرێكی كات ژمێرەكە بكات ، كات ژمێر لەو دەست چووە ئەم دەست گشت دراوسێكان سەیریان كرد .. كە باپیرەت گەڕایەوە یەكێكیان بەترسەوە كات ژمێرەكەی هێنایەوە ... ئاگات لێبوو باپیرت كەڵلەیی بوو ، بەلام لەبەر پرئیشی هیچی بۆنەوترا هەر لێوی خۆی دەكرۆشت .

ئەوە لەسەری شۆستەكە نزیك بوویتەوە ، ریزە دوكانێك بەدەستە راستـەوە بنیات نـراوە ..، سەرتـاشخانـەیێك پڕە لەگەنج ، كابرای سـەرتاش خـەریكی قژ ووشـك كردنـەوەی یەكێكیان بوو .

زۆرت كـەیف بەوەنـدە پەرچـەمە دەهـات كـە لەپێشی نیوچەوانت درێژ بووبۆوە ... هەركە دەهاتە سەرچاوت بەسەر ڕاوەشـانـدنێـك بـەرزت دەكـردەوە ، ئـەویش زۆر رقی لە پـەرچەمـەكەت دەبـۆوە ... پێی دەگـوتی « بـەخـۆو بـەو پەرچەمەت دەڵێ عەلمۆدەی نێری » زۆری لێ دەكردی كە كورتی كەیتەوە ، هەر جارەی بە بیانوێك لەكوڵ خۆت دەكردەوە ، كار بەمەندە نەوەستا ، شەوێـك لەشیرین خـەودا بووی لەگـەڵ خشتە خشتی مقەس ڕاپەڕی .... چاوت بـە پەرچـەمەكـەت كـەوت خـڕوخشت لەنـاو مستی بـاپیـرەتـە ، وەك شێت هەڵسایتەوەو چوویتە بەر ئاوێنە ، شێت تر بووی ، ئەو شەوە تا بەیانی فرمێسكت هەڵڕشت نەخەوتی لەسەر شۆستەكە پێچت كردەوە ، ئەمـە دوور بە دووری نـەخۆشخـانەكـە دیارە ... نەختێك هەنگاوت توندكرد .

ئێـواران بەر لە دوكـان داخستن « كوبـە » فرۆشێـك فێربیبوو دەهاتە قەیسەری ولەبەر دەرگا دادەنیشت ، « كوبەی سەیدی » زۆر بەتام بوو ، هەركەسێك جارێكی بخواردبا ئێوارە بێری نەدەكرد !! كەس نەبوو تامی نەكـات ... بەدوكـاندارو مشتەریو ڕێبوارو گەورەو بچوكـەوە دەبوونـە مێوانی مـامە سەید ... بە تەنیا تۆ نـەبی ... چۆن تـامی بكەی ؟ بـە چی بیكڕی ؟ باپیرەت فلسێك بە كوبە نادا بۆ خۆی ، بۆ تۆش هەر هیچ ... ئێوارەییكیان وەك جاران بەرەو مزگـەوت بۆ نـوێژی عەسر غلۆر بۆوە ... هێنـدەی پێنەچـوو مام سـەید بـەخۆو بەمەنجەڵی كوبە وەك فریشتە پەیدابوو ، هەر بابـا بوو كـوبە هەڵدە بژێراو دەدرا بەر قەمپاڵان ... نەوست تاویدا سەیرێكی دەخیـلی دەلاقەكـەو پاشـان لەمەنجـەڵی كوبـە ماوەییكی پێ خایاندی ، چاوت نوقاندو دەخیلت داگرت ، پارەی خۆتەو كەس مافی بەسـەرەوە نییە ، وورگەو گـورگەو زمانت دەیـان ووت بشكێنە دەخیلە پارەكە بشكێنەو كـوبەییكی بـەلەزەت بخۆ ؛ هۆش و بیریشت دەیووت نەكەی هەڵەی وابكەی پێبزانێتەوە خراپت بەسەر دێنێ ... نەكەی ، بكە ، نەكەی ، بكـە ...، لە پاشاندا بكە بەسەر نەكەیدا زاڵ بوو ، لەم شوێنەی پارەی تێ دەهـاون خەریكی پـارە دەرهێنان بـوویت ، دەرنـەهـات ... بەپارچە ئاسنێك كەوتیتە فرەوان كردنی شوێنەكە ، بۆكەرتێك لەزاركی دەخیلەكە نەشكا ؟!! پارە وەدەركەوت .. هەردەفلسی بـووبوت دەگـرژینەوە پـارەی كوبـەییكت دەرهێنـاو پـارچـە شكاوەكەت خستەوە شوێنی خۆی ، دەخیلەكەشت داناوە ناو دەلاقە ؛ چوویت پارەكەت خستە دەستی مام سەید ، گـورج كوبەییكی چـەورت هەڵگـرت ... كەوتیتـە كوبـە خواردن ... ئۆخەی ... ئەوە كوبەش دەخۆیت گەڕایتە لای دەخیلەكەت ، دووربە دووری سەیرت كرد شكاویەكە دیار نەبوو ... هێندەی نەبرد باپیرەت گەڕایەوە ، هیچ شتێك تا دوكان داخستن ڕووی نەدا ؛ بەلام لەكاتی « 10 » فلس خستنە ناو دەخیلی ئیمرۆ ... دەخیلەكـەی داگرت ، لەم كـاتەدا پـارچە شكـاوەكە كـەوتە خوارەوە ! واقی وڕما !!! سەیرێكی كرد ... تۆش خۆت لێگێل كردبوو گوایە ئاگاداری هیچنیت ، لێی پرسی « كێ دەستی لەم دەخیلە داوە ، .. بەجوڵانەوەییكی دەست و دەم وچاوت وات بۆ دەرخست كـە « نازانی » ئـای لە بەد بـەختیت .. سـوچ لە قەباحەت گەورەترە ... باپیرەت نەڕانـدی « وادیارە هـۆشت لەدوكانەكەش نییە ، شمەكیشت لێ بدزن ئاگات لێنییە » گەیشتیتە بەر دەرگای نەخوشخانە ، زۆری وەك تۆ ، دەست بە پەقرەج و شتی تر راوەستا بوون ...، پۆلیسە پیرەكەی بەر دەرگا ریگە نادات كەس بچێتە ژوورەوە ..زۆر توڕەوتووش دیار بوو ، نە ئەم رێگەی كەسی دەدا ، نەخەڵكەكەش پەرتەیان لێ دەكرد ، وورده وورده‌ش بەر دەرگا پتر خەڵكی لێ كۆدەبۆوە ...، پولیسی باپیرەت بیركەوتەوە ئەویش ئاوا تـوڕەو تووش بـوو ، بۆیێ كەخانە نشینیش كرا ؛ ئەوەندەیان مووچە بۆنەبڕیەوە كە ژیانێكی ئاسوودە بژێیت .. « 30 » سی ساڵی پۆلیسی كردبوو ..

سی عقوبەی لەسەر سی شەر هەبوو ... کونی یەکەی لاپەرەی خالی تیا نەبوو ، معاون و مفەوزو رەئیس عورەفاو عەریف نەمابوو سەریان نەشکێنێ و لەگەڵیان بە دەمەقاڵ نەهاتبێ . ئەو ئامیرەی موچەی خانەنشینی بۆ بریبۆوە پێی ووتبوو هەقوایە هیچت بۆ نەبرمەوە ، بەلام منداڵەکانت بێ گوناهن ، برۆ شتێکت بۆ دەنووسم !

پۆلیسە پیری تورەو توشی بەردەرگا ، هەر بە روخسار تۆی ناسی یەوە ... لێت هاتەپێش ، ووتی : تۆ کورەزای مام سەلیم نیت ؟ ووتت: بەڵێ ! ووتی یەوە : ئەی بۆدەنگ ناکەی ! وەرە برۆ ژوورەوە وەرە ، تاقەتی جنێوی مامسەلیمان نی یە ، دەرگای بۆخستیتە سەرپشت ، ئاورێکت لەوانەی تەکت دایەوە وەك پێیان بڵێی چی بکەم مام پۆلیس چی لەگەڵ ناکرێ ، لەدەرگاوە بەژوور کەوتی .

شەو لەماڵەوە داوای ئاوی لێکردیت ، تۆش دەخیل شکاندنەکەت لەبیر نەمابوو ، جامی پر ئاوت دایەدەستی ، لە ناکاوپری دا مەچەکت ... بەگۆپاڵە ئەستورەکەی کەوتە سەرت ... گوناهت زۆر بوو ، جگە لە دەخیل شکاندن ، رقی کات ژمێرەکەشی پێداپشتی .. زۆری تێ هەڵدای ، گۆپاڵێك بەر سەرت کەوت ، خوێن فرکەی کرد ؛ جا پیاوم دەوێ دەستی بگرێت کوا پیاو ، خۆ باوکە جوانەمەرگەکەت لەمێژە بۆ ئەم سەگمە حەساری یە ماڵ ئاوایی یەکجارەکی لێ کردویت ، خوا کردی لەدەستی بەرەڵلا بوویت بەم شەوە لەماڵ دەرپەریت ، هەر بە هەڵاتن چوویتە ماڵی خاڵت .

گەیشتیتە ناو قاوشی پیاوان ؛ نەتزانی لەکام لایە ، کام قەرەوێڵە هەوە ، جا چۆن بزانیت !؟ گەر تائێستا ئەمە بۆ دوو مانگ دەروات لەنەخۆشخانە کەوتوە تۆ سەردانێکت نەکردوە ؛ دەمێکە لێك تورەن .. دڵی یەکترتان شکاندووە ... یەکتری نادوێنن .

سەردەمێك بلعاتێکی خراپت گرتبو ؛ بەیانیان باپیرەت « 20 » کراسی ووتوکراوی پێت دەدا وفیەتەکەی پێ دەوتی تا لە نێو بازارو سەر شەقامەکان ساغیان کەیتەوە ؛ تۆش یەکسەر کراسەکانت هەڵدەگرت و بەرەو ماڵ دەبوویتەوە ، بۆ گۆرەپانی تۆپی پێ ، جا گەر یەکێك لەسەر رێگای خۆتەوە کراسێکی کریبا دەناچش ؛ دەگەیشتیتە لای یاری کەرەکان ؛ کراسەکانت دەکردە دووکۆمەڵ « 10 » کراس لەم لا دە یەکەی تریش لەولا لەبریتی کۆمەڵە بەردی گۆڵ دات دەنان ! ئیدی ئەو هەموو تۆزوخۆڵ و پیسایی یە لەسەرکراسەکان دەنیشتنەوە کراسی وا هەبوو رەنگەئەصلی یەکەی وون دەبوو ، پاش ئەوەی تەواو هیلاك دەبوویت کراسەکانت کۆدە کردەوەو بەرەو دوکان دەبوویتەوە ، تومەز باپیرەت هەستی پێکردبووی رۆژێك بە نهێنی دوورو نزیك دوات کەوتبو ، هەستت پێ نەکردبوو لەبێ خەبەران کەشکەك سەلاوات .. یاری دامەزراویەك دوو جاریش خۆت لەتۆزوخۆڵ وەرداو چەند تۆپێکیش بەر کۆمەڵە کراسی ئەوسەر کەوت ، لەناکاو دەستێك توند شانی گرتی ... سەرت هەڵبری هەر هێندە زراوت نەرژا .. هەر گورپەووە بەردێك و کێشای بە سەرتدا ، خوێن فرکەی کرد لەهۆش خۆت چوویت ، کە بە ئاگا هاتی یەوە شەلاڵی میزبوو بوویت چاوت کردەوە دایکت لەژوور سەرت چاو بەفرمێسك دانیشتبوو .

لەنەخۆشێکت پرسی .. دیارە ناوبانگی لەم قاوشەش بڵاوبۆتەوە ، بۆیە کابرای نەخۆشە یەکسەر دەستی هەڵبری ، گوتی : ئەوەی لای پەنجەرەکە خۆیەتی ، زەینت دایێ لەسەرگازی پشت لێ کەوتبوو ، چاولەمۆلەق سەیری بن میچی دەکرد ، چوویتە لای ، هێندە کۆشات هیچت بۆنەوترا ، هەستی کرد یەکێك لای وەستاوە ، چاوی تێ بری ناسی تیەوە ، وا سەیری دەکردی ، چاو چاوی جاران نەبوو تێروانینەکەی پر بوو لەسۆز ... لەترس ... لەمردن .. لەپارانەوە ، بەچاو دەیدواندی : رۆڵەکەم ، کورەزاجوان و جحێڵەبێ رەحمەکەم ، بۆچ لێم ناپرسی ؟ لەبەرچی سەردانم ناکەی ؟ راستە زۆر ئازارم داوی ... بوومە هۆی سەر لێشێوان و نەخۆشی و دەست و پێ سپی یەکەت . بەلام من باوکی باوکتم ، یانی گەر باوکت لەزوریەتی من نەبوایە تۆش نەدەهاتیە وجود ، وەرە .. وەرە با ئاشت بینەوەو گەردنم ئازادبکە . دەستە چرچ و لەرزۆکەی هەڵبری بەسەری داهێنای تۆش دەستیت گرت و پر بەسی یەکانت ماچت کرد ، غوربەتێکی بەگور لەناو قووڵایی دەرونتەوە سەری کرد ؛ فرمێسك لەچاوت جۆگەلەی بەست ، ئەمیش وەك تۆ فرمێسکی بەچاوە قووڵ و بچوکەکانی دەرشت ، دەستیت بە دوا ماچکردنەوە لەسەر سینگی دانا .. مەنجەڵە شورباکەت بەرزکردەوە هێشتا هەر گەرم بوو بەسۆزو پەشیمانی یەوە گوتت « باپیرە داوای شۆربای برنجت کرد بوو ؛ ئەوە من بۆم هێنای » .

# خۆشی

نووسینی : نۆهارە

وەرگێرانی لە ئینگلیزییەوە : سامان

شوفێرەکانی بەر کۆفی بۆت هەمیشە هەر خەریکی پلارو توانج هاویشتن‌بوون . هەر کە کیژەکە گەیشتە نزیکیان دەمیان لێ کرایەوە . « چۆنی » گیانە ؟ لە چی‌دای دڵەکەم ؟ بۆوا بەپەلە بەقوربان .... ئەمانەو پلاری‌تر داباری بەسەریا . بێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە کیژە لە سەرخۆ ملی رێگەکەی گرت . بەلام تانەو پلار هەر روو لە زیاد بوون بوو ، تا دەهات بێماناتر دەبوو . ناچار کیژە خۆی بۆ نەگیرا . ئاورێکی دایەوەو سەیرێکی دەورو پشتی‌کردو بەرووی شوفێرەکاندا تەقییەوەو هاواری کرد « برۆن شێتینە » !

کە شەقامەکەی بڕی‌و گەیشتە دەمی کۆڵانەکە پاژنەی پێی کەوتە ئازارکە هەروەك شۆستەکە بیگەزێ . هەمووگیانی بەم ئازارە ئاشنابوو ، چونکە هەر چەند تووڕە دەبوو ، تووشی ئەم قاچ پەشەیە دەبوو . ئاوڕ دانەوەکەو جنێوەکەی خۆی تەواو پەستی کردبوو . هەموو رۆژێ کە بەلای ئەم گازینۆیەدا تێپەڕدەبوو ، هەرچەند لەم شوفێرانە نزیك دەبووەوە ، بڕیاری تەواوی دەدا کە بەهیچ جۆرێ وەلامیان نەداتەوەو قسەیان پێ‌نەلێتەوەو خۆوتەنی « ئەو دڵەیان خۆش نەکات » .

هەرچەند ناچاریش دەبوو وەلامیان باتەوەو پیاندا هەڵ شاخێتەوە ئەوا کلافەیەك ژانی تووڕەو ناڕەزایی بە ناخیدا دەچووە خوارەوەو لە هەموو خۆشی‌یەکی دەکرد . زۆر ئێواران تا دەگەیشتە گازینۆکەش هەموو گیانی لە خۆشیدا سەمای دەکرد ؛ دڵی ئەوەندە خۆش‌بوو بەو پارە کەمەی کە دەستی کەوتبوو تەنانەت هەستی بە ماندویتی‌و شەکەتی لەشیش نەدەکرد . بەلام ئەوەندەی خۆش‌بوو تا دەگەیشتە بەردەمی گازینۆکە ، تاجنێو پلاری شوفێرەکان دەستی دەکرنەوە بەبارین . ئیتر هەرچی بێ‌ی بڵێ‌ی خۆشی لە دڵیا نەدەماو رق‌و کینە سەرتاپای دڵی دادەگرت‌و قاچ پەشەکەش ووردە ووردە سەری هەڵدەدایەوە .

بەرەو خواربووەوەو بەکەنار خانووەکانی ئەمبەری کۆڵانەکەدا تاگەیشتە خانوویەکی دیوار داڕووخاو . کەمێك لەبەر قاپیەکەدا وەستاو کەزانی دانەخراوە چووە ناوەوەو سێ نهۆم پلیکانەی بڕی‌و خۆی کرد بەژوورەکەی خۆیدا . تاریکی باڵی بەسەر هەموو قوژبنێکی ژوورەکەیدا کێشابوو . بەناچاری بەم لاو لای دیوارەکاندا دەستی کوتا تا دەستی‌بەر سویچەکە کەوت . سویچەکە لە کۆنیدا پەکی کەو تبوو . بەیەك دووجار جوڵاندن‌و دەستکاری ئینجا کەوتە کار . کیژەکە بەرەو لای تاکە پەنجەرەی ژوورەکەی رۆیشت ، پەردەکەی دادایەوەو خۆی گۆڕی‌و جلەکانی بەری هەڵواسی لە پاشاندا پەرداخێ ئاوی خواردەوە . ئینجا دەست شۆرەکەی پڕ کرد لە ئاوو گۆرەوی‌یەکانی تێ‌هاویشت‌و دەستی کرد بە شتنیان . کە لێ‌بوەوە ، بەلای زۆپاکەدا هەڵی خستن . لە دواییدا بارەکەی کردەوەو بسکیتێکی لێ دەرهێناو خستیە سەر مێزەکە .

پێنج مانگێك دەبوو سام‌و ترسی برسێتی‌و لە برسا مردن دەستی لە قورتمی کردبووەوە . لە مانگی تەمووزەوە ، بەدوایی ئەو ئیشەی ئێستەی‌دا ، ترسی لە برسا مردنی لە دلا نەمابووە . لەوکاتەی بەسەرماو گەرما ، لە خۆشی‌و ناخۆشیدا شتێکی هەر دەست‌دەکەوت بیخوات . لەو چێشتخانە بچکۆلەی ئیشی تێدا دەکرد رۆژی دووژەم خواردن‌و هەفتەی شانزە دۆلاری هەبوو . ناو بە ناویش شتێکی لە میوانەکانیش هەڵ دەکراند . لە پێشەوە لە چێشتخانەکەدا قاپ‌شۆربوو ؛ لەم دواییەدا کەمێکیش بەرزبووبووەو کاری‌تری پێ‌سپێرابوو . کارەکەی بریتی‌بوو لە مێز پاك‌کردنەوەو رێکخستنی کورسی‌و ناوبردن . جاری واهەبوو ئەو میوانانەی مناڵیان دەهێناو ئەم بەهانایانەوە دەچوو بەجاری کە دەهات دایمێکی بۆ بەجی دەهێشت . کیژە دڵی بەم ئیشەیٔ زۆر خۆش‌بووو هەندێ جاریش خۆی بە خاوەن ماڵ دەهاتە بەرچاو . ئەوە بوو ، تەنانەت رۆژی بەخاوەن چێشتخانەکەی گوت « لەم‌ئیشەی ئیستەما زۆر جار خۆم

بەخاوەن ماڵ دێتەبەرچاو» . « چۆن ؟ » خاوەن چێشتخانەکە پرسی . « ئەی نابینیت چۆن بە دەنگ میوانەکانەوە دەچمو رابیان دەکەم ؟ ئەوەنییە پەرداخەکانیان بۆ پردەکەمەوەو بەرکۆش و دەستەسرییان دەدەمێ !» . «وایە ، راست دەکەی» خاوەن چێشتخانە گوتی « بەلام تۆ نابێ وابیر لە خۆت بکەیتەوە . تۆ تائێستەش پارەی قاپ شۆری وەردەگری و بچووکترین گۆڕانیش روویدات ، تۆ دەگەڕێیتەوە شوێنی پێشووت » .

بە دوای ئەم قسانەی وەستاکەیدا بۆ یەکەم جار هەستی کرد کە وەستاکەی چاکی هەڵسەنگاندووەو کێشاوێتی . پێوانەی وەستاکەی بە موو لەگەڵ پێوانەی شوفێرەکاندا جیاوازی نەبوو . هەرگیز لەیەك جار بەولاوە لێت ورد نابنەوە ، قەد نایانەوێ بچنە ناختەوە ، بەیەك جار سەیر کردن وا دەزانن لە هەموو نهێنیەکانت دەگەن پەردە لە رووی هەموو نیازەکانت رادەماڵن . راستە لە هەموو لایەنێکەوە لە ئەمریکایی نەدەچوو ؛ بەلام بۆ دەبێت لە ئەمریکایی بچێت ؟ دایك پۆڵەندی و باوك پۆڵەندی ، بۆ دەبێ کچەکەیان لە ئەمریکایی بچێت ؟

چاوی مێزەکەی کردەوەو ئەو قوتوە نوقلەی دەرهێناکە هەمیشە شەش حەوت دۆلارێکی تێدا پاشەکەوت دەکرد . وای بەبیر داهات کە ئەگەر دزێکی شارەزا خۆی بکات بە ژوورەکەیدا ، ئەوا یەکەم جار چاوی مێزەکە دەکاتەوەو سەیرێکی ئەو ئەلقەو ملوانکە هەرزان بەهایانە دەکاو توڕیان دەدات و دەچێتە سەر قوتوی نوقلەکەو شەش حەوت دۆلارەکە دەبات و بۆی دەر دەچێ . ئێستەکە ئەم بیرە رەشەی لە شوێنی خۆیدا نەبوو ، پارەکە چۆن دانرابوو ، هەروەك خۆی لەوێدا کەوتبوو .

پارەکەی نایەوە ناو چاوی مێزەکەو دەرگای دۆلابی ناو دیوارەکەی کردەوە . دوو جانتای هەرزان بەهای کەلو پەلی راکێشایە دەرەوەو پارچە تەختەیەکی رایجی پانی لەبن دۆلابەکەدا دەرهێناو سەیرێکی چاڵەکەی ژێری کرد : قوتوە سوورە شەوقدارەکە هەر لە جێگای خۆیدا بوو . دەری هێناو کردی‌یەوەو دەستی کرد بەژماردنی پارەکەی ناوی . سەدوبیست دۆلاری بێکەم و زیاد تێدابوو ویستی بەسەر حیسابی هەفتەکەیدا بچێتەوە بزانێ دوا فلسی پارەکەی چۆن خەرج کردووە . هەموو هەفتەیەك پێنج دۆلاری پاشەکەوت دەکرد ، سێ دۆلاری دادەنا بۆ کرێی ژوورەکەی ، پەنجا سێنتی دەدا بۆ کرێی هات و چۆ ، شەست سێنتی دەدا بەجگەرە ، پەنجا سێنتی تری دەخستە لاوە بۆ قستی پاڵتوەکەی و نیو دۆلاریشی دادەنا بۆ قستی قاتەکەی ، جگە لەمانەش هەموو هەفتەیەك دوو دۆلاری دەنارد بۆ خوشکە بەشووەکەی . هەرچەندە دەیویست بزانێ پاشماوەی هەفتانەکەی بەچی داوە ، هەرچەند سەری دەهێناو سەری دەبرد بۆی نەدۆزرایەوەو درکی پێ نەدەکرد چی کەمو کورتییەکی پێ داپۆشیوە . بێگومان پێویستی بەوە نەبوو بیدات بە رۆژنامە ، چونکە زۆر جار مێوانەکانی چێشتخانەکە بۆیان بەجێ دەهێشت ، جگە لەمەش لە ناو کرێکارەکانی‌تردا هەر رۆژنامەیەکی دەست دەکەوت چونکە زۆر جار دەستاو دەستی دەکرد لە کرێکارێکەوە بۆ یەکێکی تر . بەلام هەموو رۆژێکیش هەر دەبوایە رۆژنامەیەکی بکڕیبایە ، چونکە رۆژنامە فرۆشەکەی بەرئەو محەتتەی شەمەندەفەرەی کە لێوەی سواردەبوو کوێربوو ئەمیش زۆر بەزەیی پیادا دەهاتەوە . هەفتەی دوو جار دەچوو بۆ سینەما .

کەلەم حیسابە وردانەی خۆی بووەوە لەبەر خۆیەوە گوتی : « ئەگەر هەفتەی دە دۆلارم پاشەکەوت بکردایە ، ئێستاکە خاوەنی دوو سەدو چل دۆلاری خۆم دەبووم نەك سەدووبیست » .

قوتوەکەی داخستەوەو کلیلی داو خستیەوە ناو چاڵەکەو لەبەر خۆیەوە گوتی : « خۆ کفرمان نەکرد . ئێستەچی رووی‌داوە ؟ مرۆڤ هەردەبێ ناو بەناو بایەکی باڵی خۆی بداو کەمێك رابوێرێ » .

لەگەڵ ئەم قسانەدا جگەرەیەکی تەواوی داگیرسان و نای بە لێویەوە

**تێبینی : -**

لە کتێبی « Hope of Heaven » وەوەرگێراوە کە بریتی‌یە لە هەندێك کورتە چیرۆکی نووسەری ئەمریکی بە ناوبانگ جۆن ئۆهارە . ئەم چیرۆکە وەرگێراوە لە ژێر ناوی « Pleasure » دایە لە ل 170 — 172

# مۆتەكە

چیرۆكی : دۆستۆیفسكی

كۆرینی - ڕەووف بێگەرد

سستیو بێهـۆشیەكی سـەیرم بـەسەردا هـاتبـوو ، لەخەویشدا نەبووم ، كە چاوم لێـك دەنا پـاش كەمێـك ترس دەبووە مۆتەكەو دەهاتە ویژەم ، لەتاوا چاوم دەكردەوە ، ئەم ویست هاوار بكەم ، بەلاّم دەنگ لەگەروومەوە دەر نە دەهات .

نیوەی شەو دەنگی كرانەوەی دەرگاكەم بیست ، یادم نیە چەندم پێ چوو ، تەنیا ئەوەندە ئاگادارم كـاتێ كە چـاوم كردەوە باوكمم بـەرانبەر خـۆم بینی ، لەبەرچـاوما دیمـەنی ترسناك دەینواندو ڕەنگی پەڕیبوو ، لەكەنار دەرگای ژوورەكە لەسـەر كورسیـەك دانیشتبوو ، دیـار بوو كـەوتبوە بیـرێكی قووڵەوە ، لەژوورەكەدا مـۆمێكی نیوە سـووتاو ڕووونـاكیەكی خەماویی ئەخستە سەر بێدەنگیو سامناكیی ناو ژوورەكە .

مـاوەیەكی زۆر لەبـاوكم ڕامام ، سـەری نابـووە نـاو دەستیو ئـەنیشكی بە ئـەژنـۆیـەوە قـرسـانـدبـوو ، هیـچ نەدەجوولاّ . چەند جارێك ویستم بانگی بكەم ، بەلاّم نەمتوانی ووشەیەك بخەمە سـەر زمانم ، سستیـیەكی سەیـر لەگۆی خستبووم ؛ تا لەئەنجامدا باوكم لەمـاتەمیـەكەی دەرهـات ، سەری بەرزكردەوەو لەسەر كورسیەكـە هەستـا ، تا چـەند دەقیقـەیـەك لەنـاوەڕاستی ژوورەكـەدامـایـەوە ، لەپـڕا لە قـەرەوێڵەكەی دایكم نـزیك كـەوتەوە ، بـەچاكی گـوێی بۆ هەڵخست ، گومانی نەما كە خەوتووە ، ئەوسا بەرەو لای ئەو سنـدووقەی كـەمانچـەكەی تیـا بوو ڕۆشت سنـدووقەكـەی كردەوە ، كیفە ڕەشەكەی تیا دەرهێنا ، لەسەرمێزەكە داینا ، پاشان سـەیرێكی ئـەم لاو ئەولای خـۆی كرد ، ڕوانینـەكەی گوماناویو بارێكی پڕ لە مەترسیی لە خۆ گرتبوو ، لەوەی دەكرد بیەوێت ڕابكات ، هێشتا بەو شێوەیە نەمدیبوو . كەمانچەكەی هەڵگرت ، كەچی دووبارە لەشوێنی خۆی دانایەوەو دەرگاكەی بەست ، لەدۆلاّبە دەرگاكراوەكە ڕاما ، هێدی هێدی بەلایەوە چوو ، پەرداخێكی پڕ لەشەراب كردو یەگژەمی بەسەریەوەنا ، بۆ جاری سێیـەم كەمـانچەكـەی هەڵگرتو دیسان لەسـەر مێزەكەی دانایەوە ، بەرەو قەرەوێڵەكەی دایكم چوو ، لەترسا ووشـك بووبـووم ، بەچـاكی چاودێـریم دەكرد تـابـزانم چی ڕوودەدا ، بـاوكم ماوەیـەكی زۆر بێ دەنگو جـووڵە وەستاو گوێی تەكاند ، ئەنجا لێفەكەی لاداو نووكی پەنجەی خستە سەر دەمو چاوی دایكم ، من لەتاوا دەلەرزیم ، دیسان باوكم چەمایەوەو ئەمجارە سەری نایە پاڵ سەری دایكم ، كە سەری هـەڵبڕی دژواریـەكی بێـزراو كـەوتبـووە سـەر دەمو چـاوە شلوێكەی ، لەسەر خۆو وەك دەست بپارێزێت لێفەكەی دایەوە بەسەر دایكما ، من هەروا دەلەرزیم ، چونكە ترسێكی كوشندە هـەموو گیـانی داگرتبـووم ، لە دایكم دەتـرسـام ، لەخـەوە قـورسەكـەی سام دایگـرتبووم ، بـە تیژی دەمـڕوانیە لەشی بێجـووڵەی كە لە ژێـر چینی لێفەكـەدا ڕاكشابـوو ، بیرێكی ترسناك ڕێگای بەزەینم گرتبوو . باوكم ، پاش تەواو كردنی ئەم كارانە بـەرەو لای دۆلاّبەكـە گەڕایـەوەو ، چی لەشەرابـەكە مـابـوەوە هـەڵیـدا ، كـە لەمێـزەكـە نـزیـك دەبـوەوە وەك سـەرخۆشـەكان لەتـریدەدا ، سیمای دەمو چـاوی تـەواو گۆڕابوو . كەمانچەكەی كە لەوەوپێش دیبووم هەڵی گرتەوە ،

بەلام لەو کاتەدا چاوەڕوانی شتێکی نهێنیو سامدارم دەکرد ، بەبیستنی یەکەم ئاوازی کەمانچەکە کەوتمە لەرزین ، باوکم کەوتە کەمانچە لێدان ، ئاهەنگەکەی پچڕ پچڕ بوو ، چونکە دوای کەمێك دەستی لەلێدان هەڵگرت ، وەك بیەوێت شتێکی لەبیرچووی یادبکاتەوە ، تا لەدواییدا بەبزاوتێکی کەساسانەوە قەوسەکەی نایەوە سەر مێزەکەو تەماشایەکی قەرەوێڵەکەی کردەوە ، نازانم لەو بابەتەوە چ دڵگرانیەکی هەبوو ، جارێکیتر ڕۆیشتەوە نزیك دایکم ، من کە لەترساندا ووشك بوو بووم بەدوای یەکە یەکەی هەڵسوکەوتیا دەچووم ، دووبارە دەستی بەناو لێفەکەدا گێرایەوە ، دیسان بیرە ترسێنەرەکە وەك بروسکە لێی‌دام ، لەخۆم پرسی ، چۆن دایکم لەخەوێکی ئاوا گراندایە ، بۆچی کە باوکم دەستی نایە سەر دەمو چاوی بەئاگانەهات ؟ .

لەوکاتەدا باوکم بینی کە هەموو جلەکانمان ، تەنانەت پاڵتۆی کۆنی دایکمو چاکەتی بەکارهاتووو کراسی خەوتنی کۆکردەوە ، دەرپێ کۆکراوەکانمانی خستە سەر لێفەکەی دایکم ، بەلام دایکم هەروا بێ جووڵە خەوتبوو . پاش تەواو کردنی ئەم کارانە وام هاتە بەرچاو کە باوکم هێور بۆتەوە ئیتر هیچ شتێك نەما ڕێگای کارلێکردنی بگرێت ، لەگەڵ ئەوەشدا دیسان وات هەست دەکرد دڵگرانی شتێکە . جێگای مۆمەکەی گۆڕی ، خۆیشی بەرەو لای دەرگاکە وەرچەرخا ، بۆ ئەوەی ئیتر قەرەوێڵەکە نەبینێت . کەمانچەکەی هەڵگرتەوە ، بەنائۆمێدیەکەوە قەوسەکەی بەسەر تەلەکاندا هێنا ، ئاواز سەر لەنوێ دەستی پێ‌کرد . بەلام ئەمە ئاهەنگی ساز نەبوو ، نەء ، ئاهەنگی لەو بابەتەم لەوەو دوایش هەر نەبیست ، ئەم دەنگانە لە کەمانچەوە بەرز نەدەبووەوە ، تەنیا دەنگێکی ترسناك بوو لەژوورە تاریکەکەی ئێمەدا دەیخوڕی . ئاخۆ نەخۆشی‌ی هەستی چێژ وەرگرتنی شێواندبووم ؟ ئەشێت هەستی من لەئەنجامی بینینی ئەو دیمەنانەوە تووشی ناتەواوی هاتبێت ؟ ئاخۆمن ڕوو بەڕووی کارەساتێکی نهێنیم کە بۆ یەکجاری کەلێن بخاتە ژیانمەوە ؟ نازانم ، بەلام گومان لەوە ناکەم کە دەنگی ناڵینی ئێمە ، دەنگو هاواری مرۆڤانە ، دەنگی گریانێکی مەینەت‌بار ، دەنگی خەمو نائۆمێدیم لە تەلی کەمانچەکەوە دەبیست . لەپاشانا ، لەگەڵ خامۆش‌بوونی ئەو دوا ئاوازانەدا کەئەت‌ووت سامناك‌ترین دەردو ، تاڵترین وێنەی ڕۆژ ڕەشی‌و ، ئەشکەنجەو ئازاریان لەخۆ گرتووە ، وێنەیەکی گەورەو گرانی پەژارەو ڕەنجم هاتە بەرچاو . لەوە زیاتر خۆم بۆ نەگیرا ، هەموو گیانم کەوتبووە لەرزین ، دڵۆپە فرمێسك بەچاوما ئەهاتنە خوارێ ، وەك منداڵێکی وونبوو ، هاوارێکی کوت‌و پڕو هەراشم لێ‌هەستاو خۆم خستە پەنا باوکمەوە ، دەستم لەملی ئاڵاند . باوکم هاوارێکی کردو کەمانچەکەی لەدەست کەوتە خوارێ . باوکم لەم حاڵەتەی من سەرسام بوو ، بەدەوری خۆیدا هەڵیرواني ، دەت‌ووت بەدوای شتێکدا وێڵە ، لەپڕا کەمانچەکەی هەڵگرتەوەو لێی بەرز کردەوە ، بەجۆرێك ئەگەر کەمێکی تری پێوە بوایە هەر لەوێدا دەیکوشتم ، هاوارم کرد :

- باوکە گیان .. باوکە گیان ..

کەگوێی لەدەنگم بوو وەك گەلای درەخت لەرزی‌و دوو هەنگاو بەرەو دواوە ڕۆشت ، لەکاتێکدا کە شانی گرتبووم بەرزی کردمەوەو بەسەرمانەڕاندی :

- ئاخ ! تۆیت ؟ نەء ، هێشتا هەموو شتێك لەدەست نەچووە ، تۆ بۆمن ئەمێنیت .

دووبارە بەلالانەوەوە پێم ووت :

- باوکە گیان ، بۆ خاتری خوا مەمترسێنە ، زۆر دەترسم .

فرمێسکەکانم بەسەختی کاریان لێ کردبوو ، لەسەر خۆدا ینامەوە سەر زەویەکەو بێدەنگ چاوی تێ‌بڕیم ، ئەت ووت تازە هۆش‌و هەستی هاتۆتەوە بەرو ئەم ناسێتەوە . کوت‌و پڕ وەك بیرێکی ترسناك هێنابێتیەوە یەك ، دڵۆپە فرمێسك لەچاوە پڕ لەسامەکانیەوە سەرەو خوار بوونەوە ، بەلامدا چەمیەوەو لێم ڕاما ، بەترسەوە پێم وت :

- باوکە گیان .. وا تەماشام مەکە باوکە ، وەرە با لێرە بڕۆین ، هەرچی زووترە بڕۆین ، ڕابکەین ، هەڵبێین .

- بەلێ ، با ڕابکەین ! ڕاست دەکەیت کاتی هەلاتنە ، وەرە ، وەرە نتوچکا .

ئەوەند بەشپرزەیی دەجووڵا ئەت ووت تازە لەوە گەیشتوە چی‌بکات ، چاوی بەسەراپای ژوورەکەدا گێڕا ، کە سەرپۆش‌و سەرو کلاوەکەی دایکمی لەسەر زەویەکە بینی ، هەلی گرتن‌و خستنیە گیرفانی ، لەوە دەچوو خەریکی کۆکردنەوەی پێویستی‌ی سەفەر بێت ، بۆیە هەر شتێك لەوانەی کە ڕەنگە پێویستی بوایە کۆی کردنەوە .

جلم لەبەر کرد ، پێویستیەکانیشم هەڵگرتن ، باوکم پرسی :

- هەمووی ئەمەیە ؟ هیچت لێ بەجێ نەماوە ؟ .

کەواتە چاکە .. زووکە .. زوو ، بەپەلە هەموو جلەکانم لەبوخچەیەك کرد ، سەربەستێکی ڕەشم بەسەرمدا داو لەگەڵ باوکما بەرەو لای دەرگای ژوورەکە ڕۆیشتین . لەپڕا بیرم کەوتەوە تابلۆیەك کەبەدیوارەکەوە هەڵواسرابوو بیهێنم ، باوکم بە هەزار حاڵ ڕای لەسەردا ، دیار بوو هێمن بووبووەوە ، لەسەرخۆ قسەی دەکردو سوور بوو لەسەر پەلەکردنم ، بەلام تابلۆکە زۆر بەرز داکوترابوو ، بە هەردووکمان کورسیەکمان هێناو تەپلەکێکمان خستە سەر ، بەترس و لەرزەوە چووینە سەری و بەشەڕەشەق توانیمان تابلۆکە لەبزمارەکە بکەینەوە ، ئێستا تەواو ئامادەی جووڵان بووین ، باوکم دەستی گرتم ، کە گەیشتینە بەردەم دەرگاکە ، کوت و پڕ باوکم وەستاو ماوەیەك دەستی بەناوچاویاهێنا ، تا ئەوەی لەبیری چووە یادی بکەوێتەوە ، وەك لەئەنجامدا شتەکەی بیر کەوتبێتەوە ئەو کلیلانەی لەژێر سەری دایکما بوون هەڵی گرتن و بەپەلە بەناو دۆلاب و سندووقە شکاوەکانی ژوورەکەدا کەوتە گەڕان ، تا لە دواییدا لەگەڵ ئەو پارەیەی لەناو چەکمەجەکاندا دۆزیبوونیەوە گەڕایەوە ، لەسەر خۆوتی :

- وەرە ئەم پارەیە بگرەو ئاگاداریبە ، ئاگات لەخۆت بێت گومی نەکەیت ! گوێت لێیە ؟ .

پارەکەی کردە دەستمەوە ، ئەنجا لەدەستی سەندم و خستیە باخەڵمەوە ، پارەکە بەرووتی کەوتە سەر سنگم و هێندە ساردی پێگەیاندم کەوتمە لەرزین ، وام هەست کرد ئەمە یەکەمجارە لەگەڵ حەقیقەتی پارەدا ئاشنادەبم . ئێستا تەواو ئامادەی ڕۆیشتن بووین ، بەلام دیسان باوکم لەجێگایەکدا دایناموو وتی :

- نتوچکا ، شتێکم لەبیرچووە ! بەلام نازانم چیە ، بیرم ناکەوێتەوە . ئۆهـ ، بۆ .. تێگەیشتم ، یادم هاتەوە ، وەرە ئێرەوە نتوچکا :

بردمیە سووچێکی ژوورەکەوە کەوێنەی عیساو مریەمی لێدانرابوو ، خستمیە سەر چۆك و وتی :

- کوڕەکەم ، دووعا بکە ، لەدەرگای خوا بپاڕێوە ، حاڵت زۆر چاك دەبێت .

بەدەست ئاماژەی بۆ وێنە پیرۆزەکان کردو ، تەماشایەکی کردم ، سەر لەنوێ بەدەنگێکی لەسەرخۆ وەك بپاڕێتەوە ووتی :

- بەڵێ ، کە لەخوابپاڕێیتەوە حاڵت چاکتر دەبێت ، دووعا بکە .

کەوتمە سەر ئەژنۆ ، بەمەلوولیەوە دەستم نانە سەر یەك ، ماوەیەك بەم شێوەیە مامەوە ، خەفەت گەرووی ئەگوشیم و خەفەی ئەکردم ، هەموو بیرم ، هەموو هەستم لای پاڕانەوەو لالانەوەکەم بوو . بەلام دوای کەمێك دیسان ترس کەوتەوە گیانم و زمان و بیرم سست بوون ، لەجێگاکەم هەستام ، ئەم ویست بچمە لای باوکم ، ئەترسام ، ئەم ویست هەر لەوێدا بمێنمەوە ، تابتوانم چیم لەدڵداپە بیخەمە سەر زمانم . بەدەم فرمێسك ڕشتنەوە ووتم :

- باوکە .. ئەی دایکم ؟ چی بکات لەکوێیە ؟ دایکم لەکوێیە ؟ .

نەم توانی ووتەکەم تەواو بکەم ، حرس لەوە دابوو بمخنکێنێت ، ئەویش بەچاوی پڕ لەفرمێسکەوە تێی ڕوانیم ، دەستی گرتم و بردمیە لای قەرەوێڵەکەوە ، وورد وورد ئەو کەل و پەلانەی لەسەری دانابوون لای بردن ، پاشان لێفەکەی لادا .

ئای خوا ! دایکم مردبوو ، لەشی ساردو ڕەنگی شین داگەڕابوو ، خۆم کێشا بە سەریاو گرتمە باوەشم ، بەلام باوکم خستمیە سەر ئەژنۆو لەژێر لێوەوە ووتی :

- کوڕەکەم ، ماڵ ئاوایی لێبکە ، ماڵ ئاوایی .

باوکیشم بەرەو ڕووی لاشەکە سەری هێنایە خوارێ ، ڕەنگی هەڵبزرکابوو ، بەلام لێوی لەسەر خۆ ئەجوولا ، وەك ئەوەی بیەوێت شتێك بڵێت . پاشان دەستە لەرزۆکەکەی بۆ لای لاشەکە ڕاکێشاو بانگی هەڵدا :

- نتوچکا ، لەبیرت بێت من لەمەدا نکوولیم نەکردووە ، نکوولیم نیە ها ! لەبیری نەکەیت ، نتوچکا من نکوولیم نەکردوە .

لەگەڵ ترس و پاڕانەوەدا ووتم :

- باوکە ، بابڕۆین ، کاتی ڕۆیشتنە .

- بەڵێ ئیتر کاتی ڕۆیشتنە ، چەند سالێکە وە ختی ڕۆیشتنە

توند دەستی گرتم و بەپەلە بەرەو دەرگا چوو بەدەنگێکی کەمێك بەرز ووتی :

- ئیتر ئەکەوینە رێ ، سوپاس بۆخوا ، سوپاس ، ئێستا هەمووشت تەواو بوو .

لەپلیکانەکان هاتینە خوارێ ، دەرگاوانەکە کەنیوە خەوو نیوە بێدار بوو دەرگای لێکردینەوە ، بە روویەکی ترش و تاڵەوە لێی روانیم ، باوکم لەپێشەوە زووتر چووە دەرێ ، وەك لەوە بترسێت روو بەرووی پرسیارێك بێتەوە ، من لەدوایەوە کەوتمە کۆڵانەکە ، ئەوەندە رۆیشتین تا گەیشتینە سەر بەردە رێژی کەنار رووبارەکە .

بەفر کەهێشتا پرووشەی دەکرد ، بەرد رێژەکەی داپۆشیبوو ، هەوا زۆر سارد بوو ، وام هەست دەکرد تاکرۆکی ئێسقانەکانیشم بەستوویەتی ، چمکی جلەکانی باوکم لەدواوە گرتبوو ، باوکم کە مانچەکەی نابووە بن دەستی ، جار جار ئەوەستاو جێگای بوخچەو کەمانچەکەی بەسەر دەکردەوە ، چارەکە سەعاتێك رۆیشتین ، پاشان باوکم کەوتە لارێ ، لەسەر بەرزایی کەنار رووبارەکە دانیشت ، لەناو بەفرەکەی خوارەوەماندا رێچکەیەك پێش ئێمە شکابوو ، لەو ناوەدا کەس دیار نەبوو .

خوایە ! چەند هەستە کوت و پڕیەکانی ئەو ساتانەی خۆم چاك لەیادە ، ئەوەی سالان ئارەزووم دەکرد پاشان هاتە دی ، وا لەم دواییەدا خانووە نابووتەکەمان بەجێ هێشت ، بەلام ئاخۆ لەڕاستیا ئەمە ئەوەیە کە ساڵەهایە من بەدوایدا وێڵم ؟ . ئەوەیە کە هێزی خەیاڵی منداڵیمی داگیر کردبوو ؟ . ئەمەیە ئەو بەختیاریەی کەوتبوومەدوای و ، بەشەوقێکەوە کەزۆر لە سەرووی تەمەنی خۆمەوەیە ئارەزووم دەکرد ؟ .

لەوکاتەدا ، لەپێش هەموو هەستێکی ترەوە ، پەژارەی یادی دایکم بوو ، بیرم دەکردەوە : «بۆ بەتەنیا جێمان هێشت و هاتین ؟» . من و باوکم لاشەکەیمان وەك کورسی یان مێزێکی بێنرخ پشت گوێ خست . ئەمە لە هەمووشت زیاتر ئازاری دەدام ، بۆیە نەمتوانی لەبەرانبەر ئەم سزاو ناخۆشیەدا زیاتر خۆم بگرم ، دەستم بەگریان کردو ووتم :

- باوکە گیان ـ باوکە گیان ! بۆ دایکمان بەجێ هێشت و هاتین ؟ . بۆ وازمان لێهێنا ؟ . باوکە وەرە بگەڕێینەوە ماڵێ ، بانگی یەکێك بکەین لای بمێنێتەوە .

لەگەل قسەکانمدا باوکم تەکانێکی داو لەجێگاکەی راست بووەوە ، وەك بیری لەشتێکی تازە کردبێتەوەو تەواو دوو دلی کەلا خستبێت ، بەسەرمدا خوڕی :

- بەلێ .. بەلێ نتوچکا ، پێویستە بگەڕێینەوە ، دایکت لەوێ تاق و تەنیایەو سەرما ئازاری دەدات ، برۆرەوە بۆ لای ، تاریك نیە ، مۆمێك لەژوورەکەدایە ، مەترسەو بەیەکێك بلێ ئاگاداری بێت ، پاشان بگەڕێوە ، تۆ بەتەنیا برۆو من لێرە چاوەڕوانتم ، بۆ هیچ کوێیەك ناچم .

بەرەو ماڵ کەوتمە رێ ، بەلام هێشتا نەکەوتبوومە سەر لارێکە دلم هەستی بەشتێك کرد .. گەڕامەوە ، باوکم بینی هەڵتەك هەڵتەك بەرەو لایەکی تر ملی ناوە ، تەنیاو بێکەس منی بەجێ دەهێشت و دەرۆشت .

چەند هێزم تیا بوو هاوارم لێکرد ، پاشان بە ترس و لەرزەوە کەوتمە دوای ، ئەوەندە رۆیشتم هەناسەم سواربوو ، ئیتر نزیك بوو بەتەواوی گومی بکەم ، لەڕێگا کلاوەکەیم بینی لەسەر زەوی کەوتبوو ، هەلم گرتوو راکە راکە کەوتمەوە دوای ، توانای رۆیشتنم نەما ، ئەژنۆم کەوتە لەرزین و چەمانەوە ، لەتاو لەرزین و بێ ئارامی وەك بێهۆشم لێ هاتبوو ، وام هەست دەکرد لە دنیایەکی پڕ لەترس و لەرزام و مۆتەکەیەك بەدوامەوەیە ، چونکە لەخەودا توانای رۆیشتنم نەبوو . بە کەساسیەوە خۆم بەزەویەکەدا کێشا ، هەستی خەم و ئازار گیانمی تەنیبوو ، بەبینینی ئەو کەبێ پاڵتاو کلاو رای دەکرد ، تا لەمن ، لەمنداڵە خۆشەویستەکەی رزگار بێت ، دلم بێ دەسووتا ، ئەمویست بیگەمێ تا تەنیا جارێکی تر ماچی بکەم ، پێی بلێم لەلایەنی منەوە نەترسێت ، خەیاڵی ئاسوودە بێت ، هێوری بکەمەوە ، بەلێنی بدەمێ کە ئەگەر بیەوێت نەکەومە دوای و تاق و تەنیا بگەڕێمەوە لای دایکم . چاوم لێی بوو کە لەپێچی کۆلانێکدا سووڕاو بە پەلە کەوتەوە رۆیشتن ، کەمنیش گەیشتمە سەری کۆلانەکەو وەرچەرخام ، ئەو دوورکەتبووەوە ، زۆر دوور کەوتبووەوە . لەم کاتەدا ئیتر تەواو توانام لەبەر برابوو ، بێ دەسەلاتانە کەوتمە شیوەن و بانگ هەلدان ، لەبیرمە لەکاتی ئەم راکە راکەیەدا بەر دوو رێبوار کەوتم ، کە لەسەر رێگاکەدا وەستا بوون . جارێکی دی هاوارم لێهەلسا :

- باوکە گیان .. باوکە گیان .

ئەمە دوا ووتەی من بوو ، پاش ئەوە لە بەردەم ماڵێکدا خلیسکام و کەوتم ، هەستم کرد خوێن بەدەم و چاوما دێتە خوارێ . کەمێکیش دوای ئەوە .. ئیتر نازانم چی رووی دا .

# گالێری هونەرە جوانەکان



ـ بۆ یەکەمین جار لە مێژووی نەتەوەکەماندا ، بە هیممەتی چەند دلسۆزێکی هونەری کوردی . پیشانگایەکی هەمیشەیی لە شاری سلێمانیدا کرایەوە بە ناوی

**«گالێری هونەرە جوانەکان» ەوە ..**

ـ گالێری بە پلەی یەکەم بۆ خزمەتی هونەرو هونەرمەندانی تەشکیلی نەتەوەکەمانە .. نەك تەنیا بۆ بازرگانی .. چونکە پیشانگایەکی بەردەوامی هونەری رەسەنی کوردییەو ، داهێنانە پوختەکانی هونەرمەندانمان ئەگرێتە خۆی .. نەك بەرهەمە بازرگانیو بازاڕییەکان .

ئەم هەنگاوەی گالێری ناوێتی بە پشتگیریو هاوکاری هونەرمەندانمان سەردەکەوێتو دەبێتە بنکەو مەلبەندێکی ئەوتۆ کە گشت هونەرمەندانمان کۆبکاتەوەو ، هەروەها ببێتە ئەو لایەنە سەرەکییەی کە ئەرکی کردنەوەی زوربەی پیشانگا هونەرییەکان بگرێتە ئەستۆ ..جا ئیتر پیشانگای هاوبەشی بێت یان شەخسی ..

لەم بارەیەوە یەکەمین هەنگاوی خۆی ناو بەپێی نەخشەی کارکردنی ، داوای لە لایەنە بەرپرسیارەکان کرد بۆ رێگەپێدانی بۆ کردنەوەی پیشانگایەکی گشتی هونەری تەشکیلی کوردی .. ئەمەش هەر لەو گوزەرەدا کە «گالێری» تێدایە بە مەبەستی ئەوەی هونەر بەشێوەیەکی میللیو راستەوخۆ بە جەماوەرەوە پەیوەست بێت .

بەم بۆنەیەوە «گالێری» بانگەواز بۆ گشت هونەرمەندانی تەشکیلی کوردمان بلاو دەکاتەوە لە سەرتاپای وولاتدا کە بەدەم ئەم بانگەوازە مانەوە بێنو هەریەکەیان بە یەك دوو تابلۆ ؛ یان کاری هونەری دیکەیان بەشداری ئەو پیشانگا فراوانە بکەن کە نیازوایە لە مانگی ئەیلوولی 1984دا بکرێتەوە ، خۆ ئەگەر فریاش نەکەوتن ئەوا تابلۆو کارە هونەرییەکانی دیکەیان لە گالێریدا جێگەی دیاریکراوی خۆی ئەگرێت .

(گالێری) داوا لە گشت هونەر دۆستو ئەندازیارو دیکۆرکیشە دلسۆزەکان دەکات کە لەمەودوا هەوڵ بدەن بۆ رازاندنەوەی گشت دارو دیواری هۆڵو یانەو پیشانگاو ئوتێلو چێشتخانەو دایەرەکان بە تابلۆی هونەری حەقیقی کوردی نەك هی بازاڕیو بازرگانی .

هونەرمەندانی «گالێری» ئامادەیی خۆیان دەربڕن کە بەوپەڕی کارامەییەوە کاری دیواربەندی (جداریات) و پەیکەرتاشی پۆرتریت بۆ هاوولاتیان راپەڕێنن .

«گالێری» بەتەنگ کارە هونەرییەکانی هونەرمەندانمانەوە دێتو بە مولكو سامانێکی میللەتی دادەنێت .. بۆیە بەڵێنو ناونیشانی ئەو هونەردۆستو کریارە دلسۆزانە وەردەگرێت کە بەپێی توانا لە فەوتاندن بیانپارێزن .

«گالێری» دەفتەری تێبینی نووسینی بۆ هاو وولاتیانو گەشتو گوزارکەرانی بێگانە ئامادە کردووە بۆ تۆمارکردنی باری سەرنجو پێشنیارو هەڵسەنگاندنیان بە هەرزمانێك بێت تا لە ئاکامدا چاپیان بکاتو بلاویان بکاتەوە .

«گالێری» حالی حازر سێ تابلۆی هونەری بەنرخی لایە کە بە ئەسەرێکی هونەری مەزن دائەنرێت لەپاڵ چەپکێ کاری هونەری بایەخداری دیکەدا .. نرخی ئەوسێ تابلۆیە لەوەدایە کە بەر لە 40 سال زیاتر نەخشەکێشراونو تا ئێستا پارێزراوە کە جێگەی راستەقینەی ئەو سێ تابلۆیە مۆزەخانەو دامو دەزگا بەرپرسیارە کوردییەکانە .. تاوەك هونەرێکی پێشەنگ بیپارێزنو وەك سامانێکی هونەری نەتەوەیی بمێنێتەوە .

لەکۆتاییدا پشتگیری کردنو بەتەنگەوە هاتنی «گالێری» لە لایەن هەموانەوە .. هەنگاوێکی هونەری کوردیمان سەردەخاتو دەیچەسپێنێ .

**بەڕێوەبەرانی گالێری**

**ناونیشان**

**گالێریی هونەرەجوانەکان ـ بازاڕی عەلی بۆسکانی ـ شەقامی مەولەوی ـ سلێمانی**











ئاری بابان

# هونەرو سەرەتای گەشەکردنی

لە سەرەتای مێژووەوە مرۆڤ هونەری زانیوەو دەستی پێکردووەو بە شێوەیەکی راستەوخۆو ناراستەوخۆ پەیوەندی هەبووە بەهەموو چالاکییەکانییەوە . مرۆڤی سەرەتایی بەهونەرو سیحر رووبەرووی ترس و تەنگو چەلەمەکانی بۆتەوە ، پێش ئەوەی بەتاقی‌کردنەوەو زانیاری رووبەرووی بێتەوە .

کۆنترین پاشماوەی مرۆڤ ئەو کارە هونەرییانەیە کە بۆمان ماوەتەوەو قۆناغی چەرخەکانی مرۆڤایەتی بۆ تۆمارکردووین و زۆر بەقولی لێی دەدوێت ، ئەو بەرهەمە هونەرییانە دادەنرێن بە کەلەپوری مرۆڤایەتی و دەتوانین مێژووی مرۆڤایەتی لەو بەرهەمانەدا بخوێنینەوە . بەڵکو هونەر پەیوەندییەکی وابەتینی لەگەڵ ژیانی مرۆڤدا هەبووە ، دەتوانین بڵێین تەمەنی هونەر زۆر لەتەمەنی مرۆڤەوە نزیکە .

لە ژیانی مرۆڤی سەرەتاییدا هونەر کارێکی تایبەتی ئەنجام دەدا ، یان بە جۆرێکی‌دی بڵێین هونەر لە ئەنجامی چالاکییەکی بێهودەی کاتی بێ‌ئیشیدا نەهاتۆتەکایەوە ، بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە ، دەبینین تاوەکو ئەو هۆزە سەرەتاییانە ، بەڵکو دواکەوتو ترینیان و ئەوەی لەهەموویان زیاتر عەودالی پەیداکردنی خۆراکە ، توانیویەتی جۆرە کارێکی هونەری ئەنجام بدات .

کەواتە دەتوانین بڵێین هونەر ئامانجێکی هەبووەو بەهۆی پێویستی مرۆڤەوە هاتۆتەکایەوەو کۆمەڵێک هۆش بونەتە هۆی نش‌ونماکردنی ، بەڵام باری ئابووری لە هەموو ئەوانی‌دی کاری گەرترەو پەیوەندی بەژیانی مرۆڤەوە زیاترە ، لەبەرئەمە باری ئابوری لەپێش هەموو ئەو کۆمەڵە هۆیەدا دێت کەهونەری هێناوەتەدی .

لە ژیانی مرۆڤی سەرەتاییدا هونەر پەیوەندیەکی بەتینی هەبووە لەگەڵ ئەو چالاکییانەی لە پێناوی پەیداکردنی خواردەمەنیدا پێی هەڵدەستاو ، مانەوەی زامن دەکرد .

مرۆڤ دەستی بە وێنەکێشان کردووە تاوەکو بتوانێت دەسەڵاتی بەسەر ئەو ئاژەڵو درندانەدا بشکێت کە وێنەی دەکێشا ، چونکە بڕوای وابووە ئەگەر بێت و توانای شکا بەسەر وێنەی ئاژەڵەکەدا ئەوە مانای وایە توانای بەسەر ئاژەڵەکەش‌دا دەشکێت .

هەروەها وێنەی ئەو ئاژەڵە دڕندانەی دەکێشا کە دەیبینی هێرش دەهێننە سەر ئەشکەوتەکەی ، یان دەیبینی مرۆڤێکی‌دی پارچەپارچە دەکەن‌و دەیخۆن .

بەلای ئەویشەوە دەسەڵات شکاندنی راستیش لە رێگای دەسەڵات شکاندنێتی بەسەر وێنەی ئاژەڵەکەدا ، بۆیە دەبینین وێنەی ئەو ئاژەڵانەی دەکێشا ، لەو کاتەی راوی دەکرد ، یان تیری پێوەیە پاش ئەوەی برینداری کردووەو توانیویەتی راوی بکات .

لەبەر ئەوەی راوکردن سەرچاوەی سەرەکی مرۆڤ بووە تاوەکو بتوانێت خواردەمەنی‌و پێویستییەکانی‌دی پەیدابکات ، هەموو چالاکییەکانی‌کەی هەوڵدان بووە لە پێناوی مسۆگەر کردنی سەرکەوتنی لە راوەکەیدا .

پێش دەرچونی بۆ راوکردن بەسەما لە راوکردنەکەی دەردەبڕی‌و لاسایی ئەو ئاژەڵانەی دەکردەوە کە هەوڵی راوکردنی دەدان ، یان لەسەر دیواری ئەشکەوتەکەیدا ، وێنەی دەکێشان ، ئەمانەش هەمووی لە پێناوی زامن کردنی سەرکەوتنی راوەکەی بووە .

هونەرمەندی ئەو قۆناغە سەرەتاییە سیحربازو فاڵگرەوەی هۆزەکەی بووەو هەوڵی‌داوە وورەی ئەو کۆمەڵە سەرەتاییە بەرزبکاتەوە ، تاوەکو بتوانن رووبەرووی ئەو سروشتە دڵ تەزێنەو ئەو ژیانە پڕ مەترسییەیان ببنەوە ، ئەمەش بەو وێنەو سەمایانەی لە راوکردنی دەردەبڕی‌و تواناو دەسەڵاتی مرۆڤی پێشان دەدان .



ئەمەش ئەوە دەگەیێنێت کە یەکەمین سیحرباز هونەرمەندی ئەو سەردەمە بووە .

ئامانجی هونەرو سیحر لاسایی کردنەوەی ئەو شتانە بووە کە لەدەوروبەری مرۆڤدا هەبووە ، ئەمەش لە پێناوی بەدیهێنانی مەبەستەکانی مرۆڤدا بووە ، هەروەکو دروستکردنی ئامرازو چەك بەلقی دارو پارچە بەرد .

وێنەو ئامرازێکی زۆریش هەن ئەوە دەردەخەن کەسیحر سەرچاوەو بنەمای یەکەمی هونەرە ، هەروەکو چۆن سەرچاوەی پزیشکیو بەشەکانی تری زانیارییە ، سیحربازەکەش هونەرمەندو پزیشكو زانای سەردەمەکەی بووە .

ئەمە وایکردوە ئەرکێکی زۆری بکەوێتە ئەستۆ ، ئەم ئەرك زۆرییەش بوتە هۆی دابەش کردنی ئەرکەکانو جۆرە پسپۆرییەك پەیدابێت .

تاوای لێهات هونەرمەند تەرخان کرا بۆ کاری هونەریو لە پێناوی کۆمەڵەکەیدا هەڵدەستا بەئەرکەکانی ، بەلام لە ژێر چاودێری سیحربازی هۆزەکەدا ماوەتەوە .

بەئیشکردنو هەوڵدان جۆرە شارەزاییەکی پەیدا کردو توانی بەشێوەیەکی وردو بەرێبازێکی جوانو ساکار ئەو وێنانەمان بۆ بنەخشێنێت کە تاکو ئێستاش جێی سەرسورمانی زاناکانی شوێنەوارو هونەرمەندانو ئەوانەیە کە چێژ لە هونەر وەردەگرن .

بەلکو بۆ یەکەمین جار کە ئەو وێنانەیان لە ناو ئەشکەوتەکاندا دۆزییەوە سەرسام بەرامبەری وەستانو بروایان نەکرد .

بەلام پاش ئەوەی لەچەندین شوێنیکەی جیهانو لەچەندین ئەشکەوتدا وێنەو پەیکەرو ئامرازی کەیان دۆزییەوە ، بەدڵ خۆشیو شانازییەوە بەرامبەر هونەری سەرەتایی وەستانو ، دانیان بەمەزنی ئەو هونەرەدا هێنا .

کۆمەڵێك لە هونەرمەندانی جیهان کەوتنە لێکۆڵینەوەی ئەو شوێنەوارە هونەرییە قەشەنگانەو زۆر کاری تێکردنو ، کەوتنە لاسایی کردنەوەیو زۆریان بۆ تابلۆکانیان گواستەوە .

هەندێکیان کەوتنە کۆچ کردنو وڵاتەکەیان بەجێ هێشت تاوەکو لەگەڵ ئەو هۆزە سەرەتاییانەدا بژین کەتاکو ئێستا لە خوارووی ئەفەریقاو لەچەن دوورگەیەکی دووردا ماون ، هەروەکو (گۆگان) کە کۆچی کرد بۆ دوورگەی تاهیتیو (ئەرنست بارلاخ) کە هونەری ئەفەریقایی زۆر کاری تێکردبوو ، هەروەها (بیکاسۆ)و .... چەن هونەرمەندێکی دی . ئەگەر بێتو سەرێك لەو مۆزەخانانەی ئەو ئامرازو پەیکەرانەی تێدایە بدەینو ، بەوردی لەو ئامرازانە بکۆڵینەوە کەمرۆڤ کۆن دروستی کردوونو ئێستاکە ماوەتەوە ، دەبینین ئامرازەکانیان هەردەم بەرەو باشترو جوانتر پەرەی سەندووە هەرلەبەر ئەمەشە کەدەڵێن یەکەمین هونەرمەند ئەو مرۆڤە بووە کەتوانیویەتی لەبەرد یەکەمین ئامراز بتاشێت . بەپەرەسەندنی ئەو ئامرازانەی مرۆڤ بەکاری دەهێنان هونەر پێش کەوتو پەرەی سەند ، چونکە ژیانی ئابوری گۆراو پەرەیسەند بەهۆی پەرەسەندنی ئەو ئامرازانەی بەکاریان دەهێنا .

پاش ئەوەی کۆمەڵگای کشتوکاڵی سەرەتایی دەرکەوت هونەر زیاتر پەرەیسەندو هونەری ئەندازەیی بەجۆرێکی سەرەتایی سەری هەڵدا .

لەو سەردەمەدا مرۆڤ قاپو قاچاخی دروست دەکردو بەوێنەو نەخش دەیرازاندەوە ، هەروەها هەوڵیدا ئەو ئامرازانەی لەکشتوکاڵی بەکاری دەهێنا پێشی بخاتو پەرەیپێبدات ، چونکە پێویستی بە ئامرازی باشتر هەبووە .

لەبەرئەوەی ژیانی کشتوکاڵی پێوستی بەخانوو کەپر بووەو ، واپێویستی کردووە ئەشکەوتو دارستانەکان بەجێبهێڵن تاوەکو خەریکی کشتوکاڵەکانیان بین ، ئەمە بوتە هۆی دروست کردنی خانوو پەرەسەندنی ، بێگومان ئەمەش دەبێتە هۆی پەرەسەندنی هونەری ئەندازەیی .

مەرجە لەژیانی کشتوکاڵیدا کۆمەڵێك پێکەوە کۆببنەوەو کارەکانیان پێکەوە ئەنجام بدەن ، ئەمە بوتە هۆی ئەوەی چەنبیرو باوەرێك بچەسپێتو ببێتە هۆی سەرەتایی دەرکەوتنی ئاینی سەرەتایی ، تاوەکو ئەو دیاردانەیان بۆ ڕاڤە بکات کەنەیاندەتوانی لێی تێبگەنو ڕاڤەی بکەن .

هونەرمەندیش زیاتر پیش کەوتو زیاتر چێژی لە هونەرەکەی وەردەگرتو ، زۆر جار تەنیا بۆ مەبەستی

وەرگرتنی خۆشی لە جوانیو جوانکاریدا وێنەی دەکێشا ، بەلام لەوە دوور نەکەوتەوە کە هونەر ڕێبازێکە لە پێناوی خزمەت کردنی کۆمەڵەکەیدا .

ئەو گەشە کردنەی لەناو کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا ڕوویدا بووە هۆی ئەوەی زیاتر مرۆڤ تواناى بەسەر سروشتدا بشکێت ، هەروەها بووە هۆی دروست بوونو دەرکەوتنی چینەکان لە کۆمەڵگاکەدا .

هونەریش لە یەك جیابووەو بووە چەن جۆرێك ، لە سەمای سەرەتاییو نواندنی بێدەنگیو گۆرانیدا دراماو شیعر سەری هەڵداو ، لەوێنەو ئەو ئامرازانەی لەبەرد دەیانتاشی ، هونەری تەشکیلی بەوێنە کێشانو پەیکەر تاشینو سیرامیکەوە سەری هەڵدا .

بەم شیوەیە دەبینین هونەر کۆنترین ڕێبازە مرۆڤ لەرێگایەوە لەخۆیو دەورووبەری دەربڕیوەو ، بەدرێژای مێژوو پێویستییەك بووە لە پێویستیەکانی مرۆڤ ، لەبەر ئەوەی یارمەتی دەدات تاوەکو بتوانێت لە جیهان تێبگاتو بیگۆرێت .

هونەر هەردەم هاندەرێك بووە پشتگیری مرۆڤی کردووە لە کارکردندا و یەکێکە لەبناغە هەرەگرنگەکانی شارستانیەتی مرۆڤایەتی لەسەر دروستکراوە .

هونەری ڕاستەقینەش ئەو هونەرەیە لە کۆمەڵەکەی دەردەبرێتو خزمەتی دەکات ، هەر وەکو چۆن هونەرمەندی ڕاستەقینە ئەو مرۆڤەیە کە کۆمەڵەکەی پێویستی پێیەتی ، چونکە لە بیرو باوەڕو ئامانجو واقیعەکەیان دەردەبڕێت ، ئەمەش وامان لێدەکات بلێین پێوستە هونەرمەندە بەهۆشمەندانە ئەرکەکانی سەرشانی جێبەجێ بکاتو خۆی تەرخان بکات لە پێناوی حزمەت کردنی مرۆڤایەتیدا .

سەرچاوەکان :


1 ـ عبدالكريم عبدالله . فنون الأنسان القديم ، أساليبها ودوافعها . بغداد ، 1973 .

2 ـ ثروت عكاشه . تاريخ الفن ، جـ1 . القاهرة ، 1971 .

3 ـ أرنست فيشر . الاشتراكية والفن . ترجمة أسعد حليم . بيروت ، 1973 .

4 ـ أرنست فيشر . ضرورة الفن . ترجمة أسعد حليم . القاهرة ، 1971 .


[ خالد دلێر ]

# مۆسیقە نەمرەکەمان

ئەگەر ویستت[1] بەختی[2] وولاتێك لەبارەی شارستانیەتەوە ، بزانیی کە چەندی بەبەرکەوتووە ، گوێ لەمۆسیقەی[3] ئەو وولاتە رابگرە »

هەرچەندە من بەتەواوی لەگەڵ ئەم قسەیەدانیم ، چونکە مۆسیقە هەموو شتێك نیيە لەژیانی میللەتاندا ، بەلام لەگەڵ ئەمەشدا ، مۆسیقەش یەکێکە لەئاوێنەی نواندنی ژیانی میللەتدا .

بەپێی ئەو بۆچوونەی پێشوو ، بائێمەش چاوێکی پشکنینیی بەپەلە ، بایی پڕکردنەوەی ئەو دەرفەتەی کەهەمانە ، بەمۆسیقەکەماندا بگێڕین ، شتێك لەمێژووی مۆسیقەکەمانو ئەو قۆناغانەی پێیاندا ڕۆیشتووە بگێرینەوە ، بەپێی بۆ چوونو لێکدانەوەکانی خۆمو ئەو بەڵگە کەمانەی کە لەسەر چاوەی دیکەوە دەستم کەوتوون ، هەندێ لەپێناسی مۆسیقەی ناوچەکان بخەینە بەرچاو .

ئەو گیروگرفتانەی لەبەردەمیدایە ، ڕوونیان بکەینەوەو چۆنیەتی زاڵ بوون بەسەریاندا ، بەپێی بارو دۆخو شوێنیو کاتی ئەمرۆ دەست نیشان بکەین .

هەندێ لە (خەوش = عەیب) ەکانی خۆمان بخەینە بەرچاو . خۆمان خەوشی خۆمان بلێین باشترە لەوەی کەخەلك بزگۆڕمان هەڵتەکێنن .

وەکوو دەزانین ، چ گۆرانی وتنبێ ، بەشی دەنگی لەقورگەوە دەرچووو جۆرەکانی وە چ مۆسیقە بێ ، بەشی دەنگی لەئامێری مۆسیقەوە دەرچوو جۆرەکانی ، هەردووکیان هەردەنگن . ئەگەر لەسەرەتای نووسینەکەدا کەمێك لەبارەی دەنگەوە بدوێین لەوانەیە شتێکی بەکەڵك بێ .

دەنگ ، سادەترین شێوەی دەربڕینی سۆزو هەستو جۆشو خرۆشو هەڵچوونو دامرکانەوەی مێشکو باری دەروونی مرۆڤی سەرەتایی بووە . ئەوکاتەی کە مرۆڤ خۆی وەك گیاندارێکی هەستیار دیوە ، رادەی هەست کردنەکەشی زۆر سەرەتاییو سادە بووە . بەر لەوەی « گۆرانی » بەسەرەتایی ترین شێوەی سەر هەڵدا ، دەنگ بەتەنیا ، دەنگ ، بەبێ شیعر ، بەبێ ئاوازێکی سنوور بۆکێشراو ، گۆرانی بووە .

دەنگێك ، یان بڵێین « گۆرانییەك !! » کەتەنیا مەرجی هەر ئەوە بووە ، کە شێوەی دەربڕینی لەدەنگی قسەکردنی ئاسایی ئەوکاتە جیابووە .

گۆرانی هەرە سەرەتایی مرۆڤ ، مرۆڤی هەرە سەرەتایی ، زۆر لەگۆرانی کەرو لاڵەکانی ئەم سەردەمەی خۆمان چووە . ئەو مرۆڤە سەرەتاییە ، کە ناخی جۆشی سەندووە ، بەقوڕگی هەندێ دەنگی دەربڕیوە ، وەکوو ووتم بەبێ شیعرو بوونی هیچ مەرجێکی دیکەی گۆرانی تێیدا ، کەبەلای خۆیەوە خۆش بووەو هەندێ لەو جۆشو خرۆشەی پێدامرکاندۆتەوە . بەرە بەرە لەوەوە گۆرانی سەرەتایی سەری هەڵداوەو خەڵك وەریان گرتووەو لەپاش ووتنەوەو ووتنەوەی ، هەر جارە ، یان پاش هەر ماوەیەك شتێکی تازەی پاشی تێکەوتووەو هەتا بووە بەگۆرانی تەواو .

بۆیە دەڵێم گۆرانی لەپێش مۆسیقەدا پەیدا بووەو ئەویان دایکی ئەمیانە . یان ئەگەر گۆرانیش هەر بەمۆسیقە بژمێرینو کە هەر دووکیان هەردەنگن ، دەڵێم : مۆسیقە لەپێشدا لەسەر شێوەی گۆرانی لەمێشكو دەروونو قوڕگی مرۆڤی سەرەتایی هەست جووڵاودا بوونی خۆی بەگوێچکەی خەڵکدا راگەیاندوە .

دەنگ هەر لەسەر هەڵدانییەوە ، تا کارتێکردنی لەئەندامو ئامێرەکانی بیستنو تۆمارکردن ، بەزمانی فیزیك زانەکان ، دوو واتە لەرێگەی ووشەی « دەنگ » ەوە رادەگەیەنێ : ـ « یەکەمیان : دەنگ دیاردەیەکی سروشتی : بریتییە لە لەرینەوەیەکی شەپۆلی کە لە ناوەندێکی هەواییدا بڵاو دەبێتەوە لەئەنجامی لەرە لەر (تذبذب) ی تەنەجیرەکان (الاجسام المرنە) دا پەیدا دەبێ کە لەرینەوەی ژێیەکان (الأوتار) نموونەیە .

شەپۆلە دەنگییەکانی هەوا لەسەر شێوەی لەرینەوەیەکی درێژی دەبێ (شەپۆلی درێژرۆ = موجة طويلة) کە تەشەنە دەکاو بڵاو دەبێتەوە بەهەموو لایەکی چواردەوری ئەو تەنەی کە هۆکاری دەنگەکەیە (یان کە چاوگەی دەنگەکەیە) کە بەمەش دەبێتە هۆی دروست بوونی (پەستاوتنو شاش بوونی) رێك لەناوەندە هەواییەکەدا . دووەمیان : دەنگ وەك هەستێك کە کۆئەندامی بیستن لەلایەن مرۆڤەوە لەرێگەی کارتێکردنی بەهۆی کاریگەرێکی دەرەکییەوە لەئەنجامی لەرینەوەی شەپۆلە دەنگییەکانەوە هەستی پێدەکا[4] .»

دەبێ سەرچاوەیەکی گەلێ زۆر بپشکنینو لێکۆلینەوەیەکی گەلێ قووڵو وورد بکەین بۆ ئەوەی بزانین لەچ رۆژگارێکی دێریندا گۆرانی کوردی ، وەك گۆرانی سەری هەڵداوە کە بێگومان گەلێك لەپێش سەر هەڵدانی ساڵ ژمێری کوردییەوە بووەو دەبێ گەلێك لەپێش ئەو مێژووەوە دەست پێبکرێ . ئەم لێکۆلینەوەیە سەختو دژوارە ، لەگەل ئەم راستییەشدا ، ئەنجامێکی هەر بۆ دەبێ . بۆیە ئەمە وەك پرۆژەیەك ، با لەتوێی ئەم لاپەرەیەدا بنوێ هەتا دلسۆزێکی بۆ هەڵدەکەوێو دەیگرێتە ئەستۆی خۆیەوە کە هەتا مانای راتە هەڵدەگرێ سوار چاکی ئەم مەیدانە بێ .

بەلام ئەگەر ئەم مەسەلەیە ، وەك پرسیارێك ، بۆزانینی سەرەتای مێژوویی پەیدابوونی ئامێری مۆسیقەی کوردی ئاراستە بکەین ، ئەوا مامۆستایەکی زمان زان وەرامان دەداتەوەوە دەڵێ :

« بۆ وەرامی ئەم پرسیارە ، دەبێ پەنا بەرینە بەر ئامرازێکی مۆسیقی خۆمانە کە کۆنترین ئامرازی مۆسیقایەو ئەگەر بڵێم شوانانی کورد دایان هێناوە رەنگە لەراستی لام نەدابێ ، ئەو ئامرازە (بلوێرە) . هەموو دیومانەو دەزانین کە لەقامیش دروست دەکرێو حەوت کونی تێدایە ، بلوێرژەن قامکی لەسەر کونەکان دادەنێو فووی پێدا دەکاو بەگواستنەوەی پەنجەی لەسەر کونێك بۆکونێکی تر یازۆرو کەم لابردنی قامك لەسەر کونەکان دەنگی جۆر بەجۆر پەیدا دەبێو هەر ئاوازو نەغمەیێکی مەبەستی بێ دەیژەنێ . »[5]

منیش لەگەل بۆچوونەکەی مامۆستا زەبیحیدامو

ئەمەندەش زیاد دەکەمە سەری کە :ـ « لەوانەیە ئەو مرۆڤەی بلوێری سەرەتایی داهێناوە ، ماوەیەکی دوورو درێژ لەنزیک قامیشەلان و بێشەلاندا ژیابێ و زۆر جار گوێی لە جۆرە دەنگو ئاوازێکی وەك فیکە فیك و گیفە گیف و دەنگی دیکەی لەم چەشنە بووبێ لەکاتی هەڵکردنی بای تونددا لەقامیشەکانەوە دەرچووبێ و لەئەنجامی دووبارەو چەند بارە بوونەوەی ئەو دیاردەیە لەبەر گوێی و لەبەر چاوی دا ، بۆ ئەوە چووبێ کە قامیش ئەگەر بای توندی پێدا بکرێ و پاش ماوەیەکی دی زەینی بۆ فوو پێدا کردن چووبێ ، کە لەوانەیە ئەو دەنگە خۆش و نائاسایی یەی لێ دەربچێ و بەرە بەرە مێشکی پێوە خەریك کردبێ و هەوڵی لەگەڵدا دابێ هەتا گەیشتۆتە داهێنانی ئەم ئامێرە گرنگ و سادەیە ، کەسادەترین ئامێری مۆسیقەی کوردی و بگرە هی هەموو ئامێرێکی دیکەش بێ ، کەشۆرشێکی گەورەی لەجیهانی مۆسیقەدا کردووە . »

دەنگی بلوێرو شمشاڵ ، کەئەمیش زادەو پێشخستنی بلوێرە ، خۆشترین دەنگی هەموو ئامێرەکانی مۆسیقەیە بە گوێی زوربەی خەڵکی کوردستان ، بەتایبەتی چیاو شاخ و دوڵ و نشینەکان ، ئەو خەڵکەی کەکەمتر لە خەڵکی تر ، زەوقی مۆسیقەیان ژەنگی هەڵهێناوەو رەسەنایەتی زەوقی مۆسیقەی کوردی زیاتر پێوە ماوە . ئەم خەڵکە بەلایانەوە دەنگی بلوێرو شمشاڵ حەلالەو هیچ ناپیرۆزی و شوومی یەکی پێوە نی یە . ئەمە لەکاتێکدا کە دەنگی دووزەلە[6] ، کە ئەمیش ئامێرێکی مۆسیقەیەو لەزەل و قامیش دروست دەکرێ بەحەرام و ناپیرۆز دادەنێن .

بۆ ئەوەی بزانین باوك و باپیرانمان چ ئامێرێکی مۆسیقەیان لەسەر دەمی خۆیاندا بەکارهێناوەو چی یان لەبارەی مۆسیقەوە گوتووە ، ناچار دەبێ بگەرێینەوە سەر تاکە سامانی پاریزراوی نەتەوایەتیمان کە هەر لەسایەی مان و خۆراگرتنی کورد خۆیەوە ، هەندێکی لەناو نەچووەو بۆمان ماوەتەوەو دەماو دەم بەئێمە گەیشتووە . ئەویش قسەی پێشینان و ئەو بەشەی کەلەپوورە کە لەبارەی مۆسیقەوە دواوە .

لەقسەی پێشینان و لەهەندێ هۆنراوەی کۆن و تازەدا هاتووە : ـ

(1) **کەهات دەنگی دەهۆڵێ ـ پیرەژن نەگەیشتە کەچە سۆڵێ**[7] واتەکە دەنگی دەهۆڵ هات ، کەئامێرێکی کۆنی مۆسیقەیە ، پیرەژن بەوە رانەگەیشتووە کە کۆنە سۆڵەکەی بەسەر پێوە بکاو بچێتە دەرەوەو بزانێ ئەو دەنگە لەکوێوەیەو هەر بەبێ خاوسی رایکردووەو بەدوا دەنگەکە داچووە . ئێستەکە . تیپی مۆسیقە هەیە ، دەهۆڵ لەتیپدا ئیشی ئەوەیە کە ئاوازەکە ، یان دەردی جاران ووتەنی ئەزمی گۆرانیەکە رابگرێ ، بە عەرەبی بەم فرمانەی دەهۆڵ دەڵێن (إیقاع) . ئەم ئامێرە ، خێرایی بەشەبچووك و کورتەکانی ئاوازەکە رادەگرێ و بەیەکەوەیان دەگونجێنێ و دەچەسپێنێ و کوکەرەوەی هەموو ئاوازو بەشەکانیەتی لەیەك حال و کاتدا ، وە لەئاوازێکی رێك و پێکدا .

لەبەر ئەوەی ئەم ووشەیە ، تائێستاش هەر بەعەرەبی لە ناوماندا دەگوترێتەوە ، بۆیە من بە (ئەزم راگر) کە ئەمیش کورت دەکرێتەوە دەبێ بە (ئەزمگر = ایقاع) ی دەکەمە کوردی . هەرچەندە لەمەبەستەکەش دەرچووم ، بەلام بۆ ئەم تێبینی یە ، جێگەیەکی لەبارترم دەس ناکەوێ ، بۆیە لێرەدا دەرم بری ی .

(2) **دەنگی دەهۆڵ لەدوورەوە خۆشە ـ لەنزیکەوە گوێ ئازار** دەداو لەگەڵ هەموو لێدانێکی‌دا ، بەو دەنگە گەورەیەی کە هەیەتی دڵ دادەخورپێنێ بۆیە لە نزیکەوە ناخۆشە .

(3) **مار بەفیکە لە کون دێتە دەرەوە** ـ فیکە ئاوازێکە بەئەندامەکانی دەم و لێو لێ دەدرێ مەبەست ئەوەیە کەمۆسیقە ئەوەندە خۆشە ، تەنانەت ماری پێ لەکون دەهێندرێتە دەرەوە .

(4) **بەدەکەس نەدەچووە شایی ، کەدەشچووە شایی بەدەکەس نە دەهاتە دەرەوە** ـ دەڵێ ئەو کەسە ئەوەندە ووشك و کەم زەوق بووە حەزی لەشایی نەکردووە ، بەلام کە بەزۆر بردویانەتە ناو شایی یەوە ، لەبەر خۆشی شایی و دەنگی دەهۆڵ و زورنا کەو جوانی و شۆخوشەنگی دۆیەکانی ناو شایی ، یان خۆشی دەنگ و گۆرانی شایەرەکان[8] بەزۆریش لە شایی یەکە نەهاتووەتە دەرەوە .

(5) **لێدە لەبلوێرەکە ـ نەمانکام دەوێ نەگوێرەکە** ـ ئەم قسەیە چیرۆکێکی هەیە ، ئەگەر نەیگێرینەوە خۆشی و گرنگی قسەکەمان بۆ دەرناکەوێ کە ئەمەی خوارەوە چیرۆکەکەیەتی و بەزمانی خۆم دەیگێرمەوە .

لەدێیەکدا ، ئێوارەیەك گـاڕانی ئاوایی دەگـەڕێتەوە نـاودێ پیرەژنێـك مـانگـاکـەی دەگـەڕێتـەوە مـاڵەوە بـەڵام گوێرەکەکەی نا . هۆی نەگەڕانەوەی گوێرەکەکە لەگاوانـەکە دەپرسێ ، ئەویش پێی دەڵێ کەلەکاتێکا ئەم بلوێری لێداوە ، گوێرەکەکە ئەمەندە هەڵپەڕیوە هـەتا مـردووە . کوڕە بـاوکت چاك ، دایکت چاك چۆن ئەمە دەبێو کەی ئەوە بووەو نەخێر وەرامی گاوان هەر ئەوە دەبێ .

ماوەیەکی بەسەردا تێدەپەڕێ ، ئێوارەیەك چاوەڕوانی گەڕانەوەی مانگاکـەی دەکا دەبینێ لەپـاش ئاژەڵو وولستی هەموو خەڵکیدا وا بەشەلە شەل دێتەوە . پیرەژن بۆسۆراخی هـۆی ئەمـەش دەچێتەوە لای گـاوانەکـەو دەپرسێ ، ئـەدی ئەمەیان لەبەرچی ؟ گـاوانْ هەمـان هۆی جـاری پێشوو بـۆ ئەمەشیان بەپیرەژنەکـە رادەگەیـەنێ . پیرەژن بـە وەرامی گاوانەکـە رازی نابیو دەچێ لە لای قـازی شاری سکـاڵای لەدەس دەکاو قازی دەنێرێ بەدوای گاوان داو هۆی مـردنی گوێرەکەکەو قاچ شکانی مانگای داپیرەی لێ دەپرسێ ،گاوانەکە هەر هەمان قسەی لەلای ئەمی کردوە لەلای قازیش دەیکاتەوە قازیش بەقسەی گاوانەکە باوەڕناکاو دەڵێ ئەمە وانییەو داوا لەگاوانەکە دەکا هەندێ بلوێر لێبا تابزانێ ژەنینەکەی چۆنە . گاوانەکە فوو بە بلوێرەکەدا دەکاو قازیو پیرەژنو هەرکێ لەوێ دەبێ هەڵدەستن دەست دەگرنو دەکەونە شایی کردن . پاش هەندێ گاوانەکە شمشاڵەکە دەخاتەوە بەرپشتێنیو پیـرەژن داوای بلوێر لێدان لەگاوانەکە دەکاو پێی دەڵێ :

لێدە لەبلوێرەکە نەمانگام دەوێ نەگوێرەکە .

(6) لەپیکیش دەداو لە ماپیکش دەدا
هەندێ ئامێری مۆسیقە، وەك زوڕنا ، باڵەبان ، دووزەلە ، پیكو ماپیك ، یان نێرەو مێیەیـان هەیـە . مەبـەست لەو قسەیە ئەوەیە کەکابرای مۆسیقـەژەن ئەوەنـدە چازانـە[9] لەویش دەداو لەمیش دەداو لەهیچ کاتێكدا پەکی ناکەوێ .

دەڵێن : ئـاییني ئیسلام ، بـەکـارهێنـانو گـوێ راگـرتن لەو ئامێرانەی پەسنـد نەکـردوە . ئەوەی شـایانی ووتنـە لێرەدا ئەوەیە کە تاکە جیاوازی لەنێوان ئەم ئامێرانەو ئامێرەکانی تری وەك بلوێر یان شمشاڵ تەنیا لەوەدایە ، کـە جۆری دانـانیان لەنێوان لچو لێوو جۆری فوو تێکردنو ئاواز لێ دەرهێنانەکەی وادەخوازێ کە نێرەو مێیەیان هەبێو هیچیتـر لەبەر ئـەوە ئاوازی ئەمانە لەلانی پاکیو ناپاکییەوە ، هیچ جیاوازییەکیان نییە لەگەڵ ئاوازی ئامێرەبێ نێرو مێیەکانـدا . ئاواز هـەر ئاوازە ، چی هی ئەم دوو چەشنە ئامێرەوە چ هی ئامێری ژێ دار .

(7) یـەکێك لەپیـاوەکانی ئینگلیـز لەبەغـدا ، لەبەهـاری ساڵی 1932 بە قەسری شیریندا تێدەپەڕێ ، گـوێی لەشمشاڵ ژەنێکی کورد دەبێ کە شمشاڵ لێدەدا ، دەنووسێ :

« قەسری شیرین دڵتەنگ خۆی دەنواند ، ئەوەی ئەم بـاری سەرنجەی لە دڵی مندا بەهێز کردبـوو ، هەوررو تـەمەکـە بوو لەگەڵ ئەو نـاڵە ناڵەی کـە لە دوورەوە لەشمشاڵی ، شمشـاڵ ژەنێکی کوردەوە دەهات[10] . »

(8) جگە لەو قسانەی پێشینان ، لە شیعری شاعیری سەدەکانی هەڤدەهەمو (بێگومان هی هەژدەهەمیش وەلەبەر ئـەوەی نموونەم لەشیعـری ئەمـاندا نـەهێناوەتـەوە ، لەناو ئـەم دووکـەوانـەیـەدا ، لەئـەوانی دیکـەم جیـاکـردەوە) هی نۆزدەهەمدا ، هەندێ جار ناوی ئامێرەکانی مۆسیقەی ئەو سەردەمە هاتووە . وەکوو : ـ

ـ بێ ووڕتە دڵم بناڵێ وەك چەنگ[11]
بێ پەنجەوو پت دەفم بدا دەنگ[12]
ـ دڵ تەنگە دەدەنگی زیرو بەم بێ[13]
دڵداری لەلانی زینو مەم بێ
ـ بلوێری دڵم بەداخو سۆبێ
وەك تووتی دڵم بەکوفتو کۆبی[14]
ـ سەرم (سەنتوور) و سینەم (چەنگ) و دڵ (دەف)
خەفەت یارو مەقام نالینە بێ تۆ[15]

(9) هەروەها لەشیعری شاعیرەکانی نەوەیەك لەپێش ئێستادا ، زۆر جار ناوی ئامێری مۆسیقە هاتووە . وەکوو : ـ

وا گلۆڵەی کەوتە لێژی باوی ئیستیعمار نەما
هیچ کەسێ ئیتر بەزوڕناو دۆڵی ئەو هەڵناپەڕێ[16]
دەنگی نەکیساو بەزمی خەسرەوی
لای مەحموود پاشا ئەکەوتە نەوی
ئاوازی سەقرو بازو باڵەبان
حیلەی ماینی جنسی کەحێلان
ئەمانە هەمووی خوا دابووی بەجاف

حوکمدارێك بوون بێ لاف و گەزاف[17]
- بروانە ، شایی یە ، چۆپی یە لەماڵە
گوێ بگرە ، دەهۆڵە ، زوڕنایە ، شمشاڵە[18]

لەم چەند لاپەڕەیەی پێشوودا بۆمان دەردەکەوێ کە :

(1) کورد لەدێر زەمانەوە ، لەئامێرەکانی مۆسیقە ، بلوێر ، دەهۆڵ ، شمشاڵ ، باڵەبان ، دەف ، چەنگ[19] سەنتوور ، زوڕناو ، ئامێری دیکەشی بەکارهێناوە یان دیونی ی .

(2) زۆربەی ئەو ئامێرانەی مۆسیقەکە لەناو کوردا بەکارهێنراون ئەوانە بوون کە بەفوو تێکردن ئیشەکانیان ئەنجام دەدەن ، زیاتر لەئامێری ژێ دار . ئەوەمان لەبیرنەچێ بیڵێین کە بلوێرو شمشاڵ ژەن و زوڕناو باڵەبان ئەنگێوەکان ، ئەوانەی بەبێ خوێندن و تەنیا هەر بەهەوڵی خۆیان فێری بەکار هێنانی ئەو ئامێرانە بوون ، لەکاتی بەکارهێنانیاندا ، یەك بێن ، بەپسانەوەو دەم هەڵگرتن لەسەر ئامێرە کە ، بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ ئەو ئامێرانە لێدەدەن و (پشووی تێدا دەخۆنەوە) واتە لەکاتێکدا کەفوو بەو ئامێرانەدادەکەن هەر لەهەمان کاتیشدا هەناسەش وەردەگرنەوە ، بەبێ ئەوەی مۆسیقە لێدان و ئاوازەکە تەنانەت بۆ یەك چرکەش بێ بووەستێ . ئەم ئامێر ژەنانەی کوردستان وەهان . جا نازانم هی میللەتەکانی دیکەش وەهان یان نا ؟ لەبەر ئەوەی من سەرنجم بۆ ئەم لانە نەداوە ، ئەم پرسیارە دەکەم .

ئەو مۆسیقە زانانەی لە خوێندنگاکاندا ، فێری بەکارهێنانی ئەو ئامێرانەدەبن ، پەی بەم کردارە نابەن و ئەمان لە کاتی بەکارهێنانی ئەو ئامێرانەدا ، دەمیان لەسەر هەڵدەگرن و هەناسە وەردەگرن و ئاواز لێدانەکە بۆ ماوەیەك دەوەستێ .

بێگومان لەسەرەتای دروست کردنی ئامێری مۆسیقەدا ، کە بۆیەکەم جار لەژیانی مرۆڤدا ، لەلایەن مرۆڤ خۆیەوە ، ئامێری مۆسیقە دروست کراوە . ئەم ئیشە بەداهێنانی شتێکی بەکەڵك و باش و خۆش لەقەڵەم دراوەو خەڵك پێشوازی لێکردووە .

ئەم هەنگاوی داهێنانی یەکەم ئامێری موسیقەیە ، من وای بۆ دەچم کە لەقۆناغی پاش دابەش بوونی کۆمەڵی سەرەتایی مرۆڤ بەدوو چینە سەرەکی یەکە (خوێن مژراو - خوێن مژ) و دابەش بوونی ئیش و کار نرابێ . هەروەها ئەم داهێنانە لەئەنجامی سەرنجی ووردو ئەشکەنجەی قووڵی دەروونی و بەرهەمی زەین و مێشکی ژیری ئیشکەرەکانەوە بووبێ .

وەکوو گوتم لەسەرەتای داهێنانی دا ، مرۆڤ ، هەموو مرۆڤی ئەو کۆمەڵە ، پێشوازی گەرمیان لێکردووە ، بەلام لەدواییدا کە چینی چەوسێنەرەوە ، خاوەن بەرژەوەندی ڕاستەوخۆ لەبەرهەم و ئیشی ئیشکەرەکاندا ، دیویەتی ئەمە لەسەرێکەوە تارادەیەك ، ڕێگە لەئیشی ی ئابووری لەبەرچاو دەگری و بەرهەم و دەسکەوتی خۆیان کەم دەکاتەوەو لەسەرێکی دیکەشەوە ئەوان وەك ئیشکەرەکان ووردو ژیرنین لە فێربوون و بەکارهێناندا ، ویستوویەتی سنوورێکی بۆ دابنێ و جۆرە بەر بەرەکانیەکی کردووەو هەوڵی داوە ئەوانەی بەمۆسیقەوە خەریکن لەناو کۆمەڵدا بیان شکێنێ و قسەو قسەلۆك ، بەپێ ی ئەقلیەتی ئەوکاتەی خەڵك بۆخۆیان و ئامێرەکانیان هەڵبەستن . تەنانەت پەنایان بردۆتە بەر ئایینەکانی ئەو سەردەمەش ، کە ئەوانیش هەر لەخزمەت کردنی ڕژێمە ئابووری یەکاندا بوون ، لەڕێگەی ئەوانیشەوە هەر بەربەرەکانیان کردوون .

لەگەڵ ئەم بەربەرەکانیە جۆراو جۆرەش دا ، وەلەبەر ئەوەی مرۆڤ لەڕێگەی تاقی کردنەوەی خۆیەوە گەیشتووەتە ئەو بڕوایە کەوا ، مۆسیقە ، دەتوانرێ خزمەتی مرۆڤی پێ بکرێ و لەڕێگەی بەختیاری خۆیدا کەڵکی لێ وەربگرێ ، مۆسیقەو ئامێرەکانی و گۆرانی ووتنیش ژیاون و گەشەیان کردو بەرە بەرە بۆ پێشەوە چوون . ئامێرە سەرەتایی یەکان ، گەلێ ئامێری مۆسیقەی باشترو لەبەکارهێناندا ئاسانترو بەکەڵك تریان لێکەوتەوەو ، لەگۆرانی دا ، گۆرانی هەمە جۆرەو هەمە بابەت پەیدابوون .

ئەم دژایەتی یە لەگەڵ مۆسیقەو گۆرانی دا ، لە ئایینەکانی کۆنەوە بۆ ئاینی ئیسلامیش مایەوەو لەمیشدا سەری هەڵدایەوە

فارسەکان لەپێش ئیسلام بوونیاندا ، ئایینی خۆیان هەبووەو مۆسیقەی پاش ئیسلام بوونیان لەپاش ماوەی مۆسیقەی سەردەمی ئەو ئایینەوە بۆ ماوەتەوە . (د . محمود احمد الحفنی) لەم بارەیەوە دەڵێ : -

« عەرەب لەسەر ڕەسەنایەتی خۆی سوور بوو ، شانازی پێوە دەکرد . هیچ پیشەیێکی نەدەگرتە خۆیەوەو هیچ ئیشێکی

نەدەکرد ئەگەر پیرۆزو جێگەی ڕێز لێگرتن نەبایە . لەبەر ئەوە پیشەی مۆسیقەزانی ی کە یەکێك بوو لەو هونەرانەی لەوکاتەدا بەچاوی سووك سەیری دەکرا ، زۆر کەم نەبێ نەیان کردووە بەپیشە . بۆ دەست و پێوەندو کڕاوەکانیان هێشتبووەوە . هۆی ئەمەش ئەوە بوو کەپێوەندی لەنێوان عەرەب و فارسەکاندا بەهێز بوو ، دیتیان کە گۆرانی بێژی لەناو ئەواندا ، پیاوە ماقوولەکانیان نەیان کردووە بەپیشەی خۆیان لاسایی ئەوانیان کردەوەو شوێن پێی ئەوان کەوتن لەسەردەمی نەزانیندا ، واتە پێش پەیدابوونی ئیسلام ، گۆرانی بێژی تەنیا بەسەر ئافرەتە کڕاوەکاندا دابڕابوو ، هەر بەم جۆرە مایەوە هەتا سەردەمی خەلیفە گەورەکانی عوسمانی ، کە کوڕانیش دەستیان کرد بەگۆرانی گوتن و کردنی گۆرانی بێژی ی بەپیشە . واتێ دەگەم کە عەرەب لەمەشدا هەر لاسایی فارس و تورکەکانیان کردبێتەوە . لەوسەردەمەدا گۆرانی بێژە پیاوەکان لەزۆر هەلس و کەوت و نەریتەکانیاندا لە ئافرەتەکان دەچوون[14] . ئەوەی راستی بێ شتێکم بەدەس نەکەوت ، کەئایینەکانی پێش ئیسلام لە کوردستان لەبارەی مۆسیقەوە ، وەکوو شتێکی تایبەتی بێ بەکوردستان ، هەلوێستیان چۆن بووبێ . بەلام لەیادمە ، لەجێگایەکدا خوێندومەتەوە کەزەردەشت[15] ، وەك مرۆڤێك ، حەزی لەگۆرانی و مۆسیقە کردبێ . ئەمە هەرچەندە ناشێ وەك بەلگە باس بکرێ . بەلام ئەمە ئەگەر لەچوارچێوەی سروشتە جوان و خۆشەکەی کوردستاندا بهێنینە بەرچاو ، شتێکی سەیرو نامۆنی یە[16] .

بەلام ئەوەی نامۆو سەیرو ئەنتیکەیە لەگەل سروشتی کوردستانی ، خۆش و جوان و گونجاو لەگەل سروشتی مۆسیقەو ئاوازی قوول و داهێناندا ، ئەو بارو دۆخە پڕ لەناڕاستی و قسەو قسەلۆکە بی ڕێ و جێیە یە ، کە لەکۆنەوە ، دەستی پێ کردووە ، وەکو شتێکی گشتی لەناو مرۆڤایەتی دا ، وە بۆنێمەی کوردیش ماوەتەوەو تائێستاش پاشماوەی هەر ماوە ، کەگوایا گۆرانی بێژی و مۆسیقە زانی و بەکارهێنانی ئامێرەکانی ، شوورەیی و سووکایەتی لەدوایە . ئەم دیاردەیە ، ناڕاست و نازانستی یە ، گەلێ زیانی لەهەموو ڕوویەکەوە بەباری مۆسیقەو گۆرانی کوردی ڕاگەیاندوەو وای کردوە گەلێ لاو لەهەردوو ڕەگەز بەتایبەتی لەڕەگەزی ئافرەتدا ڕوو لەجیهانی گۆرانی و مۆسیقەی کوردی وەرگێڕن و ئارەزووی پڕ لەجۆش و خرۆشی مێشك و دەروونیان ، بەزۆر لەخۆکردن و بەناچاری دامرکێننەوەو بەزیانی گەورەی هونەری لەسەر نەتەوەکەمان و هی زۆری تەندروستی لەسەر خۆیان بکەوێ .

نەك هەر ئەم بەسەدان ، بگرە بەهەزاران لاوانەی لەسەرەتادا ، بەداخ و ئازارو پەرۆش و خۆکوشینی زۆرەوە خۆیان لەجیهانی هونەری گۆرانی و مۆسیقەی کوردی دوور خستۆتەوە ، بەلکوو کەسانی تریش کە تەمەنێکی زۆریان لەناو ئەم جیهانە بەرفراوانەدا بەسەر بردووە ، ئەم جیهانە کاری کردۆتە سەریان و ئەمانیش کاریان کردۆتە سەری ی ناوو ناوبانگی گەورەو ڕێزگرتنی زۆریان لەسایەی ئەوەوە دەسکەوتووە ، پاشی ئەم هەموو پەیوەندی یە ، ئەمجا لێ ی دوور کەوتوونەتەوەو تواناو بەهرەکانیان لەژێر خۆلەمێشی قسەی پڕو پووچدا دامرکاوەتەوەو مردووە .

لەمانە گۆرانی بێژی دەنگ خۆش کاك (محمود محمد شابان) کە لە ئیستگەی بەشی کوردیدا گۆرانی یەکانی بەم ناوەوە پیشکەش دەکرا . هەروەها هونەرمەندی بەناوبانگ کاك (حمە صالح دیلان) ، ئەم دووانە بەکشانەوەیان لەم جیهانەو واز هێنانیان داخێکی گەورەیان بەدلی خەلکەوە ناوە . کاك (حمە سالح) بەخۆی ووتووە کە گۆرانی بێژ لەلای خەلك « لۆتی » یەو .... بۆیە ئەم وازی لەگۆرانی ووتن هێناوە . سووربوونەکەشی لەسەر ئەم رایە بەرادەیەك بوو کە نەی دەهێشت گوێ لەقسەی کەس بگرێ کە مەبەستی بەر پەرچ دانەوەی ئەم رایەبێ و بیەوێ گوفت و گۆی لەگەلدا بکا .

ئەمڕۆ ڕادەی تێگەیشتنی خەلکی گەیشتۆتە پلەیەك ، کە رایەکەی من زۆربەی خەلك لەلای ڕوونەو پێم ناخۆشە هەر باسی بکەم ئەگەر ناچاری نەبێ . بۆیە دەلێم ئەم جۆرە هەلوێستە راست نی یەو هەلەیەو هەلە بەهەلە راست کردنەوەیە !! کە ئەمە ناشێ و نابێ ببێ .

لەم ڕووەوە هەلوێستی راست و دروست ئەوەیە کە هەموو لایەك بەقسەو بەنووسین و بەگۆرانی گوتن و مۆسیقەو ئاواز دانان و بەهەموو شتێکی دیکەو لە هەموو مەیدانێکی دیکەدا بەر پەرچی ئەو هەلوێستانە بدرێتەوەو هی ئەو کەسانەش کە گۆرانی گوتن و کردنی مۆسیقە بەپیشە بەسووك دادەنێن . ڕۆشنبیری یەکی راستی مۆسیقە لەناو کۆمەلدا بلاو بکرێتەوە . ئەم راستی یە لەبارەی ئەم دیاردە ناشیرینەوە هەر بەمەندە لێ

ناگەرێم لەجێگایەکی دیکەدا لەبەشێکی تری ئەم نـووسینەدا دەگەڕێمەوە سەری هەوڵ دەدەم مافی خۆی بدەمێ با ئەوەش بلێم کەئەم دیاردەیە لەسایەی هەوڵ و تێکۆشانی هونەرمەندان و هۆشیار بوونەوەی خەڵك و پێشکەوتنی زانیاری و هەست کردنی جەماوەر بە گرنگی ئەم لانە لەژیانی دا ، دەتوانم بلێم کەلەشارە گەورەکاندا نەماوە ، بێ گومـان ئەم دیـاردە ناراستـە لەگەڵ سـروشتی مۆسیقـە بەخش و دەروون پـڕ لەئـاوازو گـۆرانی کـوردستانـدا ناگـونجێ . یـان بـەواتـەیـەکی دی ، ئـەمـە لەسروشتی کوردستانی رەنگیندا هەڵنەقوڵاوە ، بەڵکو لەم لاو لەو لاوە بۆی هاتووەو بەسەری داسەپێنراوەو لەدوایدا پـاش ئەوەی ماوەیەکی دووروودرێژلەم بارەی دوایی دا ژیاوە ، ئەمجا ئەم بارەی لەناودا چەسپیوە .

ماوەیەك لەمەوبەر (د . محمود احمد الحفنی) پێ ی ووتین کە ئەو دیاردەیە لەناو عەرەبەکاندا بـڵاو بوو بـووەوەو ئەوانیش لەفارسەکانیان وەرگرت . ئەمە بەلای منەوە راستەو بۆیە دەڵێم کە ئەو دیاردەیە لەپاش بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام بەزەبری شیرلەناوکوردەکاندا ، کە شەرە گەورەکانی دەوروپشتی کۆیە لە هەرموتەو دوڵی ئەسحابان بەڵگەن بۆ ئەم راستی یە ، ئەوجا ئەو دیاردەیەش لەرێگەی عەرەبەکانەوە گەیشتە کوردستان . هونەری ئایینیەکە بەرە بـەرە تەنگی بـەگۆرانی و مـۆسیقەی کوردی و ئامێـرەکانی هـەڵچنیو ئـەمان بـەرە بەرە مـەیدانی فرەوانی جارانی خۆیان بەجێ هێشت و پاشە کشێ یان کرد بەرەو ئەو جێگا دوورو پارێزراوانەی کەهونەری ئایینە تازەکە دەستی نـەدەگەیشتێ و چـاوەڕوانی هەل و دەرفـەت بوون بـۆ سـەر هەڵدان و خۆ نواندن .

زۆر جار هەوڵی داوە شان بەشانی گۆرانی ئایینی خۆی دەرخا ، وەك ئەوە کە لەمەولوود نامە خوێندنـەوەدا ، لەپاش ووتنی گۆرانی یە ئاینییەکان وەك تەنزیلەو شتی تر ، گـورانی کوردیش گوتـراوە . ئەگـەر ئەمـەی بۆ نـەکرابێ ، کـۆششی کردوە ، لەژێرسایەی ئەو گۆرانیـە ئاینی یـانەدا جمـوجوڵێك بکات و خۆی لەگەڵ ئەواندا تێك هەڵکیش بکا . وەك ئەوەکە ، هونراوەی کوردی ئایینی بـەئاوازی کـوردی ، ئەگـەر ئەمـە نەکرابێ ، بەئاوازی گۆرانیە ئاینی یەکان ووتراون . شیعری گۆرانی زۆر جار بەئاوازی گۆرانیەکانی دەروێشەکان بەدەفەوە ووتراوە . وەلەبەر ئەوەی گۆرانی کوردی هەمیشـە گوێگـری هەبووە ، ئەم فێڵ کردن و پێچ و پەنا دۆزینەوانە لەوجۆرە کات و شوێنانەدا قبوڵ کراون و نەتوانراوە ئەم دەرفەتانەی لێ بگرن .

بۆ نموونـە دەڵێم ، جەمـاوەرێکی زۆر ، لەساڵانی دوا دوای چلەکـان و هـەتـا دوایی ، رۆژانی هـەینی ، لەشـاری کۆیەدا ، بـۆ گوێ گـرتن لەو هۆنـراوە کوردی یـە ئایینی یـانە کـۆدەبـوونـەوە کـە کـاك « ئـەحمـەد لاکـین » بـەئـاوازی « سەلاکردن = کەبارکردن » بەدەنگـە خۆشـەکەی لەپێش بانگی نیوەڕۆ ، بانگی نوێـژی هەینی لەسـەربانی مـزگەوتی گەورە ، کە ئـەوکاتـە نوێـژی هەینی هـەر لەوێ دەکرا دەی خوێندەوەو زۆریان لەلا خۆش بوو[17]

یـان دلسـۆزانی هـونـەری کـوردی ، بـۆ دەرخستن و نیشـاندانی ئـەو هونـەرە کەڵکیـان لە جەژنـە ئاینی یـەکان وەرگرتووە . جەژنی نەتەوایەتی گەلی کورد (جەژنی نەورۆز) یش گرنگی یەکی زۆر گەورەی هەبوو لەخزمەت کردنی هونەری مـۆسیقەی کـوردی دا و لەرەواندنـەوەی تەم و مـژی عـەیب و شـوورەیی لەئاسـۆی ئەو هـونەرەدا و قسـەی پـڕو پـووچی حەرامی و ناحەلالی هەندێ لەئامێرەکانی و سووکایەتی گۆرانی ووتن لەلایەن ئافرەتەوەو گـەلێ شتی تر رۆژانێ کـەئاهـەنگی نەورۆزیان تێدا گەڕابێ ، ئەوە رۆژ هەر رۆژی ئـەو هونـەرە بووە .

لەبەر ئەوەی گـۆرانی و مۆسیقـەی کوردی ، ئـاوێنەی سروشتی کوردستانەو ، پلەکانی هونەری مۆسیقـەو گۆرانی کـوردی ، وەکـوو چینـە زەمینـەکـەی کـوردستـان وەهـان لەپێ دەشتـەکانـەوە وەکوو (دۆ) دەست پێ دەکـەن ، ووردە ووردە بەرەو تەپۆڵکەو گردو بانووەکان بەرز دەبنەوەو بەرزتر دەبنەوە بەقەد کێوەکان هەڵدەگەڕێن و دەگەنـە سەر لووتکـە هەرە بەرزەکان وەك (سۆڵ) لەپلەی مۆسیقەدا کۆتایی یان دێ ، کەزۆربەی گۆرانی بێژە رەسەنەکانی کوردستان ، دەنگیان لەو چینە هونەری یەدا چریکەی دێ .

چونکە گۆرانی و مۆسیقەی کوردی ، وەك خاوەنەکـەی کەخەڵکی کـوردستانـە وەهایـە ، لەکاتی پێـوستدا ناسـك و خـۆش و هێمنە وەك نـاسکی و هێمنی ی و خۆشی کچـوڵەکـانی کوردستان کە لەسەر کانی و لەبەر بیری و لەکاتی ئیش کردندا یەك دەگرنەوە وەهایە .

لەکاتێکی دیدا بەچـریکەو بـەسۆزو دل خـۆشکەرە ،

ئەشاخو دۆڵەکانی کوردستاندا دەنگ دەداتەوە . بەڵام لەکاتی تەنگانەو بارو دۆخێکی پێویستی دیکەدا ، وەکوو سروود بەجۆشو خرۆشو هەڵمەت بەرە ، شان بەشانی ئەو قارەمانانەی لەهەرکاتێکدا پارێزگاری لەمافو ژیانی کوردو کوردستان دەکەن .

بۆیە مۆسیقەو گۆرانی کوردی لەناو ناچێ . تاکوردستان بمێنێ ، بێگومان گۆرانیو مۆسیقەی کوردیش دەمێنێ ، با ئەمەش بڵێم . «تامۆسیقەو گۆرانی کوردیش بمێنێ کوردو کوردستانیش دەمێنێ ، هەریەکەیان تەواوکەرو پاڵپشتی ئەوی ترە .

ئەمەیە رەسەنایەتی ، ئەمەیە ئەو بەردە سەختەی سەری دوژمنانی لەسەر ووردو خاش بووە .

ئەم راستی یە نەك هەر لەسەر کوردو لەبارەی کوردەوە راستە ، بەڵکو لەبارەی هەموو گەلانی جیهانەوە راستە . زۆر دەمێکە بیرێکم لەمێشکدا دەخولێتەوەو دەمەوێ بیکەم بەشیعر ، هەتا وەکوو هونراوەیەکی نەمربمێنێو بژێ بیرەکەش ئەوەیە کە دەمەوێ بڵێم : ـ

« ئەی دوژمن باوا دابنێین کە تۆ بتوانی ی هەموو لانو کەلەبەرێکی خۆ نواندنو خۆ دەرخستنی نەتەوەیی خۆم لێ بگری ی ، لەو بارو کاتەدا ، دێم لەئاهەنگەکانی تۆدا گۆرانی کوردی دەڵێم . بۆ ئەوەنا هەتا ئاهەنگەکانی تۆی دوژمن خۆش بکەم ، بەڵکوو بەو مەبەستە کە بوونی خۆم ، مانو نەمردنی گەلەکەم ، مانو هیوا نەبرانی کورد بنوێنمو کۆتایی نەهاتنی زۆرانە پیرۆزە کەبەخەڵك رابگەیەنم .»

بارو دۆخی وەهامان بەچاوی خۆمان زۆر دیوە . لەکاتێکدا ئەم کردەوەیە بەشێوەیەك لەشێوە هەرە سادەوسەرەتایی یەکانی بەرگری کردن لەمانو بوونی نەتەوەکەمان دەژمێردرێ ، لەهەمان کاتیشدا بەشێوەی دەربڕینی هەرە پلەی بروایی و سووربوون لەسەر ئەو مانو بوونەو لووتکەی دڵنیا بوونو بەرچاو روونی لەبارەی ئەم بوونو لەناونەچوونەش دەژمێردرێ .

وەکوو راستی یەکی گشتیو ئاشکرایە ، لەسەردەمی بوونی ئاسایشو هێمنی ی دا ، ئیشو کار زۆر دەبێو کاسبی بەرز دەستێنێو ژیانی ئابووریو گوزەرانی خەڵکی گەشە دەکاو ئاسوودەییو فەراح نایی دەکەوێتە دەروونی خەڵکی یەوە ، هەرچینە بەپێ ی چینو توێژو کۆمەڵایەتی خۆی شتێکی لەو بووژانەوەو گەشە کردنە بەردەکەوێ . لەپاش ئەمە ، ئەوجا خەڵك دەکەوێتە خۆیو برسیەتیو قڕیو قاتی کەم دەبێتەوەو ئاستی چەوساندنەوە ، شتێکی لێ کەم دەبێتەوە ، لەم سەردەمانەدا هەموو هونەرێك ، لەناو گەلانی دوا کەوتووی وەك ئێمەدا هونەری گۆرانیو مۆسیقە بەتایبەتی ، زیاتر لەهونەرەکانی دیکە گەشە دەکاو دەکەوێتە خۆیو سەری بوونو خۆنواندن بەرز دەکاتەوە .

بۆیە هەرکاتێك ، کوردستان لەژێر سایەی هێمنیو دوور لەئاژاوەو شەڕو شۆڕدا ژیابێ ، هونەری گۆرانیو مۆسیقە گەشەی کردووەو پێشکەوتووەو هەر کاتێکیش کەداگیرکەران هێرشیان هێنابێتە سەریو بێ شێل کرابێ . ئەوا بەپێچەوانەی ئەوە ، هەموو هونەرێك ، بەتایبەتی گۆرانیو مۆسیقەی کوردی ، کپو خامۆش کراوەو هەموو دەرگایەکی بەڕوودا داخراوە .

یەکێك لەهۆیە گرنگەکانی دواکەوتنی گەلەکەی ئێمە ، لەهەموو لانێکەوە ، لەلانی هونەریشەوە بەگشتیو هونەری گۆرانیو مۆسیقە بەتایبەتی لەوەوە هاتووە کە کوردستان لە زۆر دەمێکەوە باری هێمنی ی ئاسوودەییو بەختیاری بەخۆیەوە نەدیوە . هەر لەشەڕدا ، یان لەنیمچە شەڕدا ژیاوە .

جارێ لەژێر چەپۆکی حوکمی عوسمانلی رزگاری نەبوو بوو ، دوو شەری جیهانی بەسەرداهاتو رەش بگیریو کوشتنو برینو قریو قاتیو نەخۆشی ی ، چیان لەدەس هات دژی گەلەکەمان کردیانو درێغی یان نەکرد ، دوای ئەو رۆژگارە رەشەش یان لە شەڕدا یان لە نیمچە شەڕدا ژیاوە . ئەم بارەو گەلێ هۆی تریش شوێن پەنجەی رەشو گلاویان لە هونەرە کەماندا بەئاشکرا دیارن .

پەیوەندی لەپسان نەهاتووی نێوان باری رامیاریو هونەر بەگشتیو مۆسیقەو گۆرانیش لەگەڵیاندا ، ئەوەندە بەهێزو بۆیەکتری کاریگەرن ، مرۆڤ هەرچەندی بیەوێ خۆی لەدەریای باس کردنیان نەدا ، ناتوانێ . منیش ناچار بووم لەم بارەیەوە ، ئەو یەك دوو پەرێگرافەی سەرەوە بخەمە بەرچاو . ئەمە لەو ژیانە هونەریو مۆسیقی یەی ئێمە تێیدا دەژین ، وەها زەقو نۆمایانە کەچاو لێ نوقاندنو بەسەردا تیپەڕبوونی لەلایەن هەر نووسەرێکەوە بێ بەخۆ گێل کردنو خۆ کوێر کردنی ئەو

نووسەرە دادەندرێ لەلایەن خوێنەرەوە .

ئەم کورتەیەم لەمێژووی رابردووی نزیکی رامیاری کوردستان کە گێڕایەوە ، هەرچەندە زۆر بەکورتیو چاو پۆشینەوە بوو لەباسکردنی زۆر خاڵی گرنگ گرنگ ، تەنیا بایی ئەو مەبەستانەبێ کە من مەبەستمەو دەزانم بەم کورتییەش پێ ی دەگەین . ئەمەم بۆ ئەوە گێڕایەوە کە ڕۆڵەکانی نەتەوەکەمان لەسەرێکە هان بدەم ، بۆ خۆزیاتر ماندوو کردنو هەوڵدان لەخزمەت کردنی هەرلانێکی کەپێیان بکرێ لەژیانی نەتەوەکەماندا ـ بێگومان لانی هونەرو مۆسیقەشی لەگەڵدابێ بۆ ئەوەی ئەگەر نەشتوانین ، تۆڵەی ئەو دواکەوتنە بکەینەوە کە لە میللەتان دواکەوتووینو بگەینەوە ئەوان . هەر نەبێ لە بەرەو پێشەوە چوونی داهاتوومان دا ، گورێك بەخۆمان بدەین ـ بامنیشیان لەگەڵدابێ ـ بەڵکوو لە خاویی ڕۆیشتنەکەمان لەجاران ، کەم بکەینەوە . لەسەرێکی دیکەشەوە ، وەك ڕێگا خۆشکردنەوەیەك ، بۆ ئەوەیە ، کە لە پاش خوێندنەوەی داهاتووی نووسینەکە ، کەبێ گومان بەزەیی یەکی زۆریان بۆ خۆمان پێدا دێتەوە ، بەزەیی یەکە ئەمەندە دڵتەزێنو دەروون ساردکەرەوە نەبێ ، کە لەجیاتی ئەوەی بمان گەیەنێ بەمەبەست ، خاوتریان بکاتەوەو دەستیان نەچێتە ئیش کردنو خۆ ماندوو کردنەوە .

لەپێش ئەوەی شتێکیش لەمێژووی رابردووی نزیکی مۆسیقەی نەتەوەکەمان بدوێین دەبێ شتێکی کەم لەمێژووی دێرینی ئەو مۆسیقەیە بەبیر خوێنەران بهێنینەوە بۆیە دەڵێم :

واپێدەچێ کە کۆنترین تیپی مۆسیقە لە کوردستاندا ، هەموو کوردستان ، یان تیپی شایەرەکان بووبێ (باڵەبانو دەهۆڵ) یان دەهۆڵو زوڕنا بووبێ [ وەك سەرنج دەدەن بۆ دەهۆڵو زوڕنا کە نەم گوت تیپی ـ لۆتی یەکان ، یان چاوەشەکان ـ چونکە ئەو ناوانە ، باڵەزووشەوە گوترابێ بەلای منەوە جوان نی یە پێویستە ئەمڕۆ ئەو مۆسیقە لێدەرانە بەوچاوەی جاران سەیر نەکرێن وەك ئەوە کە بەیەکێکیان بووترێ (دەهۆڵ لێدەر) و بە ئەوی دیشیان بگوترێ « زوڕنا ئەنگێو » و بەهەردووکیشیان بگوترێ (تیپی زوڕناو دەهۆڵ) ] . هەروەها واپێدەچێ باڵەبان زووتر لەزوڕنا دروست کرابێ چونکە سادەترە جا ئەو دوو ئامێرە ئایا لەووڵاتانی دیکەوە هێنراوەنەتە کوردستان یان نا ؟ کامەیان زووتر گەیشتوەتە کوردستان ، ئەویان لەگەڵ دەهۆڵ (نەزمگر = ایقاع) دا سادەترینو سەرەتایی ترین تیپی مۆسیقەیان دروست کردووە .

هەروەها لەوانەیە کەگومانیش لەوە دانەبێ کە یەکەمین نەزمگریش لەسەرانسەری جیهاندا چەپڵە لێدان بووبێ کەبەلەپی دوو دەستی ساغی هەر مرۆڤێك لێدەدرێ . باڵەبانو زوڕنا ، هەریەکەیان بەتەنیا لێدەدرێن بەلام ئەم تامو چێژە خۆشە نابەخشێ وەك ئەوەی کە دەهۆڵی لەگەڵدا لێبدرێ . بەلام لێدانی دەهۆڵ بەتەنیا هەر خۆش نی یە . تیپی باڵەبانو دەهۆڵ ، یان زوڕناو دەهۆڵ لەمێژوویەکی زۆر دێرینەوە ئاهەنگەکانی کوردستانیان گەرم کردوەو دڵی لاوان و پیرانیشیان جۆشاندووەو قرمەو قریوەو هەی دۆ ، هەیدۆیان خستۆتە ناو شاییو ڕەشبەڵەکەکانەوەو ئارەقەی ڕەشو شینیان بەشایی کەرەکانو ئاوی پێیان داهێناوەو گیرفانیان پێ بەتاڵو حەتاڵ کردوون !! لەوتیپانە بەولاوە ، بەدەگمەن نەبێ تیپی مۆسیقەی دیکە ، لەکوردستاندا ، وەکوو تیپ نەبینراوە .

بلوێرو شمشاڵ بەتەواوی جێگەی خۆیان لەجیهانی مۆسیقەی نەتەوەکەماندا کردبۆوە .

لەقوتابخانە سەرەتاییەکاندا سەفەرسازو کەرەناو دەهۆڵ هەبوون کەلەگەڵ ڕۆیشتنی قوتابیەکاندا لێدەدرا ، کە بۆ یاری کردن یا بۆ چوونە سەیران دەچوونە دەشتو دەرو کۆڕی یاری ی .

بۆ ئەوەی شتێکیش لەمێژووی رابردووی نزیکی مۆسیقەی نەتەوەکەمان بدوێین ، دەڵێم : ـ

جاروبار ، لەکوردستانی عیراقدا ، ئامێری سەنتوورو کەمانچەو عوود لەشارەگەورەکاندا بینراوە . ئەگەر جاروبار ، چەند مۆسیقە ژەنێك کەژمارەیان نەگەیشتبێتە پەنجەی دەست کۆبووبنەوەو لەسەر شێوەی تیپێکی مۆسیقە لەیەکێك لەشارە گەورەکانانا ، ئاهەنگێکی مۆسیقەو گۆرانی گێڕابێو جەماوەرێکی تێدا ئامادە بووبێ ، ئەوە لەئاهەنگە نەتەوایەتیو نیشتیمانی یەکاندا بووە ، یان ئەو مۆسیقە ژەنانە ، لەماڵی یەکتری دا بۆ مۆسیقە لێدان ، یاخود بە بۆنەی ئاهەنگی خێزانی ی یەکتری کۆ بوونەتەوەو هەندێ مۆسیقەیان بەیەکەوە لێداوە . ئەو ئاهەنگانە لەئەنجامی ئارەزووی بەجۆشی ئەوکەسانەوە هاتووەو هیچ کاتێك کرێو پاداشت وەرگرتن

لەئارادا نەبووە .

لەشاری کەرکووکدا ، بەتایبەتی لەناو برا مەسیحی‌یەکاندا تیپی مۆسیقەی هەوایی‌و ژێ داریش هەبووە . ئەمە لەپێش ئەوەی تیپی مۆسیقەی کوردی ، وەك تیپێکی ڕێك‌و پێك‌و سنوور دیار لەشارەکاندا بێتە کایەوە . وەکوو ئاشکرایە زۆربەی گۆرانی‌یەکانی برا ئاسووری‌و مەسیحی‌یەکان بەگشتی کوردین یان کوردی ئاوازن ئەوبرایانە هونەرمەندی گۆرانی بێژیی‌و مۆسیقەزانی چاك‌و کارامەیان تێدا هەڵکەوتووە کەخزمەتی زۆریان لەم مەیدانەدا کردووە . خزمەتی ئەوانە بۆ گۆرانی‌و مۆسیقەی کوردی گەیشتووەتە پلەیەکی وەها لەبەرزی‌دا کەهەمیشە لەبەر چاوانە .

ئەگەر تیپی مۆسیقەی ئێستگەی بەغدا ـ بەشی کوردی‌ی » بە یەکەم تیپی دامەزراوی کوردی نەژمێرین ، کەلەڕاستیش‌دا هەر نابێ بەو ناوەو پلەیە بژمێردرێن ، چونکە مۆسیقە ژەنەکانی ئەو تیپە ، لەبەشی عەرەبی‌یەکەوە دەهێندران‌و هەرڕۆژە بۆماوەی چەند دەقیقەیەك لەگەڵ گۆرانی بێژی بەناوبانگ « عەلی مەردان » دا ئاهەنگیان پێشکەش‌دەکرد . ئەمە لەسەرەتای دامەزراندنی ئەو بەشەی ئێستگەکە لەساڵی 1939 دا . ئەوبەشە تیپێکی تایبەتی خۆی نەبوو .

بەو لێکدانەوەیەبێ ، دەبێ یەکەم تیپی مۆسیقەی کوردی ، وەك تیپێکی کوردی بەناوو بەمەبەست‌و بە مۆسیقە ژەن‌و گۆرانی بێژو .. هتد تیپێك کەقەوارەیەکی دیاری کراوی خۆی بووبێ ، نەك وەکوو چایخانە ، هەر ڕۆژە چەند مۆسیقە ژەنێك چووبنە ناوی‌یەوە ڕۆژی دوایی بەجێ‌یان هێشتبێ : لەپاش ئەو مەرجانەشدا ، لەلایەن میری ئەو سەردەمەش‌دا بەڵگەنامەی ئیش‌کردنی درابێتی ، بەوحیسابە دەبێ ئەو تیپە هەر « تیپی مۆسیقەی مەولەوی » بووبێ کە لەشاری سلێمانی‌دا پێك هات‌و لەهەندێ لەشارەکانی دیکەی کوردستانیش‌دا ئاهەنگی گێڕا .

یەکێك لەشارەزایانی ئەو سەردەمەی هونەری کوردی دەڵێ : « تیپی مۆسیقای مەولەوی ـ لەساڵانی پەنجاکانا بەتەواوی وابزانم ساڵی 1954 پێك هات بەشێوەیەکی ڕێك‌و پێك واتە (تیپێکی ئەندام بەیەکەوە بەستراو) بۆئامانجێك . ئەم تیپە زیاتر هونەری مۆسیقاو گۆرانی‌و برادەرایەتی هێنایە کایەوە .

شوێنیان نەبوو . بەڵام هەر ئاهەنگێك بکرایە ئاگاداری یەکتریان ئەکرد بەگورجی‌و کاریان مەیسەر ئەبوو . سەرۆکی تیپەکە هونەرمەند (قادر دیلان) بوو ئەندامەکانی : نەژاد عەبدە ، حاتەم سەعید ، ولیەم یوحنا ، بەهجەت ڕەشید ، ئومید مدحت ، سەردار ڕەمزی ، هادی عەنبەر ، ساجد رفیق‌و ، هەندێ هونەرمەندی تر بوون . لەساڵی 1962 بۆماوەیەکی کورت هاتنە ناو کۆمەڵی هونەرە جوانەکانەوە[24] »

هونەرمەندێکی دیکە هەر لەبارەی ئەم تیپەوە دەڵێ : تیپی مۆسیقەی مەولەوی ، بەر لە پێك‌هاتنی کۆمەڵی هونەرە جوانەکان دامەزرابوو[25] .

کاك ولیەم یوحنا کە یەکێکە لەدامەزرێنەرانی ئەم تیپە ، بەدەمی بێ‌ی ووتم کەوا ئەم تیپە لەساڵی 1955 دامەزرا .

هەرچۆنی بێ ، هەموو ئەو ئاگادارانە لەسەر ئەوە یەك دەگرنەوە کە ئەم تیپە لەپێش ساڵی 1954 دانەمەزراوە[26] .

پێویستە ئەمەش بڵێم کە ئەم « تیپی مەولەوی » یەی ئێستا ئێش دەکاو لەسلیمانی بارەگای هەیە ، ئەمە ئەو تیپی مەولەوی‌یە نی‌یە کە لەساڵەکانی پەنجاکاندا دامەزرا . ئەم تیپە هەر بەناوی « مەولەوی » یەوە لەساڵی 1977 دا دامەزرێندرایەوە . لە شارەکانی دیکەشدا ، نایەتە بیرم تیپێکی مۆسیقەی کوردی لەپێش (تیپی مۆسیقەی مەولەوی) دامەزرابێ .

من لەساڵی 1954 لەکەرکووك جێ‌گیربووم . لەوکاتەداو دوای ئەو کاتەش تیپێکی مۆسیقەی کوردی لەوشارەدا نەبوو . مۆسیقە ژەنی کورد هەبوون[27] بەڵام هەندێکیان لەناو تیپی تورکمانەکان‌دا ئیشیان دەکردو هەندێکی دیکەشیان لەترسی پێگەیشتنی زەبرو زەنگی نەتەوایەتی ، نەیان دەوێرا خۆیان لەتیپێکی وەهادا بدۆزنەوە . تەنانەت لەپاش شۆرشی (14/ی تەمموزی / 1958) یش‌دا کە دەرفەتی ئیش‌کردنی سیاسیش بۆ کورد هەبوو ، ئێمە « تیپی هونەری خەبات » مان پێك هێنابوو کەتیپێکی هونەری گشتی بوو ، تیپی مۆسیقەی تایبەتیمان نەبوو ، بۆ ئاهەنگە نیشتیمانی‌و نەتەوایەتی‌یەکان ، هەندێ مۆسیقە ژەنی برا مەسیحی‌یەکانمان ڕازی دەکردو یارمەتی‌یان دەدایں .

لە هەولێر ، تیپێکی مۆسیقەی چالاکی قوتابخانە سەرەتایی‌یەکان هەبوو کە ئەویش لەپێش تیپی مەولەوی

دانەمەزرابوو . لە کۆیە کاك ئەندریوس ئیسرائیل (باکوری) (تیپی مۆسیقەی باواجی) لەپاش ئەوتیپە دامەزراند . باسی هەریمی کرمانجی ژوورو باهەرنەکەین کەبەداخەوە هەتا دوایی‌یەش تیپی مۆسیقەیان نەبوو .
کەواتە یەکەم تیپی مۆسیقەی کوردی ، بەناوێکی کوردی ، بۆ خزمەتی مۆسیقەی کوردی ، لەرۆڵەکانی کوردستان ، بۆجاری یەکەم ، لەکوردستان وەختە بڵێم لە هەموو کوردستان « تیپی مۆسیقەی مەولەوی بووە » .

وەکوو دەزانن مەبەستم لەباس کردن‌و ناو هێنانی هەندێ لەتیپە مۆسیقەیی‌یەکانی کوردستاندا ، ئەوە نەبوو کە ئەم نووسینە بکەم بەتۆمارێك بۆ تیپەکانی کوردستان بەڵکو هەربایی ئەوەندە ناوی ئەم تیپانەم برد کە پێویست بوون بۆ دەرخستن‌و زانینی یەکەم تیپی مۆسیقەی دامەزراوی کوردی لەبەر ئەوە لەناو نەبردنی ناوی هەندێ تیپی مۆسیقە ـ بەلای خۆمەوە لەوانەیە گلەیی لێکردن هەڵنەگرم .

ئەم بەشە لەنووسینەکەم کۆتایی پێ دێنم بەوە کە دەڵێم : دەزانم نووسینەکە ، کە لەبەری مێژوویی‌و بۆشایی زۆر تێدایە ، ئەمەش زۆربەی بەپلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ کەمی سەرچاوەی نووسراو لەبارەی مۆسیقەی کوردەوەو ئەنجا بۆ کەمی‌ی ئەو دەرفەتەی من بەدەستمەوە بوو ، هەروەك ئەمەم لەسەرەتای دەست پێکردنی نووسینەکەشدا خستە بەرچاوی خوێنەرەوە . پڕکردنەوەی ئەم کەلەبەرو بۆشایی‌یانە ، یەکێکی دەست بەتاڵی دەویست کەپشکنین‌و گەڕانی زۆری بۆ بکردایە . ئومێد دەکەم ئەم راستی‌یە شتێکی ئەوتۆی لەنرخی نووسینەکەم کەم نەکردبێتەوە .
ئەمە ئەگەر هەر ئەسلەن نرخێکی هەبێ مەبەستم لە نووسینەکەمە . بەو هیوایە کە ئەمە یەکەمین نووسراوی بەم جۆرەیە لەسەر ئەم باسە نووسرابێ‌و ئەمە بەیارمەتی‌دانێکی بچکۆلانەی ئەو کەسانە قبوول بکرێ کە لە دوا رۆژدا قووڵترو چڕتر کردنەوەو روونتر کردنەوەی ئەم لانەی سەر پاکی نووسینەکەم دەگرنە ئەستۆی خۆیانەوە ئومێدیش دەکەم دان نانەکەم بەکەم‌و کوڕی‌یەکانی‌دا ، برا رەخنەگرە بنیات نەرەکان سارد نەکاتەوەو لەوە کەمشتی خواردەو کراوەیان چی‌یان تێدایە پێمی رەوا ببینن‌و بۆمی بنێرن تاوەکوو لەکردنی بە کتێب‌دا کەڵکیان لێ وەربگرم .

## پەراوێزەکان

(1) لەووتەکانی « کۆنفوشیوس » ـ گۆڤاری « القیثارة » ژمارە 13 کانوونی یەکەمی 1974 [ لەمەودوا پیتەکانی (ق) بۆ القیثارة (ژ) بۆ « ژمارە » و (م) بۆ مانگ بەکار دەهێنم ]

(2) زانیاری بوونی (بەخت ، چارەنووس ، ناوچەوان نووسراوی‌و شانصی کە (Chance) ی ئینگلیزی‌یە بەمانای هەل‌و دەرفەت دێ لەعەرەبی‌دا لەبەر ئەوەی پیتی (چ) نی‌یە کراوە بە شانصی ، زانیاری بوونی ئەوانەی بەدرۆ خستۆتەوەو دەڵێ : هەموو دیاردەیەك لەژیاندا ، هۆیەك یان چەند هۆیەکی هەیە .

(3) باوکانمان ـ تەنانەت بۆ ماوەی سی‌ی ساڵێك لەمەوبەر ووشەی «مۆزیقەیان» بەکاردەهێنا . لە بەشی عەرەبی زمانەکەی عیراقیشدا هەروابوو . لە پاش بڵاوبوونەوەی وشەی (مۆسیقە ـ music) ی ئینگلیزی‌و مەسیکای فەرەنسی‌ی کاری کردە سەر ووشەکەی جاران‌و (ز) ی‌یەکەیان ئاسان کردەوە کردیان بە (س) کەچی ، لەناکاو بزوێنەکەی دوایی‌یان کرد بەئەلف . ئەمەیان ووشەکەی گرانتر کرد . لەبەر ئەوە بەلای منەوە ووشەکە بە « موسیقە » بووترێ ئاسانترە . بڵێین « تیپی مۆسیقەی سلێمانی . تیپی مۆسیقەی باواجی ، یان تیپی مۆسیقەی هەولێر .. هتد
لەبەر طابووری عەسکەر ڕێ نەبوو بۆ مەجلیسی پاشا
صەدای مۆزیقەوو نەققارە تا ئەیوانی کەیوان بوو

شێخ رەزای تالەبانی ـ (1835—1909 ز ) ـ کتێبی (ئەنجومەنی ئەدیبان ـ ل 86) ـ نووسینی ئەمین فەیضی بەگ ـ بەغدا ـ 1983 .

(4) ئەم دوو پەرێگرافە لەزمانی عەرەبی‌یەوە (کاك نەوزاد محەمەد کەریم) مامۆستای فیزیای قوتابخانەی ئامادەیی کردوویەتی بەکوردی .
ئەم پەرێگرافانەش لە (مبادئ الموسیقی النظریة) نووسینی ف ـ آ ـ فاخرومییف ـ وەرگێری بۆ عەرەبی ـ دکتۆر رؤوف

...ێو روون کاتەکە ئەخاتە بەر چاوی بینەر .. ئەگەر باس لە ...الیستیەتی

ڕووناکیەکەش بکەین ئەوا ڕەنگە شینەکەی دەریاکە لەسەر پەردەی سایکەکە شتێکی زۆر داهێنان و جوان بوو ، بەڵام کاتەکەی دەرنەخست چونکە دەریا لەبەرەبەیاندا شینێکی کاڵی سپی باوەو لەئێوارانـدا شینێکی مۆر باوە بەرەو پرتەقاڵی و سور ئەڕوانێت کەئەمە خۆی یاسایەکی فیزیکی یە « فیزیایی » گرنگترین شتیش بوقعەیەکی سوور لەسەرەتادا درا لەماڵی ئاگاممنون لێرەوە ئەزانرێت کەتاوانێك بەڕێگاوەیە ... بەڵام ئەمە بووە شتێکی چاوەڕاونی مومل و تاکۆتایی شانۆییەکە زیاتر لە (7 — 8) جار بوقعەی سور دراله [کۆرس و ئەفجینیاو ئەخیلس و کلمنستراو ئوریست] کە ئەمانە هەموو بی تاقەتی ئەخستە دڵی بینەری زیرەك کەلە ڕووناکی تێ بگات و لەرەمزیەت بزانێت لەشانۆدا ... هەر لەنامەکەی سەرەتاوە لەنێوان ئاگاممنون و پیرەمێردا ئەزانرێت کەتاوانێك ئەکرێت ئیتر پێویستی بەم هەموو لێدانە سورانە ئەکرد .. خۆی یەك کردار هەیە ئەویش ئاشکرایە کەئەمە ببووە هۆی چاوەڕوان کردنێکی زۆر کە تاکۆتایی نەئەبوایە (ئیناریست) ئاوایاری بەولێدانە سورانە بکردایە چونکە لەهەرلێدانێك دا بینەر وای ئەزانی پاش چەند چرکەیەك شتێك ڕووئەدات . کەچی هەر رووشی نەئەدا واتە بانگەوازی ڕوو داوە لە ڕەمزدا واتە مردن و وێران کاری وکوشتن نیشان ئەدات و ئاگادار کردنەوەی بینەرە .

** * **

« کۆرس »

ئەوەی کەسەرنجی ڕاکێشـام بۆلێدوانی مەسەلەی « کۆرس » بو وەلەشانۆیی یۆنانیدا ئەبێ ئەوەمان لەبیرنەچێت کەکۆرس بۆ دوواجار لەسەردەستی (سوفۆکلیس) کرایە (15)کەس .... چونکە ئەم پانزە کەسە (ئەرسطو) ش پەسەندی کردووە کە جوانترین تەشکیلات دروست ئەکەن لەسەر شانۆ وەك [3 × 5] سیانی یاسێ کۆمەڵی پێنجی یادوو کۆمەڵێ حەوت کەسی و سەرۆکی کۆرس کەئەمە یارمەتی بەهاجوانکاری یەکەی داوە لەدەرهێنان دا هەر لەگەڵ ئەمانە شدا « یورپیدس » لەم دەقەیدا (ئەفجینیاله ئۆلیس) تێبینی یەکی زۆرگرنگی داوە لەنەخشەی کاراکتەرەکاندا لەیەکەم لاپەڕەی دەقەکەدا دەڵێت : ـ لەکۆمەڵێك کسیژی (کالاکسی) پێك هاتووە* .

بەڵام یوربیدس خۆی بڕوای بە پانزە کەسیش نەبووە بۆمەسەلەی کۆرس تەنها لەشانۆیی (أبناء هرقـل) دا دەڵێت کورس لە « 15 » پانزە پیاوی پیرەمێرد پێکهاتووە . بەڵام مامۆستا ئەحمەد سالار نەپەیڕەوی یاساکەی سوفوکلیس و نەئەرسطوی کردووە کە (15) کەس بێت ... وە نەپەیڕەوی تێبینی یە گرنگەکەی یوربیدسی کردووە کەلەدەقە شانۆیی یەکەدا هاتووە . (11) کیژی هێناوە لەگەڵ ئەوەشدا (12) کوریشی لەلاوو پیران زیاد کردووە کەئەمە بۆتە هۆی شکاندنی تێبینی نووسەر واتە . « یوربیدس » کەئەمەیان ڕەنگە ماف خۆی بێت بۆداهێنان کەپەیڕەوی نووسەرنەکات ... بەڵام لەبری (15) کەس هاتووە (23) بیست و سێ کەسی بۆکۆرس بەکار هێناوە بەمەیاسای سوفوکلیس و ئەرسطوی شکاندووە کەئەم یاسایانە چەسپاون . پاشانیش سەرۆکی کۆرس « قائد الجوقة » یەك کەس بووە . لەنێوانیاندا [ ابـراهیم حمادة لەپەرتوکی « معجم المصطلحات الدرامية والمسرحية » لەلاپەڕەی (211) دائەڵێت : سەرۆکی جوقە یان کۆرس ئەوکەسەیە کەسەرکردایەتی کۆرسەکە ئەکات بەبەشدار بوونی لەکاری درامی یۆنانی کۆندا ... وەکاتێك کۆرسەکانی کەبەگۆرانی دیالۆژەکانیان ئەگوت ئەکرانە دوو بەش بەشی یەکەم سەرۆکی کۆرسی ژمارەیەك ئەیبردنە ڕێوەکە کۆرسی دووەم سەرۆکێکی ئیحتیاطی بۆدانرابوو ] . واتە کۆرسەکە کرابووە دووبەش رەنگە پیاوان و ژنان جیا بووبێت یان پیران و لاوان جیا بووبێت بەڵام سەرۆکی (ئیحتیاط) ی هەبووە ... بەڵام لای مامۆستا ئەحمەد سالار لەبری دوو سەرۆك بەگشتی کۆرسەکە (4) سەرۆکی هەبوو ئەوانیش [ سروە عزت و سازگار عبداللە و یادگار لەتیف و تریفە جمال ] . ئەمە کە [ بەیان محمودو گوڵاڵە جەلالیش ] بەشداریان ئەکرد ... بێجگە لەوەی پیاوان کەزیاد کرابوو لەکۆرسەکەدا هیچ ئیشێکیان نەبوو تەنها لەژێر رکێفی کۆرسی کچاندا ئەجوڵانەوە تەنها یەك کەس ئەویش یوربیدس بووە کە لەهەندێ شانۆیی دا وەك (ئەفجینیا) کۆرسی

تەنها کردووە بە ئافرەت بەبێ پیاوە ئەمەو لە (فینیقیـات) دا کـۆرس پێـك هـاتـووە لە کـۆمـەڵێـك ئـافـرەتی فینیقیی و لە (مستجیرات) دا ژنان لەدایکانی (ئاراجیـات) پێك هـاتووە . لێرەدا ڕوو بەڕووی شتێکی زۆر گرنگ دەبینەوە لەسەر شانۆ ئەویش مەسەلەی بەکار هێنانی (کۆرس) بۆ دروست کـردنی « تـەشکیلات » تـەشکیلە : ـ بریتی‌یـە : ـ لەو ئیشـە ڕێـك خراوەی کە شوێنەکان و هێزی و بێ‌هێزی کاراکتەرەکان نیشان ئـەدات . لەسـەر تـەختـەی شـانـۆ هێـزی و بێ‌هێـزی ئەکتەرەکانیش بۆ سەر هێڵە تەریبەکان و نـاوچەکـانی شانـۆ بەمەرجێك بەبەهانە بێت (مبرر) تەشکیلەکە ملکەچی بیـری دەرهێنەرە تاجـوانی بداتـە بینەر لەگـەڵ جەوهـەردا [ واتە بەکارهێنانی لەکاتی خۆیدا بێت ] هەموو تـەشکیلاتێـك پێش دروست کردنی نابێت دەرهێنەر بیر تەنها لەبنەما جوانی‌یەکەی بکاتەوە بەڵکو ئەبێت لەهۆی دروست بوونیشی (خاضع لأسس نفعية) بیر بکرێتەوە ... پاشانیش ئیشی (کۆرس) بەرزکردنەوەی کرداره درامی‌یەکـەیە [تصعيـد الفعل الدرامي] وەشـاهێدی ڕووداوە کانیش وەك بینەر مامۆستا ئەحمەد لەم شانۆیی‌یەدا زیاتر گوێی بەبنەما جوانی‌یەکە دابوو لەجل و بەرگی کۆرس و دروست کردنی تەشکیلات و ڕێك خستنیان‌دا بۆ دروست کردنی کوت و پڕی لای بینەر .. چونکە بینەری کورد بۆیەکەم جـارە لەشاری سلێمانی ڕووبەڕووی شانۆیەکی کلاسیکی ئەبێتەوە بەشێوەیەکی زانستی .. بۆ وێنە (ئاهاتێك) درابوو بەکۆرسەکە لەگەڵ مۆسیقای ئورگۆنێکی کەنیسەیی‌کە ئەمە زۆری لەکاتەکە ئەبردو درێژەیان زۆرپێ‌دا تا کۆتایی شانۆیی‌یەکە .

پاشانیش تەشکیلاتەکان بەڕای من زیاتر بارەجوانکاریەکە بوو لەزۆربەی حاڵەتەکاندا . ئەگەنا لەکۆتایی‌دا تـەنها (شـەش) کیژەکە مانەوە ، بـۆ وورپایی چـاوو زیاتـر تەرکیـزو جوانی و جەوهەری ئەو شەش کیژە لەهەموو دیمەنەکانی تری بەهێزترو جوانتر بوون کە بەشێوەیەکی جوان و ڕێك و پێك و کاری درامی کۆرسەکەیان بەجێ ئەگەیاند ... وەفراوان دابوو بەجوڵانەوە لەسەر بەرزایی‌یـەکان و پلیکـانەکـان و شوێنـە بەهێـزەکانی خوارووی ڕاست و ناوەندو چەپی شانۆ . بەڵام تەشکیلاتەکانی « 23 » کەسەکە بەڕای من زیاتر درێژەی ئەدا بەشانۆیی‌یەکەو بێ‌تاقەتی لای بینەری وریاو زیرەك دروست دەکرد . چـونکە جـوڵانـەوەی ژمـارەیـەکی وا زۆر ئـەبێت بـەجـۆرێـك بێت کەلەئیستیعراض نەچێت ... بەبێ تەشکیلاتیش وەك ووتمان شەش کیژەکە وەك (ڕاوی) زیاتر توانیان خزمەتی گەورە بکەن بـۆ بەرزکـردنەوەو ڕاگـەیانـدن‌ی کاری درامی خـۆیان وەك کاراکتەر ... تەنها ئەوشەش کیژە هەر لەسەرەتاوە ئەیان توانی بە سەربەستی و جۆرێکی جوڵانەوەو (مناقشه) ی نێوان خۆیان بینەر ڕابکێشن بۆخۆیان و بینـەریش چاوی ڕزگـار ئەبـوو لەو قەرەباڵغیەی سەرشانۆو نەك کۆرسەگەورەکە لەبازنەیەکـەوە یەکە یەکە ئەهاتنە دەرێ و دیالۆژی خۆیان ئەووت و یەکێکی‌تر ئەهاتە دەرێ و پیاوانیش وەك مرۆڤە ئـالی‌یەکـان ئەجـوڵانەوە کـاتێـك کـەئـەفجینیـا بـۆجـاری یـەکـەم بـاوکی دەبینێت و بەیەکەوەدێنە خوارووی ناوەندی شانۆ نزیـك ڕەمبەکـە لێرەدا کۆرسی کچان لەلای ڕاستی ئەکتەرەکەوە لەسەر شانۆ (بەدزی یەوە) بەبێ هۆ دوو دوو لەکەوالیسەکەوە خۆیان ئـەدزی‌یەوە وەك بیانەوێت ڕزگاریان بێت لەسەرشانۆ . بەڵام ئـەبێت ئەوە لەیاد نەکەین هاتنە ژوورەوە [الدخول الى المسرح] وەچوونـە دەرەو ئەبێت (مبرری) هـەبێت و خزمـەتی تێبینی نووسـەرو دەرهێنەر بکات نەك لەخۆڕا بێت و یەکێك بێتە دێتە ژوورەوەو دووسێ کەس بچنە دەرێ بینەرهەنـدێ جار پـرسیاری ئـەوە ئەکات کەئایا بۆچی ئەم ئەکتەرە دێتە ژوورێ یان مەبـەست لەڕۆیشتنی چی‌یـە ؟ کەئـەچێتـە دەرەوە .. ئـەم لای خـۆی چیـرۆکێکی بۆ دروست ئـەکات بـەخەیـاڵی خۆی کـەئەڕوات بۆکوێ و چی‌ئەکات .. من بەش بەحاڵی خۆم دەڵێم گەر مامۆستا ئەحمەد سـالار لەبری ئـەو ژمارە زۆرە لەکـۆرس پەیـڕەوی تێبینی‌یەکەی « یوربیدس » بکردایە یان « سوفوکلیس » ئەوا سەرکەوتوو ترین کۆرسمان بەدی ئەکرد لەشانۆیی‌یەکەدا ...

## * « جل و بەرگەو ئێکسسوار » *

گرنك ترین و وورد ترین هـونەر لەدەرهێنـانی شانـۆیی‌یەکی کـلاسیکی یارومـانسی‌دا ئەمـڕۆ هەڵبـژاردنی جـل و بـەرگەو ئێکسسوارە ... چونکە ئەبێت خۆمان ببەستینەوە بـەعادات و هەڵس و کەوتی ئەوکەلەوە لەگەڵ جۆری جل و بەرگ و کەل و پەلی ڕۆژانەیانەوە لەوکاتەدا ... بەڵام لەم شانۆیی‌یـەدا مامـۆستا [ بديعة دارتاش ] و قوتابیان [ ابـراهيم مەولود ، وسـۆران عوسمان و حسامەدین محمد ] دێن وەك نەخشە کێشانی جل و

ـ نیکسسوار هەندێ شتی سەیر تێکەڵ بەڕەوشتو جلو
ـگو چەکی ئەوسای یونان ئەکەنو ووردتر بۆ مەسەلەکان
ـچوون کەئەمیش خستونیەتە هەڵەی ووردەوە لەمانەش : ـ

ڕەنگ ..

ـوڵاتێکی وەك یۆنانی (480 — 500) پ . ز دا ئەبێت سروشت چ
ـرە ڕەنگێکی بەخەڵکی بەخشیبێت ... جارێ لەپێش هەموو
ـتێدا ڕەنگەکانی یۆنانی کۆن کەپیاوانو ژنان بەکاریان
ـهێناوە جیا ازن تەنانەت بەگوێرەی چینەکانی کەلیش یونان پێك
ـهاتبوو لەم چینانە : ـ

(1) چینی ئەرستوقراط ، (2) چینی ناوەندو ، (3) چینی هەژارانو (4) چینی کۆیلەکان (العبید) کەهەریەکە لەمانە ڕەنگی تایبەتی لەزەخرەفەکانیان دا لەسەرجلو بەرگ تەنها ڕەنگی ئالتونی یان بەکارئەهێنا .. بەلام لێرەدا زەخرەفەکانی جلی ئاگاممنونو ئەکلیزو پاسەوانەکان [ سپیو ڕەشو سوور ] تێکەڵ کرابوون کە ئەمە لای ڕۆمانەکان باوبووە ... لەلایەکی تر [ ئافرەتان زیاتر گرنگیان بەڕەنگە کراوەکان ئەدا ] لەوانە ڕەنگی پەمەیی کەجلەکانیان زۆری پەڕ پەڕ تیابوو کە بە زەخرەفەی ئالتوونیو ئەندازەیی جوان دژبە ڕەنگی کراسەکە ئەکێشرا ... جلی پیاوان زۆر نزیك بوو لەجلی ژنانەوە لەجۆردا پیرەکانو کاهنو فەیلەسوفەکان ڕەنگی سپیان بەکار ئەهێناو لاوانو هەژارەکانو چینی کۆیلەکان ڕەنگی خوڕیو سروشتی یان بەکارئەهێنا کەنزیك بوو لەڕەنگی گوێنی . جلی ژنانو پیرەکان بەتەنها تابەرپێیان درێژ ئەبوەوەو تەنها ئەوانیش قایشیان ئەبەست لەسەر کەمەر .. وەپێڵاوەکانیان بەوە جیائە کرانەوە لەڕۆمانی یەکان کەژنان پاژنەکەی زۆر زۆر بەرز بوو ئەمانیش زیاتر لەفلینو تەختە دروست ئەکرا بەلام پیاوان لەجۆرێکی سۆڵ (الصنادل) ی تەنك وەك نەعلی ئێستای خۆمان دروست ئەکرا وەبەقایشی زیگنرال ئەبەسترا ..[7] جلی کلمنستراو ئەفجینیاو کیژانی کالاکس هیچیان پەڕ پەڕ نەبوون ئەمەو سەرەڕای پێڵاوەکانیان هەمووی نوێ بوو ... کچان کالەی بالیەکە ئەمە تاڕادەیەکی ستە نزیك بوونەوەیە شتێکی چاکە ... ئەمەو جگە لەپۆستاڵەکەی ئاگاممنونو مینالاوسو ئەخیلس کەوورد پەیڕەوی نەکرابوون .

کە ئەمانە هەموویان لەتەختەو قامیش کەمترین نرخیشیان ئەبرد ئەگەر دروست بکرانایەو جوانتر ئەبوون لەلایەکی تریشەوە هاتوون چی ڕەنگ هەبێت بەکاریان هێناوە بەپێی ئارەزوو بۆنمونە .. « سور » بۆجلی سەربازەکان شینی ئاوی بۆ (کۆرس) ی کوڕان مۆرێکی شین باوو ... پیرە مێرد « قاوەیی » مینالاوس « سەوز » پیاوێك « زەرد » ئەفجینیا کراسی سپیو پەشمەکی « پەمەیی » بۆ سەرشان کەئەبوایە کراسەکە پەمەیی بوایە ..... چونکە لەڕەنگە چاکەکانی ئەوسا پەشمەکی سەرشان سپی ئەبوو پاشان کڵاوەکەی ئەفجینیا کەسپی بوو هینی « سەردەمی نوێ بوو » لەفەرەنساو ئینگلترا واتە سەدەی (14 — 17) لەوکڵاوەیان بەکار ئەهێنا ... نازانم تەنها بۆ دروست کردنی کتو پڕی بوو لای بینەران یان نەء .. ئەگینا هیچ کیژو شازادەیەکی یۆنانی بەخەویش کڵاوی لەوجۆرەی نەدیبوو نەشی زانیبوو ... تەنها جۆرێك لەسەر پۆشی ئێستا هەبوو بازنەیەکیان بۆ ئەکردو لەسەر سەر ئەکرا وەك تارای بووك کەبۆ گەورە کچان بەکار ئەهات ... (ئۆریست) جلی سەوز بوو تەنها جوانترین شت بەسەری ئۆریستەوە ئەو بازنەیە بوو کەیۆنانی یەکان لەسەری قوتابیو منالەکانیان دەکرد ... ئەمە ووردەکارییەکی جوان بوو ... ئەگینا لەمەسەلەی ڕەنگدا استعراضێکی جلو بەرگی جوانیان پێشکەش کراو هیچی تر جگە لەکۆمەڵێ هەڵەی گەورە لەوانە : ـ لەجۆری چەكو جلو بەرگدا یۆنانو سۆمەرو ئەکەدو ڕۆمانو فارس گرنگ ترین شت چەكو جلو بەرگی جەنگ بووە بەلایانەوە بۆ پارێزگاری کردنی خۆیان شمشێرەکانی [ ئاگاممنونو ئەخیلس ] تاکە دوو شمشێری ڕاستەقینەی یۆنان بوون بەلام شمشێری نێرراو ئەمە لەسەردەمی (دانتی) شاعیردا لە (فلورنسا) دا بەکار هاتووە واتە سەدەی سیانزەهەم ...[5] پاشانیش شمشێری (پیاوێك) بەدرێژیو پانیەکەی ئەمە چەکی سەردەمی خاچ پەرستەکان (الصلیبیین) کە [ ریتشارد قلب الأسد ] ی ئینگلیزی و (هنری دووەم) لەسوپاکەیاندا بەکاریان ئەهێنا لە هێرشەکەیان بۆسەر (ئورشلیم) لەقدس[6] ئەگەر سەربازی ڕۆمانیو یۆنانی خاوەنی سیماو بۆنی خۆیان نەبوونایە لەجۆری جلو بەرگو چەکدا ... ئەی چۆن لەشانۆییەکی یۆنانیدا سەربازی یۆنانیو تەروادەییو فارس لەیەك جیا ئەکەینەوە ... (مینالاوس) سەرۆکی ئەسپارتە لەحاڵەتی جەنگ دابوو کەخۆی

قوڵنکێکی گەورەی هەیە لەگەڵ شمشێرو خەنجەری پرچەکدا ... کەچی بەستەزمانە لێرەدا لەبری چەك داریکی بچوکی درابوە دەست !!!... جگە لەوەی ئاخونی گەورە کەهیچ کاهینێك لەسەردەمی یۆناندا دەست کێشی لەدەست نەئەکردو بەڵکو دەستکێش هەر وجودی نەبوو کەچی کاهن جوتێك دەست کێشی ڕەشی لەدەست کرابوو .... لەگەڵ پێلاویکی لوت درێژی سەیر کەلەخوری ئەچوو . لەگورەوی دروست کراوبوو . ئەمەو جگە لەوەی کەکاهینەکان جووتێ پێلاویان لەپێ ئەکرد کەلەتەختەو سۆل دروست ئەکران و بەقایش لەسەرپێ ئەبەستران بەلام پێلاوەکەی ئاخونی گەورە پێلا وی (موهرجەکانی) « المهرج » ی سەردەمی سەدەی چواردەهەم بوو لە (ئیتالیا) دا بەکار ئەهێنران نەك هی سەردەمی یۆنانی[10] ....

جگە لەوەی کاهن کراسێکی سپی لای ڕاستی ڕووت بوو لەبەر ئەکرد نەك دەست ماڵ کەئەدرێت بەسەر شانیدا ... وەك کاهن ئەم لەسەردەمی شەکسپیردا لە (لندن) هاتەکایەوە ئەمەهینی (قس) ی کەنیسەکان بوو لەئینگلترا . ئەگەر بێینەسەر جلو بەرگی کۆرس بەتایبەتی پیاوان ئەوا دەبینین ڕۆمانیە . (سعد ئەردەش) لە پەرتوکەکەی [ المخرج في المسرح المعاصر ] دا لەباسێك دەربارەی سەرهەڵدانی دەرهێنەردا لەسەر زمانی (ئاخون) لەشانۆیی (ئۆدیب) دا دەڵێت ..

[ هەندێکمان تائێستا منالین کە ناتوانین لەووڵات دوور کەوینەوەو هەندێکمان پیرێتی پەکی خستوین ] . لەلاپەرەی (31) دا دەڵێت ... [ چۆن دەتوانین جیاوازی نێوان منالو لاوو پیر بکەین لەشانۆی کلاسیکی دا لەکۆرسەکەدا ئەگەر لەڕێگەی جلو بەرگو پارچەکانی و ڕەنگەکانی یەوەو لەڕێگای ئارایشتەوە نەبێت . ][11] .. .

بەلام مامۆستا بدیعە دارتاش دێت کراسێکی کورت لەبەری هەموو یەکێك لەکۆرسەکە ئەکات لەیەك (ڕەنگ) و لەیەك (درێژی) ، کەئەوەی لەیاد کردووە لەیۆنانی کۆندا پیرەکان جلەکانیان جیاوازبووە .. چونکە [ پیاوان کراسێکیان بەکار ئەهێنا پێ ی ئەوترا [ چیتون ] (chiton) وەئەمە لەلای ڕاستی یەوە لەزۆربەی کاتدا کراوە بووە (عادیە) وەجلەکان شوێن و پلەی ئەو کەسەی دیاری ئەکرد لەکۆمەڵدا . (هەژارەکان و لاوەکان) بەوە جیا ئەکرانەوە کەکراسەکانی (کورت) بووە تا سەر ئەژنۆ ... پیرەکان کراسەکانیان وات (چیتون) درێژ بۆتەوە وەکو ئافرەتان تاسەر پێلاوەکانیان ئەم لەکاتێکدا کەپیرەکان بەپێچەوانەی لاوانەوە ئەیان توانی قایش ببەستن و ڕەنگی خۆشیان تەنها سپی و قاوەیی نزیك لەڕەنگ خوری طبیعی بوە وەك گوێنی .[12] .

بەلام لەکۆرسەکەی خۆماندا دووسێ پیاوی پیر تەنها ئارایشت نیشان دراو کە هەر ئارایشت مەرج نی یە .... کەچی لەجلو بەرگدا وەکو لاو ئەهاتنە پێش چاو . گرنگترین شتی ووردیش کە هەڵەیەکی گەورە بوو لەجلو بەرگی شانۆیی یەکەدا بەگشتی ئەویش هەرلەسەربازو ئاگاممنون و ئەخیلس پیاویك و نێرراوو کۆرسیش .. هتد .. هاتوون گۆرەویان لەپێ کردووە کە لەیونان هیچ کاتێك گۆرەویان بەکار نەهێناوە نەشیان زانیوە شتی وا هەیە[13] جا لە کۆتاییدا ئەڵێم لەکاتی هەڵبژاردنی شانۆیی یەکی کلاسیکی بۆجلو بەرگو ئێکسسوار پێویستە زۆر ووریاو لەسەر خۆبین زیرەکانە بگەڕێین بەدوای ژیان و ڕژێم و چۆنیەتی بەکارهێنانی و دروست کردنی چەك جلو بەرگو ڕەوشتی ئەوگەلەدا . کەئەودەقە شانۆیی یەی تیا نوسراوە ... ئەگینا گەر مەبەست لەپێش کەش کردنێك بێت کەکت و پڕی لای بینەر دروست بکەین ئەمە شتێکی ڕاست نی یە ...

*** دیکۆر ***

نەخشە کێشی دیکۆر مامۆستا (ئازاد جلال) کێشا بووی ... بەڕاستی دیکۆری شانۆیی یەکی کلاسیکی وەك (ئەفجینیا) هەر ئەوەندەی لەگەڵ دەکرێت .. چونکە تەنها یەك شوێن ئەتوانین بخەینە ڕوو ئەویش بەردەم ماڵی «ئاگاممنون» کەماڵی پاشایەکی واپلیکانەی لەبەردەم دایەو وەك یاساکانی « یەکەی شوێن » هەر ئەوەندە ئەتوانین ... کە ئەملاو ئەولای دوو ریز پلیکانەو پلیکانەکەی ناوەند لەچەقدا هاوبەش بوون کەخۆی لەخۆی دا هاوسەنگی و وردی و جوانی دروست کردبوو .. بەلام تەنها شتێك جێی گومان و تەرکیزی چاوی بینەر بوو .. ئەویش لای ڕاستی ئەکتەرەوە (نیوە پایەیەك) هەبوو کەمەبەست تەنها

هاوسەنگی) بوو .. بەلام لەهەمان کاتدا بوونی ئەو نیوە پایەیە شتێکی نامەعقولی سەیر لای چاوی بینەر دروست ئەکات ئێمە کە دەڵێین : ـ دیکۆرو ئێکسسوارەکان و پارچەکانی لەخزمەتی ئەکتەردابن .. ! تەنها دووکەش و ووشك و بێ دەنگ بوو . بەلام ئەبێت ئەوەمان لەبیر نەچێت کەنابێت هاوسەنگی و سێ گۆشە کردن (التثلیث) بەزۆرە ملێ بن و بەرەقی هاوار بکەن ... چونکە ئەمانە دووشتی گرنگن لەدەرهێناندا .. دەبێت لەدایك بووی چەشنی فرمانی درامی ساتی خۆیان بن چارەسەری ئەو نیوە پایەیە ، بەوە ئەکرا ئەگەر مەشخەڵێکی یان پەیکەرێکی لەسەر دانرایە بەمە چارەسەری ئەو هاوسەنگیە ئەکراو شتێکی بەنرخ و (مبرر) یش دەبووە ... بەلام لەهەمان کاتدا کاراکتەرەکان و پلەی هێزی و بێ هێزی و جل و بەرگ و رەنگەکان ... پەیوەندی یەکی گەورەیان بەهاوسەنگی و سێ گۆشە کردنەوە هەیە . بۆنموونە . ململانێی نێوان (ئاگاممنون و مینالاوس) لەسەرەتادا جوانترین هاوسەنگی و ئیجابی ترین کاری مامۆستا ئەحمەد سالار بوو لای چاوی بینەر کۆرس ئەم لاو ئەولای شانۆکەیان پڕ کردبوو وەك بینەر تەماشایان ئەکردو پاشانیش ململانێکەی مینالاوس و ئاگاممنون دەستی پێکرد لەم لاوە تا لەکۆتایی دا لە (ناوەندی ناوەند) ی شانۆدا مل ملانێکە کۆتایی پێ هات و ئاشت بوونەوە ... کەئەمە خۆی لەخۆیدا هاوسەنگی یەکی خاوەن بەڵگەی دایە چاوی ئێمە بەبێ ئەوەی کەبەزۆرەملێ دروستکرابێ .. بەڵکو خۆی لەدایك بووی کاری درامی بوو لەدیمەنەکەدا پاشانیش هاوسەنگی هەر بەرامبەر بوونی دووپارچە شت نی یە بەڵکو ئەبێت لەدایك بووی بیری نووسەر بێت .

لەکۆتاییدا رێزو سلاوم بۆ ئەحمەد سالارو هەموو مامۆستا بەرێزەکانی ئەم پەیمانگە پیرۆزە هەیە ... داوای پاشە رۆژێکی رووناك بۆ دەستە کیژان و کوڕانی ئەم پەیمانگا مەزنە دەکەین و هیوادارین کەئێمەی هونەر مەندان هەڵەکانی خۆمان راست بکەینەوە ... نەك کەسانێك کەلەسەر حسابی ئێمە دێن و بەبێ شارەزایی و دیراسەی ئەکادیمیانەی هەندێ حوکمی سەیر دەدەن بەسەر بەرهەمەکانماندا جادوا ئاواتم بەرزی سەرکەوتن و بەختیاری هەموو بەشدارانی شانۆیی (ئەفجینیالە ئولیس) ە سوپاس .

* الكترا ـ اسماعیل البنهاوی ص٧٠ ـ ص٧١
و اورست ترجمة وتقدیم / اسماعیل البنهاوی
* یوربیدز / ایلیا الحاوی / دار الكتاب اللبنانی مجلد ـ 3 ـ ص٣٤
* الكتراو اوریست / ترجمه وتقدیم اسماعیل البنهاوی ص٣٧

* سەرچاوەکان *

(1) لەمحاضرەیەکی د . عبدالاله كمال الدین ... مامۆستای (تاریخ المسرح) لە ئەکادیمیای بەغداد 1980 — 1981 پۆلی یەکەمی شانۆ .
(2) (ئەفجینیا لەئولیس) نووسینی / یوربیدس / وەرگێرانی ئەحمەد سالار
(3) لەمحاضرەیەکی د . مرسل الزیدی / فن التمثیل 1981 — 1982 پۆلی دووەم شانۆ .
(4) بڕوانە (فن الالقاء) الجزء الثانی / تالیف سامي عبدالحمید ـ بدری حسون فرید .
(5) بڕوانە [ مەزهەبەکانی شانۆکەری ] شمال عبدالله رەش لەکۆڕێکدا لەهاوینە هەواری صلاح الدین / هەولێر پێشکەش کراوە
(6) بڕوانە دەقی ئەفجینیا لەئولیس ...

(7) لەمحاضرەیەکی ست امتثال خلیل ابراهیم مامۆستای جل و بەرگ لەئەکادیمیای هونەرە جوانەکان بەغدا .. وەئەم مامۆستایە ئەم شهادانەی هەیە (ا) پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدادی تەواو کردووە لەگەڵ قوتابخانەی هونەری ماڵەوە بەشی جل و بەرگ و نەخشە کێشان (التصمیم) ساڵی 1962 (ب) شەهادەی دبلوم لەجل و بەرگی شانۆیی (پاریس) ی ساڵی 1967 وەرگرتووە ... (ج) [ شەهادە بکالوریوس ] لەدیکۆرو جل و بەرگ لەئەکادیمیای هونەری ، رۆما ساڵی 1975 وەرگرتووە . (د) (ماجستێر) لەجل و بەرگی شانۆیی لەزانکۆی (مشگن) لەئەمریکا ساڵی 1980 وەرگرتووە . (هـ) ئیستاش مامۆستای جل و بەرگە لەئەکادیمیای بەغدا بەهەموو پلەکانی یەوە .

(8) بڕوانە (مجلة المعرفة) عدد 22 / ص٣٤٠ فلورنسا في القرن الثالث عشر / بەوێنەوە .
(9) بڕوانە [ المسرح الدینی في العصور الوسطی ] عبد الرحمن صدقي ص٨٥ / بەوێنەوە .
(10) بڕوانە [ مجلة المعرفة ] عدد 66 / ص١٠٩٩ کەبەوێنەوە باسێکی بەناوی [ الاحذیة علی مرالعصور ] تێدایە لەیۆنان و رۆمان و نیل تاساڵی 1950 ز [ سەدەی بیستەم ]
(11) بڕوانە (المخرج في المسرح المعاصر) سعد اردش / ص٣١
(12) لەمحاضرەیەکی ست امتثال خلیل
(13) بڕوانە [ مجلة المعرفة ] عدد 41 [ ص٥٤٢ ـ ص٥٤٣ ] کەبەوێنە سوفوکلیس و سقراط و افلاطونی تیایە کەپێلاوی بێ کۆرمویان لەپێدایە .

# ڕەمزی مەلا مارف ـ ی شاعیر

**پێشەکی :**

ڕۆژنامەنووسیی « ڕادیۆ و تەلەفزیۆن » کە پارچەیەکی تەواوی هونەری ڕۆژنامەنووسی یە ـ هەتا ئێستا ـ لەنێو کورددا کە لە 1939[1] شەوە سەری هەڵداوە ، لە لایەن هیچ کەسێکەوە ـ زانستانە ـ نە باسی کراوە ، نە بایەخی پێدراوە .

ئەم فەرامۆشی یەش ، کارێکی وەهای کردووە ، گەلێ کەم و کورتیمان پێوە دیار بێت . لەوانەدا نرخی ڕاگەیاندن و کارکردنە سەرجەماوەر ، نەزانین کە ئەمە بەنێوچەوانی هوشیاریی جەماوەرەوە دیارە . هەروەها گەلێ یادگاری کردەوەو بەرهەمی کەسانی بەدەسەلات ، لێهاتوو ، دەست ڕەنگینی نێو میللەتەکەمان لەدەست چووە کە جارێکی تر دروست نابنەوە ، هەر هیچ نەبێت دەنگ و ڕەنگیان .

ئەو فەرامۆشی یە ، بارێکی وەهایشی خوڵقاندووە ، لە لایەك هونەرەکە و قۆناغەکانی ، هۆیەکانی دوواکەوتن و پێشکەوتنی ، پیاوەکانیان نە ناسرێنەوە . لە لایەکیشدا کەسانی نەشارەزای بێپشتیوانی ڕۆشنبیری ، بێنە ئەو مەیدانە ناسکە و ببنە مایەی چەواشەکردنی ئەو ڕوخسارە شارستانی یە .

ئێمەیش کە بەدووی ڕایەڵەی ئەم باسە کەوتووین ، سەرپێیش بێت ، لا لەو ڕاستی یە دەکەینەوەو ـ لێرەدا ـ دەڵێین : هونەری ڕۆژنامەنووسیی ڕادیۆ ، لە پاش 1958[2] ەوە ، چووە قۆناغێکی جیاواز چ جای پێشکەوتوو ، بەتایبەت کە بۆ ـ یەکەم جار ـ بیری ڕۆژنامەنووسیی ، جووڵەی بە مایکرۆفۆنی ـ نێو ستۆدیۆ ـ خست و دەری پەڕاندە کۆڕ و نێوەندی ڕووداوەکانەوە . بۆ وێنە ، چووە : (یەکەم کۆنگرەی مامۆستایانی کوردستان : شەقلاوە ـ 1959/9/11 کە گەلێ باس و ڕووداو و ڕیپۆرتاژ بۆ ـ یەکەم جار : بەتەلەفوون ـ هەروەها گفتوگۆ و چەند بەرهەمی زیندووی چەند شاعیرانێکی وەك : قەدری جان ( = عەبدولقادر عەزیز جان : 1916 ز ـ 1972 ز) و عەبدوڵلا گۆران[3] ، تۆمار کران و بڵاو کرانەوە .

ئەو قۆناغەش کە موخابن تەمەنی زۆر کورت بوو ، تەنانەت وەك ـ کۆلێومانەتەوە ـ زۆربەی یادگارەکانیشی سەرگەردان بوون و سراونەتەوە ، لە سەرەتای 1966[4] ەوە ، سەری هەڵدایەوە . ئەمە لە هەلێکدا ـ ڕۆژنامەنووسیی کوردیی چاپکراو ـ قەدەغە کرابوو .

ڕاستییشە کە ئەو قۆناغە چ جای هونەری ڕۆژنامەنووسیی ڕادیۆ ـ تەلەفزیۆن ، بەزەبری پێشکەوتنی ڕۆژگار گۆڕینەکانی باری سیاسی و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتیی ، هەروەها بەزەبری بڵاوبوونەوەی دەزگای تەکنیکی جۆری بەجۆری پەیوەندیی بەستن ، کارێکی ئەوتۆیان گێڕا کە هونەرەکە هەر لەنێو دەزگای ڕادیۆدا گیرنەخووات و تەشەنە بکات بۆ نێو جەماوەرێکی پان و پۆری خاوەن ڕۆشنبیریی جۆر بەجۆر کە تەنانەت شێوازیشی لەلای ڕۆژنامەنووسیی چاپکراودا پەیرەو دەکرێت و جەماوەریش بۆ ئارەزوو بێت یان بۆ پێویستیی ، ڕەفتاری لەگەڵ دەکات .

ئەم 2 یادگارەی لەم گۆڤارەدا بە ووردی یەوە نیشان دەدرێن ـ کە نموونەی دەست لەملانێی سێ جۆر ڕۆژنامەنووسی یە ـ دوو وێنەی ئەو قۆناغەیە کە ساڵانی 1970 گەرمەی بوو[5] ، هەتا لە ساڵی 1972 شدا ـ یەکەم وێنە ـ ی ڕۆژنامەنووسیی تەلەفزیۆنیی[6] دەرەوەی ستۆدیۆشی بەدوودا هات . گرنگیی ئەم یادگارانەش لەوەدا نی یە کە بە سیفەتە تایبەتەکانیان هێندێك ـ جیاوازیی ـ نێوان (ڕۆژنامەنووسیی : چاپکراو ، بیستراو ، دیتراو) نیشان دەدەن ، بەڵکو ئەوەش گرنگە کە لەمەڕ ـ شاعیرێکە ـ کە چەند بەدەسەلات و ناسراویش بێت ، هێشتا (دیوانی چاپ نەکراوە) و هێشتا لە ئەدەبی کوردییدا ، بەر لێکۆڵینەوەی زۆر نەکەوتووە کە پێشبینیی دەکەین ـ پاشەڕۆژ ـ دەیەها لێکۆڵینەوەی لەسەر دابنرێت . جگە لەوانە و لەوەش کە ئەم دوو یادگارە بێوێنەن ، شاعیریش خۆی ، لەوە دنیادایە و جارێکی تر نایەتەوە زمان .

**یادگارەکان**

* **یەکەم : ڕادیۆیی ـ 1971/8/20**
* **دووەم : سینەمەیی بۆ تەلەفزیۆن ـ 1972/12/1**

**یادگاری یەکەم :**

گفتوگۆیەکی ڕادیۆیی تێکڕایە ، بەماگنێتەفۆنی جۆری « ناگرا ـ خێرایی : 7/5 » لە ماڵ و ژوورە کوردەواری یەکەی خۆی ، لە سلێمانییدا ، خۆمان تۆمارمان کردووە[7] . وەك گفتوگۆیەکی پاك : 23/38/48 دەقیقەیە + 1/52/00 دەقیقە : شیعری ـ ئەی دڵ[8] .

وەك بەرنامە[9] : 28/16/15 دەقیقەیە . لە هاوین و پاییزی



## کەمال رەئووف محەممەد

1976 + بەهاری 1976 دا لە بەرنامەکەدا « شەوچەرەیەکی کوردەواریی : ـ کەمال رەئووف محەممەد » دا بلاوکراوەتەوە . بەرنامەکە و ئەسلەکە ـ هەتا 1981 کە ئاگاداریبووین ـ بێ دەستکاریی لە ئارشیڤدا هەلگیرابوون . قسەکان وەك خۆیان و شیعرەکان بەرێنووسی باو ـ نەك وەکو دەمو دووی خۆی[10] ـ لێرەدا نووسراونەتەوە . بۆ دووبارە نەبوونەوەی ـ ناومان ـ « ك . ر . م » بۆخۆمان داناوە .

● **گفتوگۆکە** :

ئ . ر . م :

...[11] ، خوا لێخۆشبوو ، مامۆستا رەفیق حیلمی لەسەر ئەم مامۆستا بەرێزەمان ، لە کتێبی ـ شعرو ئەدەبیاتی کوردی[12] ـ یا ئەلێ : [ لەسەر سنووری بوێژەکانی دەوری کۆن و تازەدایە . ناتووانین بلێین کە بەتەواویی ، شاعیرێکی تەقلیدییەو هەر پەیرەوی بوێژە کۆنەکانی کردووە ، بەهەموو مانای ووشە ، بە شاعیرێکی عەسریی نازمێررێت . بەلام بەئەسپایی ولەسەرخۆ ، لە هەردوو نەتەوەکانی وەرگرتووە و لە چەشکەی هەردوو لادا بەشدارە . گاهێ مەوضووعێکی کۆنی وەکو ستایش وە یا شین (مەرثیە) ی لە قالبێکی تازەدا ، گاهێکیش مەوضووعێکی تازەی وەکو شیعرێکی نیشتمانییو یا کۆمەلایەتیی و یا وەصفی (تەبیعەت) ی لە قالبێکی کۆنا کردووە بەشیعر . ئەوەندەی لە مەوضووعە تازەکانا بەرەو دووا رۆیشتووە ، لە کۆنەکانیشا ئینکار ناکرێ ـ ئەوەندە روو لە پێشەوە بووە ـ واتە نە پشتی کردووەتە تازە وە نە رووی لە کۆن وەرگێراوە . لەگەڵ ئەمەیشا ئەبێ بە تازەپەرست ، واتە بە (متجدد) بدرێتە قەلەم ! ]

مامۆستای بەرێزمان کە قسەی لێئەکەین ، رەمزی مەلا مارفە [ محەممەد رەمزی کوری مەلامارف[13] ئەفەندی ـ قاضی ـ کوری سەیید رەسوولە[14] ، کە لە نەوەی ـ پیرخدر ـ ی شاهۆیی‌یە لە دایکیشەوە ، کچەزای موفتی مەلا ئەمینی نەوەی ـ موفتی چاومار ـ ی بەناو بانگە . لە سالی 1902 ی میلادیی لە شاری سلێمانیی هاتووەتە دونیا . لە تەمەنی 6 سالیدا خراوەتە بەر خوێندن و لەلای خوا لێخۆشبوو مامۆستا مەلا سەعیدی[15] ـ زلزلە ـ یی قورئانی تەواو کردووە . دووای ئەمە لەسەر دەستووری ئەو رۆژە ، کتێبە فارسی‌یەکانی وەکو ـ سمایل نامە ـ و ـ گولستان ـ و ـ بوستان ـ ی سەعدی و دیوانەکەی خواجە حافظی شیرازیی خوێندووە . بەینێك چووەتە قوتابخانەی عەسکەریی سلیمانی کە پێیان ئەووت ـ روشدییە[16] ـ بەلام لەوێوە گوێزراوەتەوە مەکتەبی ـ ئەعدادیی مولکییە[17] ـ تا پۆلی چووارەمی تەواو کردووە . لەم مەکتەبەدا ماوەتەوە ئینجا ئەمیشی بەجێ هێشتووە و گوێزاویەتە مەدرەسە ئەهلی‌یەکان وە لە لای مەلایان خەریکی خوێندنی عولوومی دین بووە .

جگە لە کوردی کە زمانی خۆیەتی ، تورکیی و عەرەبییشی ئەزانی وە لە زمانی فارسی‌یا شارەزایە . بەتورکیو فارسیی وە بەتایبەتی بەفارسیی گەلێ شیعرێشی داناوە . لە 1927 ی میلاددا بووە بە مەئمووری حوکوومەت ، لە 1940 دا لە هەولێر مودیری مال بووە . لە 1945 دا لە سلێمانی پشکنینی ئیرادی حوکوومەتی ـ مدققی واریدات ـ ی پێسپێرراوە ، ئیتر وەختی دووای ئیش وکاری رەسمیی خۆی ، جارێ لە مەجلیسی موفتیی خوا لێخۆشبوو ـ بێخود ـ ی شاعیری بەناوبانگ و هەندێ جار لە مەجلیسی ـ پیرەمێرد ـ ی[18] ئوستاذی شیعر و ئەدەبا ، رابوواردووە و لە ئەنفاسی پر فەیز و هاونشینی ئەم دوو شاعیرە ، گەلێ بەهرەمەند بووە . ]

وا ئێستا کە لە خزمەتی مامۆستای بەرێزاین ، شەوە ، سەعات خۆی ئەدا لە دەوری 9 لە رۆژی 20 ی مانگی 8 ی 1971 . پێش هەموو شتێك روو ئەکەینە مامۆستای بەرێزو ئەلێین : شێوەی شیعری کام شاعیر کاری تێکردوون ، وە ئایا خۆتان بەوە ئەزانن کە لەسەر رێرەوی شاعیرێکی خۆتان یان هاوچاخی خۆتان شیعرتان ووتبێت ؟

**شاعیر** :

ئەساسەن ، من لە شیعری فارسیی و موتالەعەی شیعری فارسیی ، دیوانی (سەعدی) و (بێدل) و (حافز) و ئەوانەم



کردووه . وه زیاتر ئەوی تەئسیری تێکردبم ، شیعری ئەمانەیە و سەعدی و حافز و بێدل ـ ە . وە لە هاو عەسری خۆشما (پیرەمێرد) شیعری خوا لێخۆش‌بوو (بێخود) ، (زێوەر) ، ئا ئەمانەم موتالەعە کردووە وە لە فارسییش بەهرەم وەرگرتووە . وە لە شاعیرە کۆنەکانیشا شیعری (حاجی قادری کۆیی) ، (نالی) ، شیعری (سالم) ، شیعری (کوردی) ی کە شیعرەکانی (کوردی) ی هەمووی پڕیشککارە ( = پڕیشکدارە / ك . ر . م) ، ئەمانەم وەرگرتووە . ( = واتە بەهرە / ك . ر . م ) .

**ك . ر. م :**

گەورەم ، لە کتێبی « شعرو ئەدەبیاتی » مامۆستا رەفیق حیلمی‌یا ، شیعرێکت هەیە بەناونیشانی (سەرزەنشت)[19] ، ئەگەر بفەرموون بۆمان بگێڕنەوە بۆ ئەوەی لە دوواییا پرسیارێکتان لێبکەین !

**شاعیر :**

(لە بریی گێڕانەوەی شیعرەکەی .. بەزەردەخەنەیەکی ووشکەوە) ئەو سەرزەنشە ، مەعنای ئەوە نی‌یە کە بەهینی تێبکەن ... سەرەنشێ کە لە ڕووی دڵسۆزی‌یەوە بێ ، ئەو سەرزەنشە ، لە ڕووی دڵسۆزی‌یەوەیە . مەعنای ئەوەیە ، میللەتێك ، میللەتەکەم ئە ئاوا بێ وەکو میللەتانی پێشکەوتووکە وا لە جێ‌یەکا ووتوومە :

**خەڵکیی بەزۆری بازووی فەن گەییشتە ئاسمان**
**ئێوەش خەریکی بەزمی هەلووکێن و هەڵمەقۆن**

غایەم ئەوەیە ئێوەش لا بدەن ، بگەنە ئاسمان وە عیلم بخوێنن . وە لە جێ‌یەکیشا ، هەمیسان ( = هەمدیسان / ك . ر . م) دووبارە هەر لەو غەزەلەدا (؟) ووتوومە :

**بۆ غەیریی بەستنی کەمەری نۆکەریت لەچی**
**بۆ پیاوی ناڕەسەن[21] چی‌یە وا هێندە سەرفرۆن ؟**

غایەم ئەوەیە کە تێبگەن وکەمەر بۆبێگانە نەبەستن وخزمەتی خۆ و خزمەتی یەکتری بکەن . لەما ، سەرزەنشەکەم دڵسۆزانەیە ، وە خۆشتان ، هەموو لایەك ئەیزانن کە (بەجۆشەوە ( ك . ر . م ) من کوردم و هەر بەکوردیی بووم و بەکوردیی ئەژیم و بەکوردیی ئەڕۆم

**ك . ر . م :**

گەورەم ، هەندێ ڕۆژهەلاتشوناسی (هەروەها کوردشوناسی / ك . ر . م) بێگانە زمانی کوردیی بە زمانێکی پڕ مۆسیقە وڕازاوە ئەزانن ، جا بێگومان ئەوڕایەیان کە زمانی کوردیی زمانێکی وایە ، شیعریش ئەگرێتەوە ، ئایا ڕای جەنابتان چی‌یە ؟

**شاعیر :**

زمانی کوردیی بەتێگەییشتنی من و ئەوی کە وا من فەرقم پێکردبێ ، زمانێکە لە زمانە ڕاقی‌یەکان ڕاقی ترە . وە بۆ هەموو نەوعە شتێك ، ئەگەر لەوان زیاتر نەبێ ، لەوان کەمتر نی‌یە . (گەڕایەوە سەر باسی سەرزەنشتەکە کە دیار بوو ئەو باسە کاری تێکردبوو / ك . ر . م) وە مەسەلەی ئەو سەزرنشەش هەمەمیسان دووبارە هێناتە مەیبان ( = مەیدان / ك . ر . م) ئەوە مەقسەدم سەرزەنش نی‌یە و مەقسەدم تەعن و تووانج نی‌یە لە کورددان . مەقسەدم پێگەییشتنی کوردە ، مەقسەدم تێگەییشتن و پێگەییشتنیانە و سەرکەوتن و پێشکەوتنیانە .

**ك . ر . م :**

گەورەم ، ئەگەر ڕێی پچووکتان بدەن پرسیارێکی تر ئەکەم . هەندێ کەس ئەڵێن : شاعیرمان زۆرە وە هەرچی هەڵئەستێ شیعر ئەڵێ . هەندێکی تریش ئەڵێن ؛ ئێمە شاعیری گەورەمان زۆر کەمە ، جەنابتان لەمەڕ ئەم دوو شتە ئەڵێن چی ؟

**شاعیر :**

براگیان . شاعیرمان زۆرە ، شاعیری گەورەشمان هەر زۆرە ،



.ە شاعیری گەورەی لەمەو پێشیشمان هەر زۆر بووە . مەسەلا مەولەوی) ، لام وایە کە (فیردەوسی) ، ئێستا لە ئێرانا ەشهوورەو مەعلوومە و هەر لەپاش هەزار ساڵ حەفلەیان بۆ کرد ، ئەگەر کورد ، بێتو (...) ببێ ، مەولەوی یەکێکە ەوانەیە ، کە لەپاش هەزار ساڵ ئەبێ حەفلەی بۆ بکرێ و حەفلەی تەئبینی بۆ بکرێ . شاعیری گەورە لە کورددا بووە ، ەقەت کورد چونکە کیانی نەبووە ، زۆری ڕۆیشتووە و لە کونجی مزگەوت و لە کونجی ئەمانەدا (واتا : هاوتای مزگەوت / ك . ر . م) وون بووەو هیچی چاپ نەکراوە ، نەکراوە بەهیچ (واتا : لەدەستچووە / ك . ر . م) وە ئیللا ئەو شاعیرەی لە کورددا بووە ، من لام وایە لە هیچ دەوڵەتێکی ترو حوکوومەتێکی ترو میللەتێکی ترا نەبووە . .

**ك . ر . م :**

سوپاست ئەکەم گەورەم . ئەگەر ڕێی پچووکتان بدەن پرسیارێکی تایبەتی ئەکەم .. (بەدەم پێکەنین و بێزاری یەوە هاتە ناو قسەمەو گوتی : کورە ئاخر ، با لەپێشەوە موڵەتت بامایە شتێکمان ڕێك بخستایە ، وانی یە ؟) .. ئێستا بەڕێزتان وا بەساڵا چووە ، هەست بەوە ئەکەن کە وەکو ڕۆژانی لاویتان یان پاش لاویتان شیعر بڵێن ، یانەء ، وە بۆچی ؟

**شاعیر :**

وەڵڵا براله ، زەوق ، زەوق پیر نابێ . دڵ پیر نابێ ، قابیلە دڵ پیر ببێ و زەوق پیر ببێ ؟ ئەگەر ئێستاکە زەمان ئەگەڕێتەوە زەمانی پێشوو ، لە زەمانی پێشوو چاکتر شیعر ئەڵێم و گەنج تر ئەبمەوە !!

**ك . ر . م :**

گەورەم ، پرسیارێکی تر ، بیرەوەریتان لەگەڵ کام شاعیر هەیە کە هەرگیز لە بیرتان ناچێتەوە و یادگارەکانیتان لە بیرە .

**شاعیر :**

لەگەڵ پیرەمێرد . لەگەڵ زێوەر ، لەگەڵ ئەمانە ، وە لە فارسیشا ، سەعدی ، بێدل ، حافز ، فیردەوسی ، ئەمانە لەبیر ناچێ !

**ك . ر . م :**

بەڵێ بیرەوەریی ئاوها لەگەڵیا ژیابن وە شتێکیان کاریان کردبێتە سەر جەنابتان کە قەت لەبیرتان ناچێ . حادیسەیەك ، ڕووداوێك ، دانیشتنێك ؟

**شاعیر :**

وەڵڵا زۆر دانیشتن بووە ، لەگەڵ پیرەمێردا ، لەگەڵ زێوەرا ، زێوەر کە ئوستادم بووە . زۆر دەفعە دانیشتووین پێکەوە و قسەو موجادەلە و موباحەسەی شیعریی و ئەدەبیی کراوەتەوانێ . فەقەت ئێستاکە شتێکی .. (قسەکەی بڕی / ك . ر . م) لەگەڵ بێخودا ، شەوو ڕۆژ لەگەڵ بێخودا کە خاڵم بووە و دائیما پێکەوە بووین . فەقەت ئێستاکە شتێکی وام لە خەیاڵ نی یە کە ئێستاکە بڵێم تەئسیری کردبێ وە یا شتێکی وا ..

**ك . ر . م :**

گەورەم ، وا بزانم بەبۆنەی کۆچی خوا لێخۆش بوو ، شاعیری کوردپەروەر ـ پیرەمێرد ـ شیعرێکتان هەیە ، نازانم دێتەوە بیرتان ؟

**شاعیر :**

بەخوا ئێستا لە فکرم نی یە . فەقەت هەمە . لەو خوسووسەوە هەمە . هەتا لەم حەفلەیەشا بەسەر دەسەوە ( = دەستەوە / ك . ر . م) هەروا ، تەکلیفیان لێکردم ، دوو سێ شعرم هەر نووسیی . لەم حەفلەی ئەخیرەیشیا :

**ئەی پیری پایەبەرزی وەتەن پەروەری نەمر**
**وەی گیانفیدای قەومی جەفاکێشی بێنەوا**
**هەرچەن کە وا نەماوی لەبەر چاوی زاهیریی**
**وا تێنەگەی کە دووری لەبەر دیدەی دلا**

تۆ ئەو ئەدیبە پایە بڵندەی کە تا ئەبەد
هەر بەردەوامە ناوو نیشانت لە عالەما
سەر بێنە دەر لە قەبر تەماشاکە قەومەکەت
چیت بۆ ئەکەن لە کۆڕێ لە خۆدان و شیوەنا
تێفکرە شاعیر و ئودەبای وڵاتەکەت
چیت بۆ ئەڵێن لە حەفلەی تەئبین و ماتەما
ساتێ لە کردەوەی هونەر و جەوهەرت ئەدوون
ساتێ سوپاسی خزمەت و فیکرت ئەکەن ئەوا
« رەمزی » بەدەم هەنسکەوە دائیم بەسۆزی دڵ
پاڕانەوەی وەهایە لە یەزدانی کیبریا
یا ڕەب بە حەققی ذات و سیفات و کەلامی خۆت
یا ڕەب بەجاهی لەوح و قەلەم نووری مستەفا
لەم پیرە بێنەوایە ببووری بەلوتفی خۆت
بیخەیتە بەر شەفاعەتی سالاری ئەنبیا

ک . ر . م :
زۆر سوپاست ئەکەم گەورەم . جارێ ئەم مەرسییەتان بەرامبەر خوا لێخۆشبوو حاجی توفیق ، لە ساڵی چەنا ووتووتانە ؟
شاعیر :
لە ساڵی 1950[24] دا .
ک . ر . م :
گەورەم . ئەم پرسیارەشم هەیە کە شاعیرە لاوەکان زۆر بە لایانەوە گرنگە کە جەنابتان ڕات دەربڕیت ، ئەویش ئەوەیە : شیعری لاوەکانتان ئەخویننەوە وە شیعریان چۆن ئەبینن ؟
شاعیر :
(پاش ماوەیەك لێدووان - بێتۆمارکردن[25]) هەموویان باش ئەبینم . هەموویان . بیلخاسسە شیعری کاکەی فەلاح . ساڵح دیلان . جەمال شابازێری . هەموویان باشن ، هەموویان . هەموویان . هیچیان فەرقیان نییە و هەموویان شاعیرن و هەموویان ئەدیبن .
ک . ر . م :
گەورەم ، پێش تۆزێك[26] فەرمووتان کە دووا شیعرتان هەیە ، ئەویش بریتییە لە روباعییەتێك ( = چووارین / ک . ر . م) ئینجا ئەمە ئەگەڕێتەوە بۆ چەند مانگ لەمەوبەر یان چەند رۆژ لەمەوبەر و ئەو شیعرە چییە ؟
شاعیر :
لەم ڕۆژانا حەفلەیە ، کۆنگرەیە لە هەولێر گیرا . لەو حەفلەیا ئەم دوو شیعرە ئەو رۆژە ، دووا شیعرمە . ئەو رۆژە ووتوومە :
ک . ر . م :
کۆنگرەی یەکێتی نووسەرانی کورد . دووەم کۆنگرەی کە لە هەولێرا گیرا لە 14 — 17 ی تەمووز .. بەڵێ ..
شاعیر :
ئەو روباعییەش ئەمەیە .

برا کوردینە ئیتر بەسیە سەرخەو
دە هەڵسن ڕاپەڕن وا تێپەڕی شەو
تەماشایەکی ئاسۆ بکەن ، بزانن
شەوە یا ڕۆژە ، ڕۆژی کۆنە یا نەو

ئەم دوو شیعرەم ئاخیر شیعرمە (27)
ک . ر . م :
گەورەم . ئەگەر ڕێی پچووکت بدەی ئەم پرسیارەش ئەبێ بکەم .. (شاعیر لەبەر خۆیەوە بە خەندەوە گوتی : بەخوا حەشرم پێ ئەکا) .. لەوەتی بەڕێزتان هەن ، هەتاکو ئێستا تاقە هیواتان چییە کە هەمیشە خولیایی و گیرۆدەیی بوون ،
شاعیر :
وەڵلاهی خولیای ئەووەل و ئاخیرم ئەوەیە خوا میللەتەکەم پێ بگەیینێ و بێتە ڕیزی میللەتان و ببن بەپیاو و یەك کەوین . (بەتوندی / ک . ر . م ) یەك کەوین . ئەمە هیوای ئەووەڵ و ئاخیرم و دوعای ئەووەڵ و ئاخیرم ئەمەیە .
ک . ر . م :
ئومێدەوارم ئەم هیوابەرزەی ئێوە وکە هیوای هەموو بەشەرەفە بێتە دیو پێی شادو شوکر بین .
شاعیر :
(لەبەرخۆیەوە) ئینشائەللا .
ک . ر . م :
گەورەم . جەنابتان ، تەمەنتان ئێستا لە شەست و نۆ ساڵایە . بێگومان خۆشتان ئەزانن ، ژیان ئیمتیحانێکە بۆ ئینسان . ئینجا جەنابتان ڕاتان چییە بەرامبەر ژیان ، هەروەها بەرامبەر مردنیش .

شاعیر :

گینەکەم . ژین و ژیان تا بڵێی خۆشە . فەقەت بەشەرتێ خۆشە ئەمن و ئاسایش حوکم فەرمابێ وە لەناو میللەتێکا خۆشە کە یەکبن . لەناو میللەتی وا قیمەتی ژین تەواو نابێ و پیاو ئەتوانێ تەقدیری قیمەتی ژین بکا .. ( بەپێکەنینێکی خۆش و بەرپچڕەوە / ك . ر . م) .. وە تەبعەن مردنیش شتێکی ناخۆشە و ئەوە هیچ ئیجاب ناکا بەتەفسیلات و ڕەدد و بەدەل .

ك . ر . م :

باشە گەورەم ئەتوانم ئەم پرسیارەش بکەم : چ ئامۆژگاری‌یەکتان هەیە بۆ نەوەکانی ئەم ڕۆژی نەتەوەی کورد ؟

شاعیر :

ئامۆژگاری‌یەك ئا ئەمەیە .. ئەوا ئێمە ڕۆییشتین وەکو لە حەفلەی هینا(*) بەحسم کرد :

**زەمانی ئێمە وا ڕابورد و ئێستا جێی هیوا ئێوەن**
**بەری باخی ئومێدی قەومی کوردی بێ‌نەوا ئێوەن**

ئەووەڵ و ئاخیر ، نەسیحەتی من ، ئامۆژگاریی من ، فەریایی ( = فەریادی / ك . ر . م) من بۆ ئەم نەوەی پاشە ( = پاشەڕۆژ / ك . ر . م) ئەوەیە ، یەك کەوون . پشتی یەکتری بگرن . دەستی یەکتری بگرن ، وەکو برا لەگەڵ یەکتریا هەڵسن و دانیشن . ئەم ناحەزی و دووبەرەکی‌یە لە بەینا نەمێنێ ، ئەگەر ئەمە ببێ لە قەبریشا ، ئاواتەکەم یەتە دی و زۆر پێ‌خۆش حاڵ ئەبم !!

ك . ر . م :

گەورەم ، پێش ئەوەی لە خزمەتتان مەرەخەس بین ، ئایا چ جۆرە مۆسیقە و دەنگی گۆرانیبێژێکی کورد ، هەتا ئێستا کاری تێ‌کردوون و حەز بەبیستنی ئەکەن ؟

شاعیر :

برا گیان . بەڕاستیی دەنگی سەیید عەلی ئەسغەر ، لەوانەیە لە هەموو کەسێ نەك لە من ، لە هەموو کەسێ تەئسیر ئەکا . وە ئەوی کە من پێم خۆش بێ و زیاتر پێم خۆش بێ ، دەنگی عەلی‌ئەسغەرە و حەمە ساڵحە و عەلی مەردان : قەتارو ئەڵڵاوەیسی‌یەکەی کە بەڕاستیی زۆر تەئسیرم تێ‌ئەکات وە کە ئەمانەم گوێ لێ‌ئەبێ ، لەوانەم بێ‌هۆش بکەووم ؟

ك . ر . م :

ئەی هی مەلا کەریم ؟

شاعیر :

بەخوا ئەو ناگاتە ڕیزەی ئەوان ، دەرجەی ئەوان .

ك . ر . م :

جا باشە .. (قسەی پێ‌بڕیم / ك . ر . م)

شاعیر :

ئەویش هەر خۆشە . پێم‌خۆشە .

ك . ر . م :

وەکو دەڵێ : کە دەڵێن ئەمڕۆ دەشت و کیۆ شینە(*) .

شاعیر :

زۆر خۆشە . ئەوە زۆر بەزەووق ئەیڵێ . مەلا کەریم لە دڵەوە ئەیڵێ . زۆر خۆشە .

ك . ر . م :

جا جەنابت لە کام ئەو گۆرانیبێژانە حەز ئەکەیت ، گۆرانیی‌یەکت بۆ هەڵبژێرین و پێشکەشتی بکەین بۆ ئەوەی ، ئومێدمان ئەوەیە ، دڵت پێ خۆش بێ ؟

شاعیر :

ئەڵڵاوەیسی‌یەکە و قەتارەکەی عەلی مەردان لە هینی عەلی ئەسغەریش هەر کامێکیان بێ ..زاتەن بەمەقام هین نابی ! .. هەر بەستەیە هینی عەلی ئەسغەر(*) . حەمە ساڵحیش لە مەقاماتا یەکەمە ، هەر مەقامێکی بێ ، پێم خۆشە(*) !

ك . ر . م :

گەورەم . گوێگرە بەڕێزەکانمان زۆر بەختەوەر ئەبوون ئەگەر شیعرێکتان پێشکەش بکردنایە بە دیاریی ، کە شیعرێ بێ هێشتا بە ئێستگە ( = رادیۆ / ك . ر . م) بڵاو نەکرابێتەوە .

شاعیر :

ئەم سێ چووار شیعرە لە ساڵی 43 — 44 ( = 1943 — 1944) لە هەولێر ، لە بەزمیکا(*) ووتوومە :

**لە مابەینی دوو دولبەردام و حەیران و دوو دڵ ماووم**
**کە دڵ ئاخۆ بەکامێکیان بدەم ، لەم بەینە داماووم**

بەزۆری حوسن و بازووی نەوجووانیی خۆی ئەوی ئەم لا
کەمەندی زوڵفی خاوی خستە ئەستۆی فیکری شێواووم
بەکەعبەی ڕوومەت و تاقی خەمی ئەبرۆ ، ئەوی ئەو لاش
لە ڕێگەی عەقڵ دەربردم ، لە جادەی دینی لا داووم
لە فیتنەی چاوی سەرخۆشی ئەوی ئەم لا ، نییە باکم
بەغەمزە و ناز و ئاوازی ئەوی ئەم لایە کوژراووم
ئەگەر لوتفی ببێ یا زەررەیە ڕەحمی لە دلدا بێ
ئەزانێ بۆ بەحەسرەت وا لە ڕۆژی کوڵی ڕاماووم
ئەبێ ئەم جێیە جەننەت بێ کە وا پڕ حۆرییە یاخود
شەوە و من خەو ئەبینم ، یا پەرین و دێنە بەرچاووم
بەیادی چاوی مەستی ، بادە نۆشیم هێندە پێخۆشە
ئەڵێی ڕۆژی ئەزەل وەك نەشئە هەر بۆ بادە خوڵقاووم

ك . ر . م :

زۆر زۆر سوپاس گەورەم . ئومێد ئەکەم کە دیارییەکەتان هەرگیز لە بیر گوێگرەکان نەچێت کە بۆ یەکەم جار بەڕێزتان لە ئێستگەوە دەنگتان دێت و دیاریی پێشکەش گوێگرە بەڕێزەکان ئەکەن . (ئیمای بۆ کردم و ڕاوەستام و پێی گوتم .. / ك . ر . م) . ئا لێرەدا گوێگرە بەڕێزەکان ئەبێ بووەستم ،چونکە مامۆستای بەڕێز هەر لەم کاتا کە من ئەم قسانەم ئەکرد شیعری بۆ هات وا بەچەند بەیتێك وەکو ئیمام بۆ ئەکا ، خۆی پێشکەش ئێوەی بەڕێز ئەکا :

شاعیر :

موخلیسی خانەدانی گەیلانیی
کەمتەرین شاعیری سولەیمانیی
حەمەیە ناو و شوهرەتم ڕەمزی
بولبولی سەرچلی ڕەسەن بەرزیی
باوکم حاکمی شەریعەت بوو
حامیی دین و ڕێی تەریقەت بوو
والیدەم کیژی موفتیی چاومار
عالمێکی شەهیدی عالی تەبار
جەددی ئەعلامە سەییدولشوهەدا
نووری دیدەی ئەمینی وەحیی خودا
ئەمەیە ناوو شوهرەت و لەقەبم
ئەمەیە ڕیشە و ڕەگی نەسەبم

ك . ر . م :

…………[33] (پاش سوپاسکردنی ، تکام لێکرد شیعرێکی تر ، بەدەنگی خۆی بگێڕێتەوە . ئەویش ئەم شیعرەی گێڕایەوە ، بەناونیشانی : ئەیدل / ك . ر . م ) .

ئەی دڵەی دائیما خەفەتبارم[34]
وەی لە جێگەی هەموو کەس و کارم
مەحرەمی گەنجی کونجی ئەفکارم
هەڵگری باری قورسی ئەسرارم
هەمدەمی ڕۆژ و یاری شەوگارم
ئەمە بەینێکە بۆچی تۆراوی ؟
وەکو هەنگ بۆ لە من وورووژاوی ؟
لەسەر و چاوی هەستم ئالاوی ؟
خۆ تۆ هەر ئەو دڵەی نەگۆراوی
پێم بڵێ گەر لە خشتە نەبراوی
بۆچی لێم عاجزیت و ڕەنجاوی ؟
ووتی ووس ئەی لە هۆزی بێ سەرو پێ
عاقڵان چاتری ئەزانن لێ !
ووتم ئەی باخەوانی باخی حەیا
وەی دڵەی جەنفیدایی ئەهلی وەفا
چیت لە من دیوە تاکو ئێستا کە وا
ساڵە وەختێکە هەروەکو عونقا
لێم خزاویتە کێوی قاف جەفا ؟
دەبڵێ توو بیو کەلامی خووا
ئەمە بەینێکە بۆچی تۆراوی ؟
وەکو هەنگ بۆ لە من وورووژاوی ؟
لەسەر و چاوی عەقڵم ئالاوی ؟
خۆ تۆ هەر ئەو دڵەی نەگۆڕاوی ؟
پێم بڵێ گەر لە خشتە نەبراوی
بۆچی لێم عاجزیت و ڕەنجاوی ؟
ووتم : ئەی پیرە ژیرەکەی خۆش خوو
وەی دڵەی یەك زمان و ڕەنگ و ڕوو
پێشڕەوی کۆچی هۆزی دوواکەوتوو

چ گوناهـ و قەباحەتێکم بوو
کە منت کردە تیزە جاڕی عەدوو ؟
دەبڵێ هەی لە ڕێی وەفا دەرچوو
ئەمە بەینێکە بۆچی تۆراوی ؟
وەکو هەنگ بۆ لە من ووروژاوی ؟
لەسەر و چاوی هەستم ئالاوی ؟
خۆ تۆ هەر ئەو دڵەی نەگۆڕاوی
پێم بڵێ گەر لە خشتە نەبراوی
بۆچی لێم عاجزیت و ڕەنجاوی ؟

. تەواو .

**یادگاری دووەم** :

گفت‌وگۆیەکی سینەمەیی تەلەفزیۆنییە . پێشنیار و ئامادە کراومانە . وێنەگری سینەمەیی تەلەفزیۆنی بەغداد : عەبباس خەلەف ، بەکامیرای سینەمەیی 16 میللیمی بێ‌دەنگ و ڕووناکی هەڵگرێ «؟» فیلمیان گرتووە . بەماگنێتەفۆنی ڕادیۆیی جۆری « ناگرا ـ خێرایی : 7,5 » خۆمان دەنگمان تۆمار کردووە .

وەك فیلمێکی پاك : 6,20 دەقیقەیە .

وەك گفت‌وگۆی تۆمارکراو : 7,26 دەقیقەیە .

لە 1972 ەوە ـ هێشتا ـ وێنە و دەنگ ، یەك نەخراوون = دوبلاژ نەکراوون . گفت‌و گۆکە لە هاوینی ساڵی 1973 دا لە بەرنامەی ڕادیۆیی « بۆ خۆشیتان : کەمال ڕەئووف محەممەد » بڵاوکراوەتەوە . ڕۆژنامەیشی نەدیوە هەتا 1981 کە ئاگاداری بووین ـ لە ئارشیڤی تەلەفزیۆندا هەڵگیرابوون . هەر قسەیەکیش ـ بێ لە شیعر ـ بەدەم و دووی خۆی دەخەینە بەرچاو ، چ بەر وێنەگرتن کەوتبن یان نا ؟

● **گفت‌وگۆکە**

**ك . ر . م :**

(بەوێنەوە) دۆستانی بەڕێز . هەموو کاتێکتان باش . پێش ئاوابوونی ساڵی 1972 ، وا ئێستا ڕۆژی 1 ی مانگی تشرینی دووەمی هەر ئەو ساڵەیە ( = ڕاست‌تر مانگی کانوونی یەکەم / ك . ر . م) . بۆ یەکەم جار لە شاری سلێمانیی ، لە ماڵی شاعیرێکی کوردەوە گفت‌و گوتان لەگەڵا ئەکەین . ئەو مامۆستایە مامۆستا محەممەد ڕەمزی کوڕی مەلا مارفە ئەفەندی ـ قاضی ـ کوڕی سەیید ڕەسووڵە کە لە نەوەی پیر خدری شاهۆییە . لە دایکیشەوە کچەزای موفتی مەلا ئەمینی نەوەی موفتیی چاو ماری بەناوبانگە . لە ساڵی 1902 لە شاری سلەیمانیی لە گەڕەکێك لە گەڕەکەکانی ئەو شارە هاتۆتە دنیاوە . (هەڵوێستەی کامێرا / ك . ر . م) .

**شاعیر:**

(بێ‌وێنە / بەڕەخنەوە) گەڕەکێك لە گەڕەکەکانی سلەیمانیی : بۆ ناڵێی لە گەڕەکی گوێژە ؟

**ك ر . م :**

(بێ‌وێنە) ئەم .. ( = وێنەگرەکە / ك . ر . م) ئیعادەی بێ‌کردمەوە !! (بەوێنەوە / ك . ر . م) . مامۆستای بەڕێز ئەم کاتەو باش . زۆر بەختەوەرین کە ڕێگەت داوین ، ئەم دانیشتنەتان لەگەڵا دروست بکەین بۆ ئەوەی هەر کوردێ کە چاوی بەجەنابتان ئەکەوێ چاویان گەش بێتەوە و دڵیان ڕووناك ببێتەوە ، وە لەم دانیشتنا حەز ئەکەین ، چەن پرسیارێکمان هەیە ، بفەرمووی وەڵاممان بدەیتەوە .

**شاعیر :**

(بەوێنەوە)

یا خوا بەخێربێن سەر هەردوو[*] دیدەم
ئەی برایانی ئەزیزیەت کەشیدەم

زۆر زۆر سوپاسی ئەم هەستە بەرزەتان ئەکەم کە وا لەم کاتە ـ یا ئێرەتان فکر کەوتۆتەوانێ و منتان بیر کەوتۆتەوە . زۆر سوپاستان ئەکەم .

**ك . ر . م :**

(بەوێنەوە) مامۆستای بەڕێز ، ئێمە هەموو وەختێ جەنابتمان لە فکرە وە بەردەوام هیوا ئەخوازین کە لەش ساغ بی . ئێستا ئەگەر بفەرمووی ڕێمان بدەی ... (هەڵوێستەی کامێرا/ ك . ر . م) .

**شاعیر :**

(بێ‌وێنە / بۆتەواوکردنی قسەکەم ..) .. چەند شیعرێکمان بۆ بخوێنەوە . ئاوا بڵێ ! چەند شیعرێکمان بۆ بخوێنەرەوە

.. ئەگینا بسوئال و موئال نەبێ !

ك . ر . م :

(بێوێنە) شیعر لای جەنابتان چی‌یە ؟

**شاعیر :**

(بێوێنە / بەگەرمەوە) کورە گوێ مەیەرە ( = مەدەرە / ك . ر . م) ئەوانە تۆش بڕۆ . بڕۆ گوێ مەیەرێ .

ك . ر. م :

(بەوێنەوە / پاش خەریکبوونێ و داوا لێکردنەوەی) . مامۆستای بەڕێز ، پرسیاری یەکەممان ئەوەیە : لای جەنابتان شیعر چ مانایەك ئەگەیێنێ وە هەروەها ئایا وەکو لەسەرتان وتراوە : شاعیرێکن نەکۆنن نە تازەن ، یەعنی موتەجەدید ـ ( = ڕاستی‌یەکەی موتەجەدید / ك . ر . م)[37] جەنابتان بەو بڕیارە قایلن یان نا ؟ پێش هەمووشتێ شیعر لای جەنابتان چی‌یە ؟

**شاعیر :**

گیانەکەم . (بێوێنە / ك . ر . م) شیعر مەعنای ئەوەیە کێشی تەواوبێ ، قافیەی تەواوبێ ، لەگەڵ دەستی پێکرا زەووق بجووڵێنێ ، ئینسان بێنێتە هەلەکە سەما : شیعر مەعنای ئەمەیە .

ك . ر . م :

(بێوێنە) نازانم ڕەئییت بەرامبەر ئەو ڕەئییەی مامۆستا ڕەفیق حیلمی چۆنە ؟

**شاعیر :**

(بەوێنەوە) وەڵڵاهی من شیعرم هەیە . لە کۆنیشا هەمە زیا ، لە کۆنیش هەمە لە تازەش هەمە . ئینجا ئەوە کەوتۆتە دەست شوعەراو ئێ .. ئەمانەی تازە . کامیان لام خۆش بێ ئەوانەم ، وە هەردوو لایانم لا باشە ( = واتە شیعری کۆن چ تازە / ك . ر . م) .

ك . ر . م :

(بێوێنە) باشە مامۆستا ئەگەر بفەرمووی یەکەم شیعرت یەتەوە بیر کە فەرمووتە ؟ وە ..

**شاعیر :**

(بەوێنەوە) یەکەم شیعرم ئەوە بوو کە شەخسێ ڕمبازیی ئەکرد[38] . تەسادوف کەوتە خووارەوە ، کلا . منیش ئەمەم بەدەما هات . وا ئەزانم ئەمە ئەووەڵ شیعرم بێ ، فارسی‌یە :

**چون سوی آسمان نَرَوَدْ دودِ آهِ مَنْ**
**کَرْ بُرجِ زین بە خاك دَرْ آفتاد شاهِ مَنْ**

ك ر . م :

بە کوردی‌یەکەی (بێوێنە / ك . ر . م) چ مەعنایەکی هەیە ؟

**شاعیر :**

(بێوێنە / بەخەندەوە) بەکوردی‌یەکە ئێستا من کوتوپڕ نازانم .. ئەمە ! (دەستبەجێ پاشگەزبووەوە /ك . ر . م) چۆن نەکاتە ئاسمان .. مەوجوودە ...

**چۆن نەگاتە ئاسمان دووکەڵی ئاهی من**
**کە لەبەرزایی زینەوە کەوتە سەرخاك شاهی من .**

ك . ر . م :

(بێوێنە) بەڵێ . مامۆستای بەڕێز ئەگەر بفەرمووی تێمان بگەیێنیت لەو شیعرانەی خۆت ، کامیان بەباش یان بەخۆش ئەزانی ، بفەرمووی بۆمان بڵێی ، ئەگەر غەزەل بێ ئەگەر نیشتمانیی بێ !

**شاعیر :**

(بێوێنە) بەسەرچاو . (بەوێنەوە / ك . ر . م) (هەرشیعرەکەی یادگاری‌یەکەم ـ لەمابەینی دوو دولبەردام ـ ك . ر . م)

ك . ر . م :

(بێوێنە) زۆر زۆر سوپاس مامۆستا . بێگومان ئەم شیعرە لەسەر دەمی ..

**شاعیر :**

(بێوێنە) گەنجییا :

ك . ر . م :

(بێوێنە) فەرمووتە .

**شاعیر :**

(بێوێنە) بەڵێ . بەڵێ .

ك . ر . م :

(بەوێنەوە) مامۆستا لەناو شاعیرانی کۆنی کورددا چ شاعیرێ شیعریتان زۆر پەسەندە و لە دڵا چەسپیوە ؟

شاعیر :
(بەوێنەوە) ماموٚستا ـ بێخود ـ ئەووەڵ ... ـ مەحوی ـ ی ، مەحویی ئەووەڵ ، ماموٚستا بێخود دووەم .

ك . ر . م :
جا ئەگەر بفەرمووی چەند بەیتێکیان ، لەو شیعرانەیان بگێڕیتەوە .

شاعیر :
بیخود ئەفەرمووێ :

**دڵم بۆ زوڵفو ڕووی جانانە ئەگریی[3]**
**(بێوێنە) منالە بۆ گوڵ و ڕێیحانە ئەگریی**

ك . ر . م :
(بێوێنە) ماموٚستای بەڕێز پرسیارێکی ترمان هەیە ئەویش : نازانم تا ئەم تەمەنە موبارەکەتان چ ڕەئیەکتان پەیدا کردووە ، بەرامبەر بەژیان ودونیا ؟ وە چ ڕێگەیەك باشە کە پیاو بیگرێتە بەر وە ئێمەی کورد ـ تەبیعی ـ ی چ شتێك باشە بیکەین بۆ گەلەمان ؟

شاعیر :
(بەوێنەوە) وەڵڵا براله ، وەکو مەعلوومی هەموو لایەکە ، دنیا تا بڵێی خۆشە وە ئەوی بۆ دنیاش بەعەمەل بێ ( = دێت / ك . ر. م) کردەوەی چاکەیە وە میللەتێکیش بەسەر بەرزیی بژی لەوە خۆشتر ، هیچ شتێ لە دنیادا نییە . ئەمن و ئاساییشیش ئەوە بەحسی ناکرێ ( = کە خۆشە / ك . ر .م) . ئەمن و ئاساییشم ئەوێ .

ك . ر . م :
(بەوێنەوە / لەپاش پشوویەکی نێوانماندا) جەنابت بەیتێکت ووت بەرامبەر دونیا . ئەو بەیتەمان بۆ بگێڕیەوە ؟

شاعیر :
(بێوێنە) بەعەرەبیی بوو ؟

ك . ر . م :
(بێوێنە) بەڵێ .

شاعیر :
(بێوێنە) :

**دنیا کما تهوی النفوس جمیلة[4]**
**لو کان ذا ذوق بها الانسان**

ك . ر . م :
(بێوێنە) زۆر جووانە . هەر بژێت ماموٚستا .*(لە پشوویەکی تردا کە خۆی داوای کرد شیعر بگێڕێتەوە) ماموٚستای بەڕێز ئەگەر بفەرمووی ، ئێستا چەند بەیتێك لە شیعرەکانی خۆتمان بۆ بگێڕێتەوە !

شاعیر :
(بەوێنەوە) بەڵێ ..

شەو هەموو شەو ، من کەوا ئەگریم و هەر هاوار[41] ئەکەم
شینی کاتی وا نەهاتیی و ڕۆژی ئاوا ، تار ئەکەم
بۆ لەیەکتر دابڕاوی و ڕەنجەڕۆیی کوردە وا
عالەمێ دائیم بەشیوەن ، شەو لەخەو بێزار ئەکەم
بۆ نەمامی باخی تینووی بەرگ و بەر ئازادییە
من کەوا بۆ ئاوی چاوەی ئاشتیی هاوار ئەکەم
ئەی برا وا تێنەگەی ئەم هەوڵە بۆ کورسیی ئەدەم
یا بە پەنجەی ئارەزووی بێگانە ، من ڕەفتار ئەکەم
یا وەکو مەردی بەدیمەن کوردی خائین دڵ ، منیش
خزمەتی گیرفانی خۆم و فیکری ئیستیعمار ئەکەم
بۆ تەبایی کوردە گەر لەم دێوە بۆ ئەودێ ئەڕۆم
بۆ ڕەهایی هۆزە گەر چەند ساڵە شارە و شار ئەکەم
کێ ئەڵێ من ، میللەتێکی وا بەناحەق حەق خوراو
لەم هەل و هەلکەوتەدا ، لەو مافە دەست بەردار ئەکەم .

ك . ر . م :
(بەوێنەوە) هەر بژیت ماموٚستا . هەر بژیت .
. تەواو[42] .

## پەراوێزەکان

(1) ـــ دەست پێکردنی ڕۆژنامەنووسیی ڕادیۆیی کوردیی ، لەگەڵ دامەزراندنی ڕادیۆی بێتەلی عێراقە بەکوردیی کە لە 1939,11,19 دا دامەزراوە . (بۆ ناسینەوەی ئەو ڕۆژگارە ، بنووارە : کاروان ـ ژمارە : 11 . ئابی 1983 . یادداشتەکانی کامل کاکە ئەمین : ذکریات اول اذاعي کردی) .

(2) ـــ لەگەڵ باسکردنی ڕۆژنامەنووسیی ڕادیۆیی ئەو سەردەمە ، دەبێت بزانرێت کە دووا بەدووای ئەو شۆڕشە ، گەلێك ڕووداوی سیاسیی

پێشکەوتوو قەوماوە . ماگنێتەفۆنی ـ تەسجیل ـ رادیۆی کوردیی چووە ئەو مەیدانانەوەو دووای باری سیاسیی ئەو سەردەمە کەوت و هەندێك جار ڕووداوەکان تۆمارو بڵاوکراوەنەتەوە . هەروەها گەلێك گفت وگۆ لەگەڵ کاربەدەستە گەورەکان و کەسانی دیاری نێو کۆمەڵ کراوە کە ـ بەسەرنج دان ـ مان دەرکەوتووە ، ئەو تۆمار کراوانە نەماوونەتەوەو لەبەر هەرهۆیەك بووبێت ـ سڕاونەتەوە ـ جگە لەوانەش هەندێك ئاهەنگی کوردیی دەرەوەی ستودیۆ ـ بە تایبەت لە بەغداددا ـ تۆمار کراوون بەڵام تاك و تەرای ـ یادگاریان ـ ماونەتەوە . یەکێکیش لە کارگێڕە چالاکەکانی مەیدانی ڕۆژنامەنووسیی ڕادیۆی ئەو ڕۆژگارە ـ کاك شەوکەت غەفوور بابان بوو ـ کە زۆربەی ئەو گفت وگۆو ڕیپۆرتاژانە ئەو هەڵی سووڕاندووە .

## تێبینی :

ئـه : ـ ڕۆژنامەنووسیی ڕادیۆیی ـ تەنها ـ گفت وگۆو ڕیپۆرتاژی دەرەوەی ـ ستۆدیۆ ـ نی یە ، بەڵکو ئەوانە بەشێکن لە هەموو هونەری ڕۆژنامەنووسی یەکەی ڕادیۆ کە ـ تێکڕا ـ شێوەکانی نووسینی گوتارو لێکۆڵین و وەرگێڕان و ڕیپۆرتاژو بەرنامە دانان و دەنگ و باس و شێوەکانی دەربڕین و جۆرەکان و شێوازەکانی هونەری : تۆمارکاریی ( = تسجیل : دەنگ ـ وێنەش لە تەلەفزیۆن و سینەمەدا) ، پوختەکاریی ( = مۆنتاژ : دەنگ ـ هەروەها وێنە) ، ڕاییکاریی ( = إخراج : لە ڕادیۆو تەلەفزیۆن و سینەمەو شانۆشدا) دەگرێتەوە کە ـ ئەمانەش ـ لە ڕۆژنامەنووسیی ـ چاپکراودا ـ پەیڕەو دەکرێت : ( = الطبع الصحافي ، المونتاج الصحافي ، الاخراج الصحافي .. هتد) .

بێ : ـ ڕواڵەتێکی ـ چەوت ـی بایەخ نەدان بە ڕۆژنامە نووسیی ڕادیۆ ، هەروەها تەلەفزیۆن ، ئەوەیە کە ـ هێشتا ـ زاراوەی کوردیی بۆ ئەو مەیدانانە دانەهاتووە یان ـ زانستانە ـ بۆیان دانەڕێژراوەو ئیتر هەر کەسێ ـ بەهەوای خۆی ـ بێ پشت بەستن بە دەستووری زانستانەو زانستی زمان و زمانە کوردی یەکەش ، زاراوە دادەتاشێ کە دڵنیا دەڵێین ، هەرە زۆری ئەو ـ داتاشراوانە ـ نا لەبارن چ بەرامبەر زاراوە جیهانی یە ڕەسەنەکە ، چ بۆ زمانی کوردیی و ئەو مەیدانانەش . (کتێبێکمان ، پاشە ڕۆژ ئەم لایەنانە شیی دەکاتەوە) .

(3) — لەنێو ئەو یادگارانەدا کە ـ ماوونەتەوە ـ ئێمە تەنها دوو وێنەی پاشماوەی ئەو ـ کۆنگرەیەمان ـ بەرگوێ و بەر دەست کەوتووە . شیعرەکەی : قەدری جان بە ناوی . (دۆستێ من دوژمنێ پۆستێ من) و شیعرەکەی : گۆران ، بە ناوی (بەرەو کۆنفیرانس) کە ساڵی 1979 بەرنامەی ڕادیۆیی ئێمە ـ ڕۆژێ لە ڕۆژان ـ چەند جاری بڵاوکردەوەو گەلێك گوێگر تۆماریان کردووە . ئەم دوو وێنەیەش ـ سەر لەنوێ ـ نرخی ڕۆژنامەنووسیی ڕادیۆ نیشان دەدەن ، بەوە کە بۆ وێنە ـ گۆران ـ ی شاعیری گەورە (بەدەنگی خۆی) هەر ئەو یادگارەی هەیە :

(4) — سەرهەڵدانەوەی ئەم جۆرە کردەوە ڕۆژنامەنووسی یە لە 1966 دا ـ بەئەمانەتەوە کە تۆماریشە ـ لەوەوە دەست پێ دەکات کە ـ ئێمە ـ لەگەڵ چوونە ڕادیۆوە ـ کە ئەو کاتەش شەپۆلی بێ هێز ، گوێگری کەم بوو ، باری تایبەت بوو ـ بیرمان لەم کارە کردەوە . یەکەم یادگاریش ئەو ـ دیدارە هونەری یە بوو ـ کە لەگەڵ گۆرانیی بێژی کۆن (ئەڵماس محەممەد : 12 / 11 / 1966) کردمان کە ـ ماگنێتەفۆنی رادیۆشمان نەدرایەو ـ ماگنێتەفۆنی « گرۆندیك » ی ماڵی کاك ئەزاد ئەحمە شەوقی ـ مان خوواست . نرخی ئەو دیدارە ـ هەڵگیراوە ـ لەوەدا نی یە کە قسەمان لەگەڵ کرد . بەڵکو ئەوەیە نەچووینە سەر ـ حازریی ـ و هەر پاش بیستنی ئەو هەواڵەی کە ماوەو لە گەڕەکی ـ علاوی الحلة ـ دایە ، چەند ڕۆژ کۆڵانەو کۆڵان و ماڵەو ماڵمان کرد . (هەروەك بۆ گۆرانیی بێژ : دایکی جەمال لە 11 / 12 / 1975 دا کە ئەوکاتە لە مووزەخانەی سلێمانی بووین نەك ڕادیۆ) جگە لەوانەش ، لەمەڕ ئەو گۆرانیی بێژە وونە ـ شێوە لێکۆڵینەوەیەکمان دەستگیربوو ـ باسی لە بەرنامەی ڕادیۆیی ـ ئێمە ـ دا « دەنگی هونەر » : یەکەم بەرنامە بەرامبەر سێ شەمموو : 1 / 4 / 1966 بوو ، بڵاوکرایەوە کە لەوە زیاتر لە 27 / 10 / 1970 دا ( = بەرنامەی : پەیامی هونەر ـ 37,00 دەقەقە ، بەرنامەی تەلەفزیۆنی تۆمارکراوی ستودیۆی بەغدا) دیدارمان لەگەڵ تازە کردەوە کە لە تەلەفزیۆنی کەرکووك دا بڵاوکرایەوەو ـ چەندمان کرد ـ شریتە فیدیۆیی کەی هەڵنەگیراو سڕییانەوە .

ئەڵماس محەممەدیش لە 1894 دا لە گوندی : هارگول ـ جزیرەو بوتاندا هاتووەتە دنیاوە . لە 8 / مارت / 1954 دا بووە بەگۆرانیی بێژی ڕادیۆ هەتا 21 / نیسان / 1962 و لەو مەودایەدا 73 ئاهەنگی بەرامبەر زیاد لە 331 مەقام و بەستەی کوردیی ـ نیشانەکراو لە دەفتەری خۆیدا کە لامان هەڵگیراوە ـ لە ڕادیۆی بێ تۆماردا ( = واتە رادۆیی یەکسەر ) بڵاو کردووەتەوە . لە چەند کومپانیایەکی ڤەوانیش گۆرانیی دەرکردوە . لە (خانووی ژمارە : 56 / 86 گەڕەکی علاوی الحلة ـ الدوریین / بەغدا) دا دەژیاو لە مانگی 1 / 1974 دا تێیدا مردو لە گۆڕستانی (المنطقة ـ کاظمیة) دا نێژراوە . (بنووارە گوتارمان : ست ئەڵماسیش کۆچی کرد / هاوکاری : ژمارە 419 ی 1978) .

(5) — ڕۆژگارەکانی پاش 11 ی ئازاری 1970 قۆناغی گەشانەوەی تێکڕای ڕۆژنامەنووسیی کوردیی بوو کە ڕادیۆیشی گرتەوە ، بەڵام نوخشەی ئەمەی دووایی ، ئەو ڕیپۆرتاژە زیندووە ـ هەڵگیراوە ـ مان بوو کە لەگەڵ یەکەم پێشانگای هونەرمەندانی سلێمانی بوو (بەغدا ـ هۆڵی هونەرمەندانی عێراق : 2 شەممە 2 / شوبات / 1970 .. کە بە بەغدادو مووسڵ و بەسرەدا گەڕاو 53 نیگاری ئەم نیگارکێشانەی باس دەکرد : ئیسماعیل خەیات ، ئەکرەم سەعید ، حەمە کاکە ، دارا محەممەد سەعید ، عوسمان خاڵ ، عەلی جۆلا ، عومەر عەلی ئەمین ، کامیل ئەحمەد ، کامیل مستەفا ، شێرزاد شەوقی ، لالە عەبدە ، نووری ئیسماعیل) . کەجگەلەوەی لە بەرنامەی « دەنگی هونەر » دا بڵاومان کردەوە ، کامێرای بێ دەنگی سینەمەیی 16 میللیمەتر بۆ بردو وێنەی گیراو لە دەنگەو باسی تەلەفزیۆنی بەغداددا بڵاوکرایەوە و لە ئارشیفیشدا هەڵگیرا .

بۆ مێژووش کە ئەم باسانە نیشان دەدین ـ کە کەسی تر وەها نەجووڵاوەتەوە ـ ئەم کردەوە ڕۆژنامەنووسی یە ڕادیۆیی یە ، فەرمانی

وەزیفەو ڕاسپاردن ـ نەبووە ـ . بەڵکو بڕواو پەیامێکی ڕۆژنامەنووسیی ـ ڕۆشنبیریی‌بووەو گەلێك بەڵگە هەن ـ وەك ـ ئەمانە (1 ـ دیداری ڕادیۆیی تۆمارکراو ، بە ماکێنتەفۆنی ڕادیۆ ، لە مانگی 11 / 1967 دا کە چووینە گەڕەکی ـ باب المعظم : بغداد ـ و ژووری خوێندکارانی هونەرە جووانەکان : ئەحمەدسالار . حیکمەت هیندی . عەتا مستەفا ، و وابزانم یەك دووانێکی‌تر ، و گفت و گۆیەکی هونەرانەمان لەگەڵ کردن‌و لە بەرنامەی ، دەنگی هونەردا ، بۆ پشت‌گرتنیان ، بڵاومان کردەوە .

2 ـ بەڵگەی گەورەتر کە لە لیژنەی ڕادیۆو تەلەفزیۆنی یەکەم کۆنگرەی هونەرە جووانەکانی عیراق / شوبات 1968 دا بەشدار بووین‌و ـ بەتاقی تەنها ـ کارێکمان کرد کە کۆمەڵێ پێشنیاری بەجێ بۆ چاك بوونی باری ڕۆژنامەنووسیی‌و هونەری ڕادیۆو تەلەفزیون ـ ی کوردیی ، بخرێتە دووا بڕیارەکانی کۆنگرەکەو جێ‌بەجێ بکرێن .. کە ئەمانە تۆمارن .

3 — هەروەها ئەو ـ عەریزەیەشە ـ کە لە 24 / 6 / 1968 دا پێشکەشمان‌کرد کە ڕاد یۆ ـ 4 ـ ڕۆژ بمانێرێ بۆ هەولێرو سلێمانی‌و بۆ گفت‌وگۆ تۆمارکردن لەگەڵ هونەرمەندان ئەدیب‌و ڕۆشنبیراندا ـ کە ڕێگاشمان نەدرا ـ .

بەلام ئەم ئاواتە ڕۆژنامەنووسی‌یە لە 7/1 هەتا 2 / 9 / 1971 دا وەك چالاکی‌یەکی ڕۆژنامەنووسیی ڕادیۆیی ـ بەتەنها ـ لە دەرەوەی ستۆدیۆدا هێنامانە دی . (بۆ زانینی زیاترو وورد ، بنووارە : کاروان ـ ژمارە : 6 ی 1983 + چەند ژمارەیەکی هاوکاری : نیسان‌و حوزەیرانی 1970) کە لە هەولێرو سلێمانیدا ، زیاد لە 30 سەعاتمان لەگەڵ زیاد لە 90 کەسی شاعیرو چیرۆك‌نووس‌و مێژوونووس‌و شانۆپەروەرو نیگارکێش و خاوەن چاپخانەو کتێبخانەو چەند تیپ‌و کۆمەڵ‌و ڕێك‌خراوو دەزگاو کارگەدا .. تۆمارکرد . (بۆ ناسینی گەلێك لەو کەسانەو ناویان : بنووارە : ژین ـ ژمارە : 37 ی 1971) .

(6) — ڕۆژنامەنووسیی تەلەفزیۆن کە ـ بێجگە لە بەهای شێوەو ڕەنگ ـ وەك ڕۆژنامەنووسیی ڕادیۆیە . بە باوەڕی ئێمە لەگەڵ دامەزراندنی تەلەفزیۆنی کەرکووك (1967) دەست پێ‌ناکات ، ئەگەرچی پەیدابوونی ئەو دەزگایە ، پەیوەندیی جەماوەری کوردستانی لەگەڵ ئەو ـ جۆرە ـ ڕۆژنامەنووسی‌یەدا ، یەکسەر بەهێزکرد (سەرەڕای کەم‌و کورتی‌یە بێ‌شومارەکانی) . ڕۆژنامە نووسینی تەلەفزیۆن ـ لای ئێمە ـ دووای ڕۆژنامە نووسیی ڕادیۆو سینەمە هاتووە کە سەرەتاکەیشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ـ چەندجار ـ گفتارو بەرنامەچکانەی کە لە ساڵانی 1958 بەدوواوە تا هاتنی تەلەفزیۆنی کەرکووك ، بۆ کوردەکانی دانیشتووی بەغداد پێشکەش دەکران کە لەوە دەچن بەر تۆمارکردن یان هەڵگرتن نەکەوتبن . (کتێبێکمان ، پاشەڕۆژ ئەم لایەنانە شیی دەکاتەوە) .

ئەگەر زانستانەش ـ یەکەم ـ گفت‌وگۆی کوردیی بۆ کردنەوەی یەکەم جاری تەلەفزیۆنی کەرکووك ـ بەپەخشانێك ـ بەقۆناغێکی ـ نوێی ـ ڕۆژنامەنووسیی تەلەفزیۆن بژمێرین ، ئەوا ـ یەکەم ـ بەرنامەی ئەدەبیی تەلەفزیۆن ـ کە بەهای ڕۆژنامەنووسیشی پێوە بوو ـ هی ئێمەیش نەبووایەو هی هەر کەسێکی تر بووایە ، هەر وامان دەگوت ، کە « ئاوێنەی شیعری کوردیی ـ ئێمە بوو : مەوداکەی 26,16 دەقەقە بوو . لە 28 / 1 / 1968 دا تەلەفزیۆنی بەغدا تۆماری کردو بڵاوی‌کردەوە . لە 1968/2/15 دا تەلەفزیۆنی کەرکووك بڵاوی کردەوە .. دیکۆری : خالید سەعید . ڕایی : عەبدولهادی موبارەك .» .. بەلام تەمەنی هەر ئەو چەند دەقەقەیە بوو ، ناچاریش دەست‌بەرداری بووین (لە کتێبماندا، لەبەر یادداشتە نووسراوەکانمان ، ئەم باسە زۆرتر ڕوون دەکەینەوە) .

قۆناغی ڕۆژنامەنووسیی کوردیی 1970 ، وەك ڕادیۆیشی گرتەوە تەلەفزیۆنیش هەروەها . بەڵکو زیاد لە هەرسەردەمێکی تر ، گۆڕی بەست‌و چەندین بەرنامەی جۆر بەجۆری تەلەفزیۆنیی پەیدابوو (تەلەفزیۆنی بەغداد بۆ کەرکووکی تۆمار دەکرد) . بەلام ئەو بەرنامانەو گوتارانە ، زۆربەیان ـ دوو ـ سیفەتی ڕۆژنامەنووسیی تەلەفزیۆنیان کەم پێوە دیاربوو کە ئەوەیش ئەنجامی دوو شت‌بوو :

یەکەم : ـ نەشارەزایی لە هونەری ڕۆژنامەنووسیی تەلەفزیۆنیدا و پەیڕەو کردنی شێوازی ـ گوتار بەئەلقە ـ ی ئەدەبیی‌و درێژ دادڕ نەك پەخشانی کورتی ڕۆژنامەنووسیی ، هەروەها تەلەفزیۆنی‌ی .

دووەم : پەیڕەو نەکردنی داخوازی‌یە تایبەتەکانی تەلەفزیۆن . بەلام ئەم دوو شتە مایەی گەلێك هۆ بوو کە گەورەکەیان ئەوەبوو : مەڵبەندێکی پلان‌دانانی ڕۆژنامەنووسیی تەلەفزیۆنی‌ی کوردیی ـ بەرپرسیار ـ نەبوو . جگە لەوەش ـ سەرنجێکی هەڵە ـ باو بوو ، گوایە ، ئەوی لە ڕادیۆو تەلەفزیۆندا کاری‌کرد ، ڕۆژنامەنووسە . یان ئەوی دەستی لە ئەدەبدا هەبوو ، دەستی لە ڕۆنامەنووسیدا هەیە . لەگەڵ ئەمانەش ـ وەفادارانە ـ دەڵێین کە بابەتەکان ـ لەچاو ئەمڕۆدا ـ بەنرخ بوون ، جگە لەوەش کە پەیوەندیی جەماوەرو تەلەفزیۆن نزیکتر بوو .

لەم گوڕە تەلەفزیۆنی‌یەدا ـ پەیامی هونەر ـ ی ئێمە (یەکەم بەرنامەی : 28,30 دەقەقەبوو . ڕایی‌کار : سەمیر ئەلصایغ بوو . تەلەفزیۆنی کەرکووك لە سێ‌شەممە 1 / 9 / 1970 دا بڵاوی کردەوە .. دووا ژمارەیشی : چووار بوو کە 108,3 دەقەقەبوون . لە ستۆدیۆی بەغدادا تۆمارکران‌و یەکەم ژمارەی ئەوانە لە 28 / 1 / 1973 دا تەلەفزیۆنی کەرکووك بڵاوی کردەوەو ئەوانی تر بە دوویدا . سەرجەمی ژمارەکانی ئەو مەودا چەند ساڵی‌یە 24 — 27 بەرنامەبوون (!) و ناچاریش دەست بەرداری بووین) هاتە مەیدانەوە کە تەنانەت پەیامە ڕۆژنامەنووسی‌یەکەی خۆی ، لە دەرەوەی ستۆدیۆدا جێ‌بەجێ‌دەکردو چەندین ڕووداوی هونەرمەندانی کوردی بەفیلمی سینەمەیی بێ‌دەنگ بەسەر کردەوە (ئەوە بێ لە شێوەی ئامادەکردنی نووسین‌و بێ لە دیدارەکانی نێو ستۆدیۆو بەرهەم تۆمار کردنیان ، هەروەها بەسەر کردنەوەی کۆن‌و نوێ‌و دەنگ‌و باسەکانی هونەری نێو کوردستان یان دنیا) بۆ وێنە ئەم پێشانگایانەی بەسەر کردووەتەوە .

- یەکەم پێشانگای نیگارکێش لالە عەبدە ـ 13 / 1 / 1971 هۆڵی مەعهەدی هونەرە جووانەکان ـ بەغداد .
- یەکەم پێشانگای نیگارکێش : محەممەد عارف ـ 11 / 11 / 197 هۆڵی مووزەخانەی نیشتمانی بۆ هونەری نوێ ـ بەغداد .
- پێشانگای نیگارەکانی منداڵانی باریزگاکان : (کە سلێمانی‌ی یەکەم بوو) 6 / 1 / 1973 . هۆڵی مووزەخانەی هونەری شێوەکێشیی ـ بەغداد .

بەڕۆشنایی ئەو باوەڕەش کە هونەری ڕۆژنامەنووس ـ بەتەنها ـ ئەوە نی‌یە : چی دەنووسێت یان چی‌و چۆنی دەگێڕێتەوە ، بەڵکو ئەوە لە پێشترە : چۆن‌و چەندو بۆچی دەجووڵێتەوە ، ئەو تاقی کردنەوەیەمان ـ لەو

بەرنامەیەدا ـ بەجۆرێکی جیاواز ، بەڵام پێشکەوتوو کشاندو تەواو کردنی کردەوەکەمان مەبەست بوو . ڕاستیش بێت ، ئەو کردەوەیە ـ وەك تۆمارە ـ بە هەقیقەت ناوی یەکەم کردەوەی ڕۆژنامەنووسیی دەرەوەی ستۆدیۆی پێدەبڕێت . (چونکە بۆ یەکەم جار لە دەرەوەی ستۆدیۆو شاری بەغدادا ـ سلێمانی ـ و لە 12/1 و 2 / 12 / 1972 دا ـ سێ کەس = وێنەگر ، ڕووناکیی هەڵگر ، ئێمە ـ بەکامیرایەکی سینەمەیی بێدەنگی 16 میللیم و چەند مۆمێکی کارەبایی و ماکینەتەفۆنی ڕادیۆیی و شریت ، خەریکی ئەو کردەوەیە بوون ، بۆ وێنەو دەنگ وەرگرتنی 2 شاعیرانی کوردی وەك : ڕەمزی مەلا مارف و عەلی باپیر ئاغاو لە ڕایەڵەی چەند پرسیارێکی کورتی سەر فیلمێکی خاوی ڕەش و سپیی چەند دەقیقەییدا .. ئەمە لە هەلێکدا : دەزگای تەلەفزیۆن ـ لەو ڕۆژگارەدا ـ هەموو وزەی تەکنیکی ی خۆی بریتی بوو لە : کامێراکانی ستودیۆ ، کامیرای سینەمەیی ئەریکۆنی 36 میللیمی ـ دەنگ و وێنە ـ کە هەر بۆ ڕووداوو بۆنەی گرنگ بەکار دەبرا ، دوو سێ کامێرای سینەمەیی 16 میللیمی ، بێدەنگ .

لێکۆڵەری هونەری سینەمەو تەلەفزیۆن و ڕۆژنامەنووسیی تەلەفزیۆن دەزانێ ، دەنگی چەرخی بەکرەی فیلمی کامیرا لە کاتی وێنەگرتندا لەگەڵ گفت وگۆ دەرچوو بێت ، یانی چی ؟ هەروەها ڕۆژنامەنووسەکە ـ خۆی ـ لەو هەلەدا گفت و گۆ بکات و خۆیشی لەبەر چاوی کامێرا دەنگەکە تۆمار بکات ، یانی چی ؟ هەروەها بابەتێکی ئەدەبییانەی چەند دەقیقەیی وەها ، لە بەرنامەیەکی هونەرانەدا جێبکاتەوە ، یانی چی ؟ .. هتد) بەڵام موخابن .. سەرەڕای کەلێك کۆششمان کە هەتا 1980 پێوەی بووین ، سەری نەگرت کە ئەو کردەوەیە ـ پاك ـ بکرێت و بڵاو بکرێتەوە کە ئەوە لە دەسەڵاتی ئێمەدا نەبوو . (دەبێت وێنەکان و دەنگەکە پوختەو یەکبخرێن = مونتاژو دۆبلاژ) لەگەڵ ئەمەش وەك ماوەتەوە بووە بەیادگارێکی شیرین و بەنرخ ، بەتایبەت کە لەنێو شاعیرە کۆنە ـ مردووەکاندا ـ کەس بەختی نەبووە وێنەی سینەمەیی هەبێت : (تێبینی : لەو کۆششەدا کە نیازمان بوو ـ تاقی کردنەوە ڕۆژنامەنووسییەکەی ڕادیۆ : 1971 بەکردەوەی تەلەفزیۆنیی دووبارە بکەینەوە ـ بێجگە لەو 2 یادگارە ، 2 ریپۆرتاژشمان لە نێو کارگەی جگەرەی سلێمانی و پوختەکردنی توتنی سلێمانیی جێبەجێ کرد : بۆ نیشاندانی ڕەنجی ئافرەتی کوردو دەوری لە ژیانی نوێدا . ئەمانەش ـ بەبێدەنگ ـ لە گۆشەیەکی ئەو بەرنامەیەدا ـ بەناوی ـ هەڵبژاردەی کامیراوە ، لەبەرنامەی بڵاوکراوەی 28 / 1 / 1973 دا نیشاندا کە بەرنامەکە : مونذیر جەمیل ، ڕایی کردبوو) .

(7) — پێشنیارو ئامادەو پوختەو ڕایی کراوی خۆشمانە .

(8) — ئەو شیعرە ـ بەجودا ـ لەگەڵ چەند شیعرێکی تری شاعیران ـبە دەنگی خۆیان ـ لە بەرنامەی تردا بڵاومان کردەوە .

(9) — بۆیەکە سیفەتی بەرنامەی پێدەبڕێت ؛ لەبەر ئەم هۆیانە :

- دانانی پێشەکی و کۆتایی ڕادیۆیی .
- بەکارهێنانی « = سەدا = ECHO » بۆ دەنگ پێدانەوەی شیعر خوێندنەوەی شاعیر . هەروەها بەکارهێنانی مۆسیقا بەدەوری گێڕانەوەی شیعرەکەدا ( = BACKGROUND MUSIC = پارچە مۆسیقایەکی دانسی ئەمریکای لاتین بوو کە لەگەڵ ناوەڕۆکی شیعرەکە دەگونجا) .
- تێهەڵکێش کردنی گۆرانیی « زەردی خەزان » ی سەیید عەلی ئەسغەری کوردستانی ی . ئەمە جگە لە ناوەڕۆکی گفت وگۆکە ، خۆی .

تێبینی یەکی گرنگ :

بۆ پاراستنی بەهای ڕۆژنامەنووسیی ڕادیۆ ـ کە یەکەم جارە ـ زۆر پێویستە پێشەکیی و کۆتایی بەرنامەی ڕادیۆیی لەسەر ڕۆژنامە ، ڕەچاو بکرێت ، هەر بۆیەکە ئێمەش ئەم لایەنە بەم جۆرە دەخەینە ڕوو : ـ

پێشەکیی ئەم بەرنامەیە :

- دوو دەنگ ( = دەنگی وێژەوانەکان) .
- مۆسیقای جیاواز ( = پارچە مۆسیقایەکی فۆلکلۆریی ئەمریکای لاتین) = « دەنگی : 1 » : ـ ڕادیۆی کۆماری عێراقە بەشی کوردیی ( = 0 ـ 2,28 سانیە) + مۆسیقا ( = 0 — 18,24 سانیە .. هەتا کزبوونی) + « دەنگی : 1 » : ـ پرۆگرامی ، « دەنگی : 2 » : ـ شەوچەرەیەکی کوردەواریی ( = 0 — 2,67 سانیە) + مۆسیقا ( = 0 — 10,28 سانیە) + « دەنگی : 2 » : ـ سێ ناوی خاوەن بەرنامە / ئامادەو پێشکەش ئەکا ( = 0 — 12 — 4 سانیە) + مۆسیقا ( = 0 — 17,14 سانیە .. هەتا ئاوابوون) = هەمووی 64,88 سانیە .

کۆتایی ئەم بەرنامەیە :

- دوو دەنگەکە .
- هەمان مۆسیقای جیاواز « دووبارە کردنەوەی » .

= مۆسیقا ( = 0 — 16,81 سانیە) + « دەنگی : 1 » : ـ ئەم پرۆگرامەتان پێشکەش کرا ، « دەنگی : 2 » : ـ شەوچەرەیەکی کوردەواریی ( = 0 — 3,48 سانیە) + مۆسیقا ( = 10,20 سانیە .. هەتا کز بوونی) + « دەنگی : 2 » : ـ سێ ناوی خاوەن بەرنامە / ئامادەو پێشکەشی کرد ( = 0 — 2,50 سانیە) + مۆسیقا ( = 0 — 14,75 سانیە هەتا ئاوابوون) = هەمووی 47,63 سانیە .

(10) — شیعر خوێندنەوەی سەرزاریی ، جودایە لەگەڵ شیعر نووسین بۆ ئەدەب . لەبەر ئەمەشە کە ئێمە لە نووسینەوەی شیعرەکاندا ، شێوەی گوتنمان وەرنەگرتووە .

(11) — سەرەتای قسەکەمان بەم جۆرەبوو : ـ گوێگرە بەڕێزەکان . ئەم کاتەتان باش . زۆر بەختەوەرین بۆ یەکەم جار ، لەسەر ئێستگەی کوردیی ، دەنگی مامۆستایەکی کوردپەروەرو شاعیرتان پێبکەیێنین . وا ئێستا لە ماڵی ئەو مامۆستا بەڕێزەوە لە سلێمانی ، پاش چاوەڕوانی یەکی زۆر دوورو درێژ کە 60 شەوێکی خایاند ، گەییشتینە لای خزمەتی ، بۆ ئەوەی سەبارەت مەسەلەکانی شیعر وە ئەدەبی کوردیی ، چەند پرس و ڕایەکی پێبکەین . هەروەها بۆ ئەوەی بۆ یەکەم جار ئێوەی بەڕێز گوێتان لەو دەنگە دلێرە بێ کە بەدرێژایی تەمەن بە قەڵەمەوە بەکردار هەروەها ، خزمەتی کردوون .

(12) — ئە : ل ـ 28

بێ : یەکەم جار ـ پێش حیلمی ـ شاعیری کۆچ کردوو : عەلی باپیر ئاغا لە : گلدەستەی شعرای هاوعصرم ـ 1939 دا ، بەچەند دێڕ ئاشنای کردووە کە دەڵێت : ( لە هەموو هێزێکدا دیارە شاعرە . لە شعرەکانی خوارەوە قابل ئینکار نیە . ڕووخۆشە . لە وەزیفەدا زۆر زیرەکە) هەروەها شیعری « سەرزەنشت » ی بڵاوکردووەتەوە .

(13) — بۆ زیاتر ناسینەوەی شاعیر ، فەوزی کوڕی ، چەند بەڵگەنامەو

دەستنووس‌و باسی خستە بەردەستم کە ئەم لایەنانە ڕوون دەکەنەوە :

ئە : ـ ● لە 1927 دا لە هەڵەبجەدا مەئمووری حوکوومەت بووە .

● لە 1933 دا کاتبی دووەمی واریدات بووە لە سلێمانییدا .

● لە 1940 ەوە هەتا ڕۆژی 2 / 9 / 1944 مودیری ماڵ ـ ی مەرکەزی هەولێر بووەو کە هاتووەتەوە بۆ سلێمانی ـ وەك حیلمی دەڵێ ـ بووە بەمودەقیقی واریدات لە سلێمانییدا . پاشان بووە بەمودیری ئاوو کارەبای سلێمانی . ئەمجا گوێزراوەتەوە بۆ مولاحیزی واریداتی بەلەدییە هەتا ساڵی 1959 کە خانەنشین کراوە .

● لەشارەکانی : کەربەلا ، بەغداد ، مووسڵیشدا فەرمانی دیوە .

● لەڕۆژنامەکانی : ژیان + ژین + پەیام ـ دا شیعری هەیە . بۆ وێنە ـ خۆمان ـ لە « پەیام » دا ئـەم شیعرانـەیمان‌دیـوە : (ژ : 205'266 بەرگ 4 / 1964 ـ شیعرەکانی : دڵەی جارانم + گیرۆدەیی)

● ئەندامی کۆنی « حیزبی هیوا » بووە . ئەندامی « ئـاشتی خووازانی عێـراق » بووە ئـەندامی یـەکێتی‌ی نووسـەرانی کوردبـووەو دووایی لێی‌کشاوەتەوە .

بێ : ـ ● شاعیر : 2 ژنی هێناوە . هەردووکیان کۆچیان کردووە 7 کوڕی بووە : جەمال . کەمـال . عومـەر . شەهـاب ، جەنـاب . فوئـاد . فەوزی .

● لە 1963 دا چـووە بۆ حـەج . ● شاعـیر لە 27 / 7 / 1976 دا بـە نەخۆشیی تیراوێی قورگ لە تەمەنی 74 ساڵییدا کۆچی‌کردووەو لە گردی « سەیوان » دا نێژراوە .

تێبینی بـۆ مێژوو : ـ لەدەوروبـەری سەعـات : 6,10 دەقەی سپێـدەی 23 / ئـەیلوول / 1980 دا ، فـڕۆکـە فـانتـۆمـە ، جـەنگاوەرەکـانی ڕژێمی ئێـرانی خومەینی‌ی : دوژمنی ئینسانی کوردو عەرەب ، پەلاماری شاری بەغدایان دا . بۆمبای مەرگیان بەسەر گەڕەکی ـ الزیونە ـ دا هەڵڕشت . چەند خانوویـەکی عەرەب‌و کورد سەرەو ژێربوون ، یەکێك لەوانە ، ماڵی (کوڕی شاعیر) فەرمانبەری شارستێنی (جەمال محەممـەد ڕەمزی مـەعرووف) بـوو . سەر ئـەنجامی ئـەو تاوانە ، بەم جۆرەبوو : 1 ـ سووتان‌و سەرەو ژێربوونی خانووەکە . 2 ـ شەهید بوونی هەر چووار سەر خێزانەکە : جەمال محەممەد ڕەمزی مەعرووف ـ باوك . سەلار محەممەد نووری مەعرووف ـ دایك « کچەمام » . قان و شارا : هەردوو کچیان ـ قوتابیانی سەرەتایی ـ . مەزاریشیان ، ئێستا لەلای شاعیرەوە ، لە گردی سەیوانی سلێمانییداو بۆ مێژوو تاوانی دوژمنانی ئینسان باس دەکەن !!

(14) مەلا سەییـد ڕەسوو ڵی سیـرێ (سیرێ ـ ش گـوندێـك‌بوو لەپـەنا کێـوی سوورکێودا) .

(15) — مەلا سەعیدی زلزلە ـ وەك لێی گەڕاوین ، ژیان نامەی دیارنی‌یـە . ئەوە هەیە ـ حوجرە ـ ی لە سلێمانیدا ناوی هەبووە . پیرەمێردی شاعیریش لای ئەو خوێندو ویەتی .

(16) — قوتابخانەی « ڕوشدییە » لەسەردەمی حوکمڕانیی عوسمانی یەکـاندا لە ساڵی 1311 ك ( = 1893 ـ 1894 ز / ك . ر . م) لە سلێمانییـدا بەچـووار پۆلەوەکراوەتەوە . پێش ئەوله 1285 ك ( = 1868 — 1869 ز / ك . ر . م) قوتابخانەی رشدییەی مۆلکیی دانراوە .

(17) — ئەعدادیی مولکییە لە 1325 ك ( = 1902 — 1908 ز / ك . ر . م) سەرلەنوێ دامەزرایەوە .

(18) — شیعرو ئەدەبیاتی کوردی ـ حیلمی : ل ـ 24 . ج ـ 2 دەڵێت : پیرەمێرد کە سـەرەکی بەڕاستیی دەستـەی هەمـوو شاعیـرانی ئەو نـاوچەیـە بوو (ڕەمزی) ی بەتایبەتی خستبـووە ژێر کـەمەنـدی خۆیـەوە . گیرۆدەی عەشقی شیعر ووتنەوەی کردبوو .

(19) — شیعرەکە ـ قەسیدەکە ـ دوورو درێژەو دەرفەتی بڵاوکردنەوەی نی‌یە . ئێمە بۆ وێنە ـ سەرەتاکەی ـ دەخەینە ڕوو کە لە « شیعرو ئـەدەبیاتی کوردی » دا هەیە :

خەڵقیی گەیشتە مەنـزڵ‌و گشت ئێستە سـەربە خـۆن هەر کـوردە مایـەوە لا هەوارێکی نزم‌و کۆن ئەسبابی یەك نەکەوتنە ، پێش ناکەوون لە کەس بـاعیس بەڕێ نەکەوتنە ، دوواکەوتوو و ڕەنجەڕۆن .

تێبینی : ـ

ئە : شیعرەکە لە دەستنووسی شاعیرا ، لەوە زۆرترە کە لە (شعروئەدەبییاتی کوردی) « (گلدەستەی شوعەرای هاو عصرم) دا نووسراوەتەوە . بێ : ئەوی شیعرەکە بە چاوی عەقڵەوە تەماشا بکات هەر زوو بڕیار دەدات کە شاعیر بەڕاستیی‌و لەڕوو ، دڵسۆزانە ڕەخنەی گرتووەو « دەستی خۆش بێت » .

(20) — لە شیعرو ئەدەبییاتی کوردی ـ دالە بری « بازوو » نووسراوە « باسك » کە لە دەست نووسی شاعیریشدا ئەمە نووسراوە .

(21) — لە شیعـرو ئەدەبییـاتی کوردی ـ دا لە بـری « نارەسـەن » نووسـراوە « دەوڵەمەند » ، کە لە دەست نووسی شاعیریشدا ئەمە نووسراوە .

(22) — بۆڕاستیی ، لەوە پێش پرسیارەکانمـان ـ کەسـەرە قەڵەم بـوو ـ نیشان نەدابوو . ئەتووارە ڕۆژنامەنو وسی‌یەکەشمان بۆ ئەوە بوو دا بزانین ؛ شاعیرو ئەدیبان‌و ڕۆشنبیرانمان ـ تووانای ـ گفت‌و گۆی ڕوو بە ڕوویان چەندە کە زۆر مانـا دەبەخشێ ، وەك : دەرکـەوتنی ڕادەی هوشیـاری‌و قسەزانی‌و ڕۆشنبیری‌یان . لە پاڵ ئەو مەبەستەشدا دەمانویست لەو باوە بەڕینەوە کە بەرامبەر بەیەك یان مایکرۆفۆنی ڕادیۆو تـەلەفزیـۆن شت بخوێنرێتەوە . ئەمـە جگە لەو ڕاستی یـەش کە گفت‌وگـۆو ڕیپۆرتـاژی ڕۆژنامەنوسیی ڕادیۆو تـەلەفزیـۆن ـ نووسـین خوێنـدنەوەی درێـژ ـ پەسەند ناکات . ڕاستیش بێت لە نێو ئەو زاتانەدا ـ لای ئێمە ـ عەلی باپیر ئاغا یەکەم‌بوو .

(23) — دیارە مەبەستی « یادی پیرەمێرد » ی 1970 یە .

(24) — ئەو شیعرە ـ لە یادی باس کراودا ـ دووبارە پێشکەشی کردووەو ڕاستە لە « یادی پیرەمێرد ـ ی 1960 دا » گوتوویەتی . بەڵام شیعرەکـە زۆرترەو « لە نامیلکەی : یادی پیرەمێرد ـ 1961 دا « بەناوی : شیعری شـاعری بەرزی کورد محەممەد ڕەمزی مەعرووف ـ ەوە چاپ کراوەو سەرەتـای دەڵێت :

چـی بکـە لەگـەڵ زەمـانـەی بـەد خـوویـی بـەد وەفـا
چـی بـڵێـم لە کـردەوەی فـەلەکـی چـەوتـی نـاتـەبـا .. هـتـد

(25) — ئەم بڕیارەی شاعیر ، پاش قسەو باسێکی ڕوو بەڕوو ، تۆمارکرا . شاعیر دەیویست لە وەزەمدانەوە ڕابکات . بیانوویشی ئەوە بوو ، گوایە ناوی هەر کەسێك بهێنێت یەکێکی تر دڵتەنگ دەبێت و - ئەمیش - نایەوێ کەس لە خۆی بکاتە دوژمن «!» بەڵام ئێمە هەر سووربووین کە ڕای دەربڕێ کە لەگەڵ دەربڕینیشی باوەڕ دەکەین ، ڕایەکەی - قەتعی ی - نی یە !.

(26) — لە پشوودانێکدا ، پێی گوتم !

(27) — دووا شیعری هەتا ئەو کاتەی ئەو سالە ! شعیر هەتا دووا ساڵی ژیانی شیعری هەر نووسیوە .

(28) — واتا کۆنگرەکەی هەولێر .

(29) — کە دەڵێن ئەمڕۆ دەشت و کێو شینە = شیعری : پیرەمێرد . ئاواز : شەرقی نەشیدی تورکی یە . لای کومپانیای « ئەبوکەلب : ژمارە : OMD 1007/ 252 ، تۆمارە .

(30) — ئەم سەرنجە تەواو نی یە . « کوردستانی » ی زۆرتر مەقام بێژە .

(31) — لێرەدا گۆرانیی « زەردی خەزان » مان لە بەرنامەکەدا دانا .

(32) — ئەوبەزمە ، شاعیر - بێ تۆمارکردن - بۆی گێڕاینەوەمو فەوزی کوڕیشی ڕوونی کردەوە کە بەم شێوەیە : یانەی فەرمانبەرانی هەولێر بۆ پڕکردنەوەی کەمو کورتیی ، بەهێتاك ، ئاهەنگێکی گێڕاوە . لە مووسڵەوە چەند سەماکەرو گۆرانیی بێژ دەهێنێت . قاسمی مەلاقەندی ، دەیەوێت هەستی شاعیر بجووڵێنێت . بۆ ئەوەدوو سەماکەر دەخاتە تەنیشی یەوە کە - جوان - دەبن . ئەمیش هەستی خرۆشاوە .. ئەم شعرەی هۆنیوەتەوە کە لەدەست نووسیدا زیاترە لێکیشم داوەتە ، شاعیر ئەو یادگارەی لەلا شیرین بوو ، بۆیەکە زۆر دەیگوتەوە .

(33) — لێرەدا بەرنامەکە بەسوپاس کردنی ، بەم جۆرە تەواو بوو : گوێگرە بەڕێزەکان . بەم جۆرە ووت و وێژمان . پرس و ڕامان لەگەڵ مامۆستای بەڕێز ، مامۆستای شاعیرو کوردپەروەر ، مامۆستا ڕەمزی مەلامارف تەواو بوو . وا لە ماڵی خۆیا ، جووانترین سوپاسی پێشکەش ئەکەین ، بەناوی ئێستگەوە وە بەناوی خۆیشمانەوە وە بەناوی هەموو گوێگرێکی کوردیشەوە . تاوەکو لە بەرنامەیەکی ترا بەیەك ئەگەیینەوە ، ئومێدمان خۆشیتانە وە پێش کۆتاییش ئەبێ ئەوە بڵێم ئەگەر ویستتان چەند جارێك گوێتان لەم ووت و وێژەبێ ، تکایە نامە بنێرن بۆ ئێستگەی بەشی کوردیی وەبڵێن : ووت و وێژکردن لەگەڵ مامۆستای شاعیر - ڕەمزی مەلامارف - بۆمان دووبارە بکەنەوە . ئیتر خواتان لەگەڵ !.

(34) — ئەم شیعرە لە دەست نووسی شاعیردا زۆرترە .

(35) — هێندێك باس و شیعر - ی یادگاری یەکەم کە لە دووەمدا دووبارە بوونەتەوە نووسینەوەیان سەر لەنوێ . بۆ پاراستنی بەها ڕۆژنامە نووسی یە تەلەفزیۆنی یەکەیە . (تێبینی : لەبەر ئەوە کە وێنەگرتن و پرسیارو وەڵام تۆمارکردن لەسەر سیناریۆ نەبووە ، لەگەڵ وێنەگر ڕێك کەوتین کە لە پێشدا وێنەی ژوورو کەل و کتێبخانەی شاعیر - هەتا نوێژ کردنی - بەجودا بگرێت و لە - دۆبلاژ - کردندا هێندێك قسەو باس بەروێنەکان بکەوون .

(36) — ئەم دوو تاکە شیعرە بۆ ئێمە مایەی شانازی یە کە دیارە دەمودەست داینا وەو لەوەپێش نەیگوتووە .

(37) — باری وێنەگرتن و قسە تۆمارکردن - بەو کەرەستە ناتەواوانە - و لە ژوورێکی بچووك و تەسکدا ، شاعیریش بۆ وەڵامدانەوە گیرو زۆرتر حەز بە خوێندنەوەی شیعر بکات ، ئەمانە هەمووی - بێ لە هۆی تر !- مایەی شپرزەیی و قسە لێ تێك چوونمان بوو .

(38) — موخلیص ، شاعیر ناوی ڕۆژگارەکەی نەهێنا . بەڵام وەك لە شیعرو ئەدەبیاتی کوردی - دا باس لە سەرەتای شیعری دەکرێت - ڕەنگە - ئەو ڕووداوەو ئەم شیعرە یەك بگرنەوەو حلمي لە ل - 24 دا دەڵێت : « لە هەولێر ئەبێ ، لە سوحبەت سەیید محەممەدی نەقیب و یەحیا بەگی عەبدوڵلا موخلیص بەگا - جارێ - ئەچێ بۆ ڕاوە کەو وە بەهۆی ئەم گەشتانەوە چەشکەی شیعریشی ئەبزووێ وە بە فارسیی شیعر دائەنێ ! » . بەڵام حیلمی ی ؛ نموونەی نەهێناوەتەوە .

(39) — بۆ تەواوی ئەم شیعرە جووانە تەماشای دیوانی بێخود بکە . ل - 100

(40) — ئە : - مەبەستی شاعیر ئەمەیە ، دنیا وەك دەروونی حەزی پێدەکات جووانە ، ئەگەر مرۆڤ بە زەووق و ئارەزوومەوە تێیدا ژیا - یان - دنیا خۆشە ئەگەر دڵ تێدا خۆشبوو . بێ : - ئەم گفتارە عارەبی یە لەنێو دەستنووسەکانی شاعیردا نی یە .

(41) — ئەم شیعرە لە دەستنووسەکەی شاعیردا زۆر ترە

(42) — سوپاسی بنەماڵەی شاعیری نەمر دەکەم ، بەتایبەت دۆستم « فەوزی » کوڕی کە دانیشتنەکانی ئاسان کرد ، هەروەها هێندێك لایەنی ئەم کارەش کە جووامێرانە دەستنووسەکان و وێنەو چەند باسێکی خستە بەردەستم .

(تێبینی ی پێویست : ئە - بێجگە لە هێندێك سەرچاوە کە ناویان لە جێگای خۆیدا هاتووە ، هەروەها بۆ کورت بڕیی ، ناوی هێندێك سەرچاوەی تر بەم جۆرە نیشان دەدەین کە کەڵکیان لێ وەرگیراوە : - 1 — مێژووی ئەدەبی کوردی - علاء الدین سجادی . 2 — شعرو ئەدەبیاتی کوردی : ج - 2 - ڕەفیق حیلمی . 3 — دیوانی بێخود - محەمدی ملا کریم 4 — ڕۆشن بیری نوێ - غفور میرزا کریم 5 — پیرەمێردی نەمر - محمد رسول هاوار . 6 — یادی پیرەمێرد - علاء الدین سجادی . 7 — حاجی قادری کوێی - گیوی موکریانی . 8 — دیوانی نالی - د . مارف خزنەدار 9 — تێکستی ئەدەبی کوردی « هونراوە » - د . محمد نوری عارف . 10 — ڕشتەی مرواری ، بەرگ : 6 — علاء الدین سجادی . 11 — گۆرانیەکانم - علی مردان . 12 — دیوانی مەحوی - ملا عبدالکریم مدرس . 13 — بیبلۆگرافیای کتێبی کوردی - ئەریمان 14 — مشاهیر الکرد وکردستان في الدور الاسلامي : ج 1 - محمد امین زکی . 15 — المنجد في الاعلام . 16 — الموسوعة العربية الميسرة . 17 — مجلة : المورد - جداول لتحويل السنوات الهجرية .

بێ : - هەر بۆ کورت بڕیی ، فەرهەنگوکمان بۆ شیعرەکان بەم جۆرە هەڵبژارد کە هەرە ووشەی گرنگ لێك بدەینەوە )

# کـــاروانـــی
# رۆشـــنبیـــری لـــه کـــوردســـتـــانــدا

## لـــه هـــه‌ولـــێر

**ئامادەکردنی : شوان**

زانکۆ هەمیشە مەڵبەندو چاوگی پەخش کردنی چەپکە تیشکی زانستو زانیاری و ئەدەبو بیری نوێی داهێنەرانە بووە ، پەیامە پیرۆزەکەی بە پەروەردەکردنو پێگەیاندنی بیرورای تیژو نوێی نەوە تازە پێگەیشتوەکانەوە تەواو کردوە ، دەستگیرۆیی ئەو وەچەیەی کردوە کە پێویستیان بە هاریکاریو کۆمەك هەیە . هەرسات زانکۆ لەمەبەستە بنەرەتێکەی خۆی لایدا ئەوا توانای گەیاندنی پەیامەکەی نامێنێ .. هەر لەبەر ئەوەشە زۆربەی جار لەزانکۆکاندا جگە لە وانە بنچینەیی یە سەرەکی یەکانی زۆرەها چالاکیو جموجۆڵی رۆشنبیریو ئەدەبی ئەنوێنێ .. زانکۆی صلاح الدینیش ساڵی ئەمساڵ لەوەرزی رۆشنبیری زانکۆدا کۆلیژەکانی هەندێ کۆڕی ئەدەبیو رۆشنبیری بۆ قوتابیانو مامۆستایان سازکرد . لەم رووەوە لایەك بەلای چالاکی یەکانی کۆلیژی ئادابدا ئەکەینەوە . رۆژی دوو شەممە رێکەوتی 1984/4/2 کۆلیژی ئادابی سەر بەزانکۆی «صلاح الدین» لە هۆڵی کۆلیژدا کۆڕێکی ئەدەبی خنجیلانەی بۆ هەردوو شاعیر عەبدوڵڵا عەباسو فەریدون عەبدول بەرزنجی سازکرد .. کۆرەکە لەلایەن دکتۆر شوکریە رەسولەوە بەرێوەدەبرا .. لە سەرەتادا دکتۆر شوکریە رەسول بەخێرهاتنێکی گەرمی ئامادەبووانی کۆرەکە کردو وتی : لەسەر داوای کۆلیژی ئاداب هەردووبرای شاعیر عەبدوڵڵا بەباسو فەریدون عەبدول بەرزنجی بەشداری وەرزی رۆشنبیریو چالاکی کۆلیژەکەمان دەکەن ... ئەوسا بەرودوا هەردوو برای شاعیری پێشکەش کرد وتی :

ئەوا لەم کۆرە خۆشەویستەماندا مامۆستای بەرێز «عەبدوڵڵا عەباس» تان پێشکەش ئەکەم کە بەشداری خۆی بە خوێندنەوەی چەند پارچە شیعرێکی هەڵبژاردەی خۆی ئەکات . پاش ئەوەی بەکورتی ژیان نامەی ئەدەبی شاعیری باسکرد ، ئەوسا مامۆستا عەبدوڵڵا عەباس نموونەی ئەم کۆپلە شیعرانەی خۆی بە دەنگو ئیقاعێکی شارەزایانەی شاعیرانەوە خوێندەوە :

**گۆرانیەکانی «پۆل روپسن»** :

تۆ ، بووکیتو بەسەر چیمەنی دڵما ، لەنجە بکە !
[پۆل روپسن ، گۆرانی ئەلێ ..
دەرویش دەنگی شمشاڵی غەمی خۆی
ئەدا بە رووتاو ..
تۆ ، تابلۆی زەردەخەنە



دروست ئەکەی ...
قەزات لەچاوی من کەوێ !]
من ، ئەتناسم ، «خۆشەویستی» و «خۆش‌ویستنی»
قەزات لەگیانی من کەوێ ..
ـ خەوت نایە ؟ !
«خەو ناچێتە چاوی بووك و گۆرانیەكانی
پۆل رۆبسن»

«کەبیر لەتۆ ئەکەمەوە»

شاعیر عەبدوڵلا عەباس بەهەناسە هەڵکێشان و تاسەی هەناسەیەکی قووڵی بە پەرۆشەوە ئەم کۆپلەیەی خوێندەوە .

خۆشم ویستیو ..
یەکەم هەنگاو ، سپیدەیەکی رووناك بوو
دوا هەنگاویش خۆر ئاوایەکی خەمبار بوو
تۆ لە نێوان هەردوو هەنگاوی سەرەتاو کۆتاییدا
هەتاوی تەمەنی من بووی .

«کە پێت ئەگەم»

دوای پێشکەش کردنی ئەو کۆپلە شیعرییەی جێی رەزامەندی ئامادە بووانی کۆڕەکە بوو .. کاك عەبدوڵلا هەڵبژاردەی شیعری «کەپێت ئەگەم» ی خوێندەوە :

کە پێت ئەگەم ، بە غوربەتی ناخم ئەگەم
ئا ، ئەمزانی ، بە تۆ بگەم ، بەغوربەتی ناخم ئەگەم
گیانە ، بۆیە ، چەندان و چەندان ساڵ ئەبێ
هەر حەز ئەکەم ، حەزت لێ بکەم ،
تا لەعەشقا ، ئەتوێمەوە و لەناو عەشقا ، ئەبی بەمن !
کاتێ ، کە تۆم لێ ون ئەبووی ، غوربەتی ناخ ، هەڵئەگیراو ،
لەپریاسکەی عاشقە هەژارەکان ، هەڵئەگیرا .
هەڵیان ئەگرت و ، هەر هەڵیان ئەگرتەوە ، تاکو بوو بە مووفەرك

دوای ئەوەی کاك عەبدوڵلا شیعرەکانی خۆی خوێندەو ،



دکتۆر شوکریە ڕەسول برای شاعیر کاك فەریدون عەبدول بەرزنجی پێشکەش کردو وتی :

* لەساڵی 1956 لەبەرزنجە لەدایك بووە .
* خوێندنی سەرەتای و ناوەندی و ئامادەیی لەشارە نازدارەکەی سلیمانی تەواوکردوە .
* ساڵی 1977 – 1978 کۆلیژی ئادابی زانکۆی سلیمانی بەشی زمان و ئەدەبی کوردی بە پلەی یەکەم بریوە .
* ئێستا مامۆستایەو بە شێوەی (معید) لەبەشی کوردی کۆلێژی ئادابی زانکۆی «صلاح الدین» وانە ئەڵێتەوە .
* سەرەتای ژیانی ئەدەبی لەساڵی 1970وە دەست پێ ئەکات
* یەکەم کۆپلە شیعری ساڵی 1974 لەگۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ بڵاوکردۆتەوە .
* ئەم بەرهەمە ئەدەبییانەی بەچاپ گەیاندوە :
  ١ ـ نیگای حەزێکی ئاوارە ساڵی 1977 .
  ٢ ـ ڕۆژان دەڕواو تۆ هەر خۆشەویستی منی ساڵی 1983
* هەروەها لە زۆربەی زۆری ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکاندا جگە لە شیعر ، لێکۆڵینەوەی ئەدەبیشی لەسەر شیعری نوێی کوردی بڵاوکردۆتەوە .

ئەوسا کاك فەریدون شیعرەکانی خوێندەوە ، سەرەتا شیعری سۆناتەی خەمی خوێندەوە کە لەژێر کاریگەریتی «هەردی» شاعیردایەو بەم جۆرە دەست پێ ئەکات .

«سۆناتەی خەم»

بەتەنیایی بەبێ چرپە لەگۆشەی خەما وەستاوم
ئەگریم بە کوڵ وەکو هەور فرمیسك ئەبارێنی چاوم
لە کەین و بەینی ڕۆژگارە ئەمن تا ماوم تێ ماوم
دڵی خۆم خۆش ئەکەم جار جار بە زەردەخەنەی تاو تاوم
بەلام چبکەم گەر وانەکەم وەك دیوارێکی ڕووخاوم
یان پارچەیەکی بێ گیانم لە سەر ڕێی لافاو وەستاوم

«سەراب»

ئەی خانمە دڵ ڕەقەکەم
کە سەیری ڕابوردوئەکەم

لەگەڵ هەموو سەرنجێکا
بە ئەنجامێکی نوێ ئەگەم

**«تۆ»**

هەرچی جوانە لە تۆ دەکا
عەشقت خوێنە
بە دڵما هاتوچۆ دەکا
ڕۆژ لەدوای ڕۆژ گەورە دەبێ
سەوز دەبێ و چرۆ دەکا
گیانە ئەوەی
لەمن زیاتر تۆی خۆش دەوێ
بێ گومان بە درۆ دەکا .

شایانی باسە ئەو کۆڕە بەیەکێ لە هەرە چالاکییە ڕۆشنبیری‌یەکانی وەرزی ڕۆشنبیری کۆلیژی ئادابی ساڵی 1984 دەژمێری‌و کۆمەڵێکی زۆر لە قوتابیانی کچ‌و کوڕو ماموستاو میوانی بەڕێز ئامادە بوون‌و جێی ڕێزو ڕەزامەندی هەموو لایەك بوو .

## پێشانگایەکی هونەری‌و فۆلکلۆری

هەموو ساڵێك لەلایەن ـ بەڕێوەبەرایەتی چالاکی قوتابخانەکانە وە و بە پێی نەخشەیەکی ساڵانەی ڕێك‌وپێکی سنوور بۆ کێشراو جۆرەها چالاکی لە تێکڕای بوارەکانی زانست‌و پەروەردەو کۆمەڵایەتی‌و خۆماڵێتی ساز دەکرێت .

هەر لەبەر ڕۆشنایی ئەو نەخشەیە ڕۆژانی 5 — 1984/4/8 لە هۆڵی چالاکی قوتابخانەکانی شاری هەولێر پێشانگایەکی جوان لەلایەن قوتابیانی کچانی قوتابخانە ئامادەیی‌یەکانی ناو شاری هەولێرەوە سازکرا .





## «فۆلکلۆرو کاری هونەری نوێ»

لەپێشانگاکەدا جگەلەوەی گەلێ کاری هونەری نوێ بەدەست‌و پەنجەو خامەی ڕەنگینی نەونەمامە تازە پێگەیشتوەکان نەخشێنرا بوو ، کە تێیاندا تواناو بەردەوامی‌و بەهرەی ئەو قوتابیانەی دەردەخست .. گەلێ تابلۆی زەیتی‌و ئاوی نەخشێنرا بوون کە بەڕوونی‌و ئاشکرایی تەعبیری لە ڕاستی ژیانی ئەمڕۆمان دەکرد . هەڵکەندن‌و نەخشەکێشان لەسەر مەعادن چالاکی‌یەکی یەجگار دیاری پێشانگاکەبوو ، بەرهەمی ڕستن‌و چنین‌و دوورینی جۆرەها کاری خوری‌و لۆکەو خەیاتەو ئاوریشم لە نموونەی [بلووزو گۆرەوی پوزەوانەو کلێتەی شکاکی ... تا ..] تەواو پێشانگاکەی ڕازاندبووەوە .

هەر ئەو هەموو بەرهەمە ڕەنگین‌و کارە پیرۆزانە ڕوو بەرووی بەرهەمی خۆماڵی‌و فۆلکلۆری وەستابوو ... مرۆڤ بەبینینی دیمەنە ڕەنگینەکانی دنیای فۆلکلۆری کوردی تەواو هەستی بە چێژو خۆشی‌یەکی لەبن نەهاتو دەکرد ، لەجیاتی چوار دیوارو بنمیچێکی چیمەنتو دیمەنی چیغێکت دەبینی کە بە جۆرەها کاری میلی‌و فۆلکلۆری ڕازێنرابووەوە .. خواردنی ناو کوردەواری بە کاسەو کەوچکی خۆماڵی‌تییەوە مامەڵەی لەگەڵ دەکرا ... تێکڕای ئەو خوشکە قوتابی‌و مامۆستایانەی سەرپەرشتی بەرهەمی قوتابخانەکەی خۆیان دەکرد جل‌و بەرگی کوردیان پۆ شیبوو ... لە تەك بەرهەمەکەیاندا وەستابوون بە ڕوویەکی شیرینەوە وەڵامی پرسیاریان دەدایەوە .

شایانی باسە : کە قوتابیانی تێکڕای قوتابخانەکانی ناو شاری هەولێر دەستەدەستەو پۆل پۆل بۆ دیدەنی پێشانگاکە دەهاتن ولە لایەن بەرپرسیارو ئامادە بووانەوەش بەگەرمی پێشوازی دەکران ... ئەو بەرهەمانەی لە پێشانگاکەدا دانرابوون تەنیا بۆ پێشاندان بوون .





# لە سلێمانی

**« ئاسۆس » : ئامادەی کردووە**

**« کۆڕی ماتەمینی چلەی خوالێخۆشبوو چیرۆکنووس مامۆستا ئەمینی میرزا کەریم »**

بە سەرپەرشتیو سازکردنو ڕێکخستنی لیژنەیەك کە لە مامۆستایان « **شێرکو بێکەس ، مستەفا سالح کەریم ، محمد نوری تۆفیق ، ڕەؤوف بێگەرد ، سەلام مەنمی** » پێکهاتبوو ئێوارەی ڕۆژی 10/5/984 لە باخچەی یەکێتیی نووسەرانی کورد لە سلێمانی کۆڕێکی فراوان بۆ چلەی چیرۆکنووسی کۆچ کردوو ئەمینی میرزا کەریم سازکرا ، ژمارەیەکی زۆر لە ئەدیبانو ڕووناکبیرانو هاوڕێیانو کەسوکاری خوالێخۆشبوو ئامادەی ئەم ماتەمینییە بوون .

**هونەرمەند یاسین بەرزنجی بەڕێوەبەری کۆڕەکەبوو** ، سەرەتا بەخێرهاتنی ئامادەبووانی کرد ، ئەمجا کورتەیەکی لە ژیانی کاك ئەمینو بەرهەمە ئەدەبییەکانیو شانۆنامەکانی باس کرد ، هەروەها پەنجەشی بۆ هەندێ لەو چیرۆکانەی ڕاکێشا کە بڵاونەکراونەتەوەو کاتی خۆی بە کاك یاسینی سپاردوون .

**وتاری لیژنە** لە لایەن چیرۆکنووس ڕەؤوف بێگەردەوە پێشکەش کرا کە تێیدا وتی : « **ئەمینی میرزا کەریم** لەگەڵ هەموو ئاشووبەکانی زەمانەو گەردەلوولی بێبڕانەوەی وڵاتەکەیو هەموو چورتمو تەنگو چەڵمەکانی ژیانی تایبەتی خۆیو گەلەکەیدا ، لەو ڕۆژەوە کە چاوی کردەوەو هوشیارانە ڕاستییەکانی بینی ، لەبەردەم ڕەشەبای سەختو لەپێشی هەر هەڵدێرێکدا وەك گەردنی چیاکانی وڵاتەکەی وەستاو کاروانی جێنەهێشت ، هەڵوێستی بەدرێژایی ژیانی بێخەوش بوەو لەگەڵ کاروانی پێشکەوتنخوازو ئازادی و یستاندا ڕێگای بڕیوە . ئەمینی میرزا کەریم چ لە مەیدانی شانۆو چ لە کورتە چیرۆکدا هەردەم لایەنگری چینە هەژارەکانی وڵاتەکەی بوەو بەگژ چەوسێنەراندا چۆتەوە »

دوای ئەوەی کاك ڕەؤوف باسی هەندێ لە ناوەرۆکی چیرۆکەکانی کاکەمینی کردو بە ڕێزەوە هەڵیسەنگاندن لە کۆتاییدا بەناوی لیژنەکەوە سوپاسی هاتنی میوانەکانی کرد .

**ئەمجا چیرۆکنووس محمد موکری لە ووتارەکەیدا ووتی :**

« ئەمینی میرزا کەریم .. ڕۆڵەیەکی بە وەفای میللەتی کوردبوو .. دەردی زیندانو ڕاونانی چەشت ، خۆشەویستی خاکەکەیبوو ، بۆیەش کە لە هەندەران گوێی لە ترپەی پێی مردن بوو بەبێ دەنگی لەشی شەکەتی خۆی هەڵگرتو بەرەو خاکی کوردستان گەڕایەوە . »

هەروەها کاك موکری ووتی : « تاقیکردنەوەی شۆڕشگێڕانەی گەلانی وەك گەلی ئێمە زۆر بە ئاشکرا ئەو ڕاستییەی دەربارەی ئەدەب خستۆتە ڕوو کە ئەدەب ئەگەرچی لە زۆر لایەنیدا سنعەتێکی هونەریو زادەی داهێنانی تاکە کەسە .. بەڵام لە کرۆکدا کارێکی کۆمەڵایەتیو مەسئولیەتێکی نیشتمانییە لە ئەستۆی ئەو کەسە داهێنەرانەدا کە پێیان دەگوترێ « نووسەران » ئەمجا بە شانازییەوە باسی نووسەرانی کوردی کرد ـ لەوانەش کاکەمینی میرزا کەریم کە سەربەرزانە لە ئاستی هەست بە مەسئولیەت کدندا بوون . وە لە ئەنجامدا سڵاوی نووسەرانی لە سەرانسەری کوردستاندا پێشکەش بە گیانی خوالێخۆشبوو کرد .

**دکتۆر عیززەدین مستەفا ڕەسول کە یەکێ بوو لەو نووسەرانەی لەم ماتەمینیەدا ووتاریان خوێندەوە ، لە شینی کاکەمینا ووتی :**

« کە دەنگو زایەڵەی مەرگ لە خاکی ژیانو مەرگەوە بەرەو جیهانی بەرین هاتەوەو لەگوێ ڕوباری تایمس دوا هەواری ئاوارەیی ئەو ووتیان : کاك ئەمین مرد .

دەنگی ئاوارەییو ئارەزووی بۆنی خاکی نیشتمانو سەیوانی دەربەدەران لە هەندەران هاواری کرد :

کاك ئەمین بۆ ژیان چوەوە بۆ نیشتمان ، بەڵام لە نیشتمان مرد .

دیمەنی گۆیژەو پیرەمەگروون دوا دیمەنی چاوی بەختەوەری بوو . ئەو بۆ چەند ڕۆژو تاوێکی پێش مەرگ بە نیشتمان شادبوەوەو گەشایەوە ، خاکی نیشتمانیش بەدوا هەناسەی گەرمی ئەو کوڕە دڵسۆزەو لاشەی نازداری شاد بوەوە . »

ئەمجا د . عیززەددین ووتی :

« ئەبێ دوا هەناسەی ساردی نالی‌و حاجی قادر باسی کام نازەنین‌و مشتە خۆڵ‌و گڵکۆی کردبێ‌و دوا دێڕی نەگەیشتووی پەیامی دێوانەیی‌و سەحراگەڕی‌و لە غەریبی مردنیان چی بووبێت ... یا ئەمین فەیزی بلیمەت بەدەم ئازاری ئیفلیجی‌و بێکەسییەوە چی ووتبێ‌و نەمان بیستبێ . دەیانوت : گۆران بەختەوەر بوو ، چونکە هەناسەی ساردی غەریبی‌ی هێنایەوە نیشتمان‌و بارانی پاییزی کوردستان تۆزی غەریبی‌ی شت . »

هەروەها دکتۆر لە ووتارەکەیدا باسی تێکۆشانی کاك ئەمینی کردو پەنجەی بۆ نووسینەکانی ڕاکێشا « نووسەرێکی سەر بەخاك‌و نەتەوەو مرۆڤپەرستی بوو »

پێش ئەوەی کۆتایی ووتارەکەی بە پارچە شیعرێك بهێنێتەوە کە دوو ساڵ لەمەوبەر بۆ تەرمی غەریبیکی خۆشەویستی وتبوو لەتەك گۆرانا ووتی :

ڕێ بەردەن ، با بڕوا بۆ سەیوان تابووتی
چاو شۆڕکەن لە عاستی توانج‌و تانووتی .

لەدوای ئەوە مامۆستایان ع . ع . شەونم‌و حەمە ڕەحیم ڕەمەزان سەرو پارچە شیعریان خوێندەوە کە بۆ چلەی کاك ئەمینیان ووتبوو ، یەکەمیان کورت‌و دووەمیان درێژ ، هەریەکەشیان جۆرە سۆزو وەفاو خۆشەویستییەکی تایبەتییان تێدابوو . کاك جەمال شاربازێڕی شاعیرو کاك جیهان عومەری چیرۆکنووس ئەوانیش هەریەکەیان ووتارێکی خوێندەوە رووی گەشی ژیانی کاك ئەمینی دڵسۆزو ڕاستگۆ هێمن‌و بەوەفایان نیشان ئەدا .

ووتاری بنەماڵەش لەلایەن **خوشکە کەژاڵی کەمالی میرزا کەریمەوە** خوێندرایەوە ، نەك هەر ووتاری سوپاس‌و پێزانین بوو بەرامبەر بە هەڵوێستی نووسەرانی سلێمانی بەڵکووتارێکی ئەدەبی‌ی ڕەنگینیش بوو .

لەکۆتاییدا **کاك یاسین بەرزنجی** بەناوی لیژنەی کۆڕەوە سوپاسی ئامادەبووانی کردو کۆڕەکە کۆتایی هات‌و دوا ماڵئاوایی لە چیرۆکنووس‌و شانۆنامە نووس مامۆستا ئەمینی میرزا کەریم کرا .

## « پیشانگایەکی فۆلکلۆری لە کارێزە »

لە ناوەڕاستی مانگی مایسدا هونەرمەند عومەر درەیی لەدێی کارێزە پیشانگایەکی بۆ بابەت‌و کەلوپەلە فولکلورییەکانی ناوماڵ سازکرد . ئەم پیشانگایە نزیکەی دە ڕۆژی خایاند ، چەندین کەس لە سلێمانی‌و لە دێهاتەکانەوە بۆ بینینی چوون . بەشێوەیەکی ڕێك‌وپێك‌و جوان هەمەجۆر ئەو شتە فۆلکلۆرییانەی لەناو ماڵدا بەکار دەهێنران لەم پیشانگەیەدا دەبینران .

زۆر جێی خۆیەتی ئەگەر کاك عومەر لەتوانایدا بوایە ئەو پیشانگەیە لە شاری سلێمانیش پیشان بدات . هیوای سەرکەوتنی بۆ دەخوازین .





# لــه دهــــوْك

ژ ئامادەكرنا : مەتين ..

## كــوردسـتــان يــەكــەمــين ڕوْژنــامــا كــوردی دكوڕەكيدا

ژبــزاڤێن ئێكــەتيا نڤيسڤــانێن كــورد تــايێ دهــوكێ ، ل ڕوْژا دووشەمبیێ ل ڕێكەفتی 16 / 7 / 1984 تورەڤانێ هێژا كاك حجی جعفر كورەك پێش كێش كر ل دەم ژمێری حەفتی ئێڤاری ، ل ژێر ناڤ و نيشانێت « پێداچونەكا مێژووی ل سەر يەكەمين ڕوْژناما كــوردی » . كاك وصفی ردێنی ئــەڤ كوڕە بــڕێڤەبــر یێ‌كــو هژمارەكا باش ژتورەڤان و ئەدەب دوستا لێ بەرهەڤبــوين . ل سەر ديروك و جهو ئەگەرێت دەرچونــا ڕوْژنامــا كوردستــان ، يەكەمين ڕوْژناما كوردی كاك حجی باسێ خو دەست پێ‌دكەت دبێژيت :

ڕوْژناما كوردستان ل 22 نيسانێ ل قاهيرە دەرچويــە خالەكــا گەورەيە دمێــژووا ڕوْژنامــەگەريــا كوردی‌دا . 31 ژمــارە ژێ دەرچوينە ل قاهيرەو جنێڤ و لەندەن و شارەكێ دن ل ئنگلتەرا . هەتا سالا 1902 هاتيە گرتن .

گەلەك زاناو شەهرەزا ل ســەر ڤێ ڕوْژنامێ نڤيسيــە ، ژوانا





مينورسكی و كمال فوئادی و شــاكر خصبــاكی . دڤێ بزاڤ و پێكولێ‌دا دكتور كمال فوئادی دەورەكێ مەزن ديت ، نــەمازە دخرڤەكرنا هژمارێت ڤێ ڕوْژنامێ‌دا .

پشتی هينكی سەيدايێ حەجی بكورتی كرە بەحسێ هندە لايێت زمانەوانی گوْت : شێوێ زمــانێ كوردی یێ‌كــو ڕوْژنامــە پێ نڤيسی ، شێوێ بوتانە ، زمــانێ عەرەبی مشــە تێدا هــاتيە ، حەديسێت پێغەمبەری و ئاياتێت قورئانێ ژی جهێ خو دنــاڤ بەرێت وی‌دا ديتيە . دڤيان ڤێ چەندێ بكەنە پەردەو پالپشت ، داكو خەلكی هشيار بكەن وە پتر خزمەتێ بگەهيننە ملەتی . پيت و ئامرازێت تێدا هاتين ، ئەوژی ژمەرا خويا كرن .

پاشی ل سەر بابەتێن ڕوْژنامێ پويتە پێ‌كری تبابــەكێ ئاخڤت گوْت : ڕوْژمانێ بايەخەكێ باش دايــە مێژووا كــوردی ، دوو وتارێن درێژ ، ل سەر نەژادا سەلاحەدينێ ئــەيوبی و ميــرێن جزيرێ تێدا هاتينە . شەرێ ئەرمەناو سولتان عبدالحميدی و چەتێت وی ، ئەڤ روداوە دڕوْژنامێ‌دا هاتيە نڤيسين دبێژيت كو كورد نەئەگەرێن ڤی شەرينەو نابيت بێخنە ستوێ وان . ديسان دەنگ و باسێن دەرڤە تێدا هاتينە ، دقالبەكێ تەسكدا نەژيايە . تشتی گرنگ ، بايەخەكێ مەزن دايە تورێ كوردی ، هەر ژژمارا دووێ دەست ببــە لاڤكرنــا مەم و زينێ كــريــە و هــەتــا ژمــارا دويماهيێ . هەر وسا گوتار مشە تێدا هاتينە ، باسێ خــاندن و نڤيسينێ دكەن .

پاشی كاك حجی خويا دكەت كو باهرا پتر ژگوتارێن ڕوْژنامێ ، هەردوو برا نڤيسينــە ، مقداد مــدحت بدرخــان و عبدالرحمن پاشای كێم جــارا هندەك نــاڤێت دی ژی دكەڤنــە بەرچــاڤێت خاندڤانێ هژمــارێت ڤێ ڕوْژنامێ . بــەرێ كوڕ بكــوتايی بێت هژمارەكا برادەرا ئاخڤتن ژوانا ، پێزان ، عبدالكــريم فندی ، عبدالرحمن مزويری ، وصفی ردينی .

## حەفتيەكا ڕوْشنبيری ب بيرهاتنا جەژنێت تيرمەهێ

ب هەلكەفتنا جەژنێت تيرمەها پيروز ، ڕێڤەبەريا ڕوْشنبيری‌يا



جـەمـاوەر ل دهـوكێ ، حـەفتیـەكـا رۆشنبیـری دانـا ل رۆژێت 22 — 7 ' 23 — 7 ' 24 — 7 .

دفێ حەفتیا رۆشنبیری‌دا ، سەیدایێت هێژا حسین جاف و محمد البدری و بدرخان سندی ، دێ بەشداربن . ل رۆژا ئێك‌شەمبێ 22 — 7 — 1984 ل هولا بنگەها بزاڤا فێركەهی ، سەیـدا حسین الجاف دەست بڤەكرنا ڤێ حەفتیێ‌كر ، ب‌كورەكی ل ژێر ناڤـو نیشانێت « رۆژهەلاتناسی » كاك انور محمد طاهر رێڤەبەریا ڤی كورێ كر ، یێ‌كـو هژمـارەكا بـاش ژرۆشنبیرێت دهـوكێ لێ ئامادەبوین . سەیدا خالد حسین رێبەرێ رێبەریا رۆشنبیـری جەماوەر ، ب‌خێرهاتنەكا گەرم ب‌میهڤانا كرو گۆت : ل سەر مە ئەوە ئەم ڤان هەلكەفتنا بـو خو بكـەینە خـەتیرەو ب‌بـزاڤـو چـالاكیێت رۆشنبیری رابـین‌و بەردەوام بـین ، وە هەر وەكی سەروكێ فەرماندە هێژا صدام حسین دبێژیت : عوّموا الثقافة الكردیة پێویستە ئەم ڤێ گۆتنێ بو خو بكەینە بنگەهەك ، بـو وەرارو پێشئێخستنا رۆشنبیری‌یا كوردی .

پاشی سەیدا حسین جاف دەست پێكر . ل پێشیێ رامان ژبەیڤا « رۆژهەلاتناسی » الاستشراق ، خویـاكر . ددویڤـدا ل سەر دیروكا رۆژهەلاتناسیێ ل كوردستانێ ئاخفت ، بو جارا ئێكێ ئەڤ دیروكە ل سەدێ هەڤدێ دەست پێ‌دكەت بتایبەتی ل سالا 1769 . دیسان كرە بەحسێ هژمارەكا رۆژهەلاتناسا ، ئەڤێت ل كوردستانێ گەریاین‌و ل سەر كوردا نڤیسین . ژوان زاباولیرخ‌و مینورسكی‌و تومابواو ولیم دوگلاس‌و سنیور كاریزونی ، یێ كو هاتیە ئامێدیێ ، وە دو پەرتوك دانانیە ، ل سەر رێزمانا كوردی‌و فەرهەنگوكەكـا كوردی ـ ایـطالی . هژمـارەكا رۆژهـەلاتناسـا ب‌مەبەستێت نهێنی ل كوردستانێ دگەریان ، چاوا قەنج هەنە وەلێ خراب ژی هەنە . كاك حسین‌ی تیابەكێ ل سەر ڤی لایەنی بو مە ئاخفت . وە گۆت كو پێویستە رۆشنبیری كورد ب‌دەورێ خـو رابیت ، ل دویڤ‌چـون‌و تـوێـژانـدنـا نڤیسینێت وان رۆژهەلاتناسا بكەن ئەوێت كو ل‌سەر كوردا نڤیسین . ددویڤدا سەیدا ب‌درێژی ل سەر یاداشتێت ئەفسەرێ بریتانی مێجەر نوئێل‌ی ئاخفت . ئەوی ژ 15 حزیرانا سالا 1919 ێ ، وە هەتا 1 ێ ئیلونا هەر وێ سالێ ل كوردستانا توركیا گەریایی ، ل گەل وەفدەكێ پێك‌هاتی ژكامیران بدرخـان‌و سید معـین‌و جلادەت بدرخان‌و دكتور اكرم جمیل پاشاو فائق ئەفەندی . كاك حسین‌ی نمونێت گرنگ ێیت ڤێ كتێبێ ، ئێخستنە بەر چاڤێت مە . بیرو رایێت نوئێل‌ی ل سەر گەلەك كریارو رویدانا بەلوی كرن ، ئەمازە كوشتاریا ئەرمەنا یا كو بسەدەها بەلكا تینیت كو ئەبناسبونـا كوردابو . ئوبال‌و بناسبونێت حكومەتا ئوسمالیا ئمپریالی‌بو . پشتی سەیدایی باسێ خو بكوتایی ئینای ، هندە برادەر كەتنە قـادا گێنگەشێ وەكی محمـود زامدارو حجي جعفـر ، دیسان هژمارەكا پرسیارا خۆ كێشا مەیـدانێ وب‌پێڤەهـاتنەكـا باش بەرسڤا وان هاتە دان . براستی باسێ كاك حسین‌ی یێ ب‌نرخ‌بو وەجهێ رزامەندیا گشك برادەرابو . پیروزباهیێت گەرم بو كاك حسین ل سەر ڤی كورێ ب‌سەركەفتی .

● حسین ئەحمەد جاف ●

- ● سالا 1947 ێ ل بەغدا یێ هاتیە دنیایێ .
- ● كولیجا زمانا پشكا زمانێ ئنگلیزی سالا 1970 بـدویماهیـك ئینایە .
- ● ئەندامێ مەكتەبا رۆشنبیری‌یە یا ئێكەتیا نڤیسڤانێت كورد ل بەغدا .
- ● ئەڤ كتێبێت ژێری ئامادە كرینە :

1 — یاداشتەكانی میجور نوئیل ل كوردستانێ .
2 — ئێل‌و خێلێت كوردی ل دەڤەرا بادینان .
3 — كتێبا كوردو كوردستان ، ژئنگلیزی وەرگێرایە .
4 — وەرگێـرانا كتێبـەكێ ل سەر شـاعیرێ كـورد بابـا طاهر همدانی .
5 — وەرگێرانا كتێبا « سولیكی » بو زمانی كوردی ، ئەڤ كتێبە بەحسێ موسیقاو سترانا فوللوری‌یا كوردی دكەت .



# ل گەل محمد البدری وتاقیکرنا وی یا شعری

دیسان ل رۆژا دوشەمبێ ، ل رێکەفتا 23 / 7 / 1984 کورەك هاتە سازکرن ، بـو هوزانڤـانێ داهێنەر ، هێـژا محمـد البـدری هـژمارەکـا مەزن ، یـا رۆشنبیـرو تـورەڤـانـا ل ڤی کـوری ئامادەبون ، یێکو کاك حجی جعفری برێڤە بری رێڤەبرنەکـا جوان . دڤی کوریدا ماموستا بدری ل سەر تاقیکـرناخـویا شعری بومە ئاخفت . ل پێشیی باسێ قوناخیت ژیانا خوکر هەر ژبچویکاتی ئاشکراکر کو قوتابخانێ و ماموستایت وی کارتێکرنا خول سەر هەبو دگرتنا رێکا هوزانێ و نفیسینێ دا . ل سالا 1960 شعر بەلاڤکرینە دروژنامەو کوڤارادا بزمانێ عەرەبی . ل سالا 1970 بو جارائێکێ شعر بکوردی نفیسی . ئەو رۆژا ئەڤ شعرە لێ بەلاڤبوی دهاوکاری دا ، رۆژەکا گرنگە دژیانا هوزانڤـانی دا ، هەر وەکی وی دیارکری . کاك محمد خویاکر کو دژیانا خو یا تورەیی دا ، یێ داخبار بویە بجەواهری و سیابی و بەیاتی . هـەر وسا بهـوزانڤانێ کـورد یێ بەرکـەفتی بابـا طاهـرێ هەمەدانی . ل سالا 1969 کومەلا چارینێت وی گوهازتینە سەر زمانێ عەرەبی ژزمانێ فارسی . پاشی بیرو هزرێت خو ل سەر دەورێ شعرێ دژیانێدا خویاکرن گوت : هوزان رێکە تڤی یا خـزمەتـا ملەتی بکـەت و ئـارمـانجێت وی بـو سـەرکـەتن و پێشڤەچونێ . ددویڤدا هژمارەکا هەلبەستا بزمـانێ عەرەبی و بزمانێ کوردی برەهوانێ ژمەرا خانـدن ژڤان هـەلبەستـا : الطوفان ، ثلاث قصائد ، رباعیات بابا طاهر وە ژبەرهەڤوکا خویا شعری « ئای چەندم خوش ئەوی » چەند هەلبەستەك خاندن . ژڤان هەلبەستا دیارە کو هێژا محمد البدری هوزانێت خوژخەمو دەردو کـولێت ملەتێ خو ڤـەهانـدینە بشێـوەکێ نویـژەن وە بدارەوانییەکا بـەرزو بالا . ل دویمـاهیکێ هێـژا محمـود زامداری چەند پرسیارەك ئاراستەی کاك محمدی کرن . ژوان پرسیارا : هەتا کیرێ تو داخبار بویە بشعرا جیهانی ؟ ژبەر چ ئەگەر ژتەیارێ روانکە تو پەشێمان بوی ؟ داخباریا تە ببزاڤا نویژەنی یا شعرا کوردی چەندە ؟ دیسان چەند پرسیارەکێت دیژی ژێ هاتنە کرن . ژوان : ڤەکولینێت هەتا نهو ل سـەر شعرا وی هاتینە نفیسین ، وەکا جا یێ چاوانە ل گەل رەخنێ و رەخنەگرا ؟ ئەڤەو کاك محمدی بەرسڤا ڤان پرسیارا هەمیان بکـورتی دا پشێوەکی پێڤـەهاتی و جـوان جهێ رەزامەنـدیا هەمیان بو .

سوپاس بـو هوزانڤـانێ بەرکـەفتی لگەل هـویڤی و داخازێت بەردەوامیا سەرکەفتنێ ژبو خزمەتا پەیڤا کوردی یا رەسەن وە بەرزکرنا شعرا کوردی ل ڤی سەر دەمی .

● محمد البدری ●

- ● ل قەزا بەدرە هاتیە دنیایێ سالا 1937 ێ .
- ● خانوویێ ماموستایا سالا 1959 بدویماهی ئینایە .
- ● کولیجا تـورا پشکا زانیـاری دەرون سالا 1975 بـدویماهی ئینایە .
- ● ل مەیدانا تورەیی و رۆژنامەگەریی شول کریە ژسالا 1960 ێ وەرە .
- ● سکرتێرێ ئێکەتیا تورەڤانێت کوردبو .
- ● ئـەندامێ ئـەنجومـەنا نـاڤندییـە یا ئێکـەتیا تـورەڤان و نفیسڤانێت عیراقێ یە .
- ● ئـەندامێ دەستـەیا رێڤـەبەرییـا کومـەلە یا رۆشنبیـریا کوردی یە .
- ● هەتا نهو هژمارەکا بەرهەڤوکێت شعری بکوردی و عەرەبی دەرێخستینە .
- ● نهو ژی ماموستایە ل بەغدا .



# كاروان

مجلة ثقافية شهرية
تصدرها الامانة العامة للثقافة والشباب
باللغتين الكردية والعربية

24 ايلول 1984 السنة الثانية



● في هذا العدد ●



العنوان : اربيل ـ الامانة العامة للثقافة والشباب ـ مجلة (كاروان) ـ ت : 20882

# اربع سنوات من البطولات

في الرابع من أيلول هذا العام، تنهي حربنا الدفاعية مع النظام الايراني عامها الرابع، وشعبنا مرفوع الجبين، يتحدى كالاسد الهصور، قوى الاستعمار والتخلف، ملتفاً اكثر من اي وقت مضى حول قيادة المناضل «صدام حسين»، ومؤيداً بقوة للدعوات الرامية الى احلال السلام وانهاء الحرب، لاسيما بعد ان استخلص دروساً ثمينة من هذه الحرب المفروضة عليه، حيث علمته احداث السنوات المنصرمة: من الذي يقف الى جانب الحق ومن الذي يقف الى جانب الباطل، من هو المعتدي ومن هو المعتدى عليه: من هو المنتصر ومن هو المهزوم!

لقد شن النظام الايراني، في ٤ ايلول عام ١٩٨٠ عدواناً مسلحاً على قرانا ومدننا ومخافرنا الحدودية، ولم يكن ذلك العدوان سوى تتويجاً لأعمال عدوان واستفزاز متفرقة سبقت العدوان المسلح الواسع النطاق ذاك. وقد ابتغى العدو من عدوانه الضغط على شعبنا وقيادته الحكيمة كي يحيدا عن النهج الايجابي التحرري الذي اتخذاه على مختلف المستويات القطرية والعربية والعالمية، نهج بناء مجتمع جديد عادل واشتراكي، نهج

السعي الى توحيد الاقطار العربية ومعاداة الاستعمار وتحقيق السلام لشعوب المعمورة. هذا النهج الذي عجز الشاه ونظامه المقبور معه عن التأثير عليه والانحراف به عبر سنوات كثيرة من التحرش والعدوان ضد شعبنا وبلادنا. إن سنوات من الحرب والدمار التي جلبت لجماهير المنطقة المآسي والويلات، علمت العراقيين وجميع المخلصين الشرفاء في العالم التواقين الى العدالة والسلام والى دنيا خالية من الظلم والحروب، علمتهم الكثيرمن الحقائق الدامغة واعطتهم العديد من الدروس القيمة، من هذه الحقائق والدروس:

١- ان البادىء بالحرب والعدوان - والبادىء اظلم - كان ولا يزال، هو النظام الايراني المتعطش الى سفك الدماء والساعي الى اعادة النفوذ الاستعماري الى المنطقة بل وحماية ماتبقى من ذلك النفوذ، ولو القينا نظرة على سياسات الطرفين المتنازعين لتبين لنا، حرص عراقنا العظيم على السلم وحل المشاكل القائمة بالطرق السلمية قبل وبعد مجيء طغمة الخميني الى الحكم في ايران. إذ ايد عراقنا كافة المساعي السلمية للافراد والجماعات والدول التي تقدمت بوساطاتها وحلولها لأيقاف نزيف الدم، ليس هذا فحسب، إنما سحب قواته المنتصرة بملء ارادته من الاراضي الايرانية ونزولاً منه عند ارادة المجتمع الدولي،

وعلى النقيض من هذا فان القيادة الايرانية استغلت نزول عراقنا عند ارادة الشعوب والحكومات واحترامه للمواثيق والمبادىء، فراحت تهاجم قرانا ومدننا الحدودية مثلما كانت تفعل ذلك في ٤ ايلول ١٩٨٠ وقبله، وطوال أربع سنوات من الحرب، ظلت هذه القيادة على نهجها العدواني، فوسعت من نطاق الحرب، وزجت خلافاً لكل الاعراف حتى بالاطفال في الحرب! ولا زالت الى يومنا هذا تحلم بغزو عراقنا واستعباد شعبنا واحتلال اراضينا، ليس هذا فقط، بل انها تحلم بأقامة نظام رجعي في عراقنا على غرار نظامها السيء الذي اذاق الشعوب الايرانية مُر العذاب.

٢- ولقد دحضت الاحداث مزاعم القيادة الايرانية التي صورت للعالم، بأن العراق يبغي ضم اراضي ايرانية اليه، متجاهلة بأن العراق في دخول جيشه الاراضي الايرانية، انما كان هدفه تأديب المعتدي وايقافه عند حده. فلو انه كان يطمع في

# والانتصارات على العدو الغاشم

الاراضي الايرانية لما كان يسحب قواته منها، بل على النقيض من ذلك فانه كان يكرس من تواجده في تلك الاراضي، وخلافاً للمزاعم الخمينية، فقد تبين للجميع بان الرجعية الايرانية هي التي تبغي التوسع واحتلال أراضي الغير، ولنا في محاولاتها التسللية الى اراضينا اكثر من دليل ودليل على صدق هذا القول، ناهيكم عن ضغوطاتها المتواصلة على اقطار الخليج العربي وغيرها من الاقطار المجاورة.

٣- ومن الدروس التي استخلصها العراقيون وغيرهم من سنوات الحرب عقم ولا جدوى بل واستحالة تصدير الثورة من بلد الى بلد آخر، علماً أن كل مايصدر عن حكام ايران هو معاد للثورة ولمعنى الثورة، والقيادة الايرانية، طوال اكثرمن خمس سنوات من تواجدها في الحكم، عجزت تماماً عن صنع مثيل رجعي لنظامها اينما حاولت ذلك.

٤- ومن التجارب التي تعلمها شعبنا وشعوب العالم الاسلامي كافة، ان المحاولات الايرانية المتسترة بالدين، بدلاً من ان تعزز من مكانة المسلمين في العالم وتقوي من استقلال اوطانهم، فانها على الضد من ذلك أساءت الى العالم الاسلامي، وعملت على اضعاف وحدة المسلمين وتفريق كلمتهم، وظهر للناس خلال الاعوام الماضية، بأن الخمينية تتحرش بدرجة رئيسة بالمسلمين والدول الاسلامية وهناك اكثر من برهان على تشكي وتذمر معظم الاقطار الاسلامية من التدخلات الايرانية في شؤونها، في وقت تتحاشى فيها الخمينية المواجهات الساخنة مع اعداء الاسلام التقليديين والمتمثلين بالصهاينة والامريكان وحلفائهما، اضف الى هذا، انها تعتمد على تعاونهم لها في مواصلتها للحرب ضد بلادنا، فلقد شاركتها الصهيونية في الحرب ضدنا عندما ضربت مفاعلنا النووي، وهناك اكثر من ١١شركة امريكية تزود ايران بالسلاح علاوة على المساعدات العسكرية وغير العسكرية التي تقدمها بريطانيا وغيرها من الدول الاستعمارية لايران، لكي تصمد وتواصل حربها القذرة المستنكرة من قبل كل الخيرين في الدنيا.

٥- ان الحركة الخمينية صنيعة الامبريالية العالمية تسترت وتتستر بالدين لتضليل الشعوب المسلمة وحرفها عن انتهاج الطريق الصائب، طريق معاداة الاستعمار والصهيونية والرأسمالية والاقطاع الاعداء التقليديين للمسلمين كافة والخمينية بدلاً من ان توجه المسلمين باتجاه مقارعة الاعداء التقليديين، فانها بذرت بذور الشقاق بين الشعوب الاسلامية واحيت الحزازات الطائفية والمذهبية، فالبت ولا تزال المسلم على غير المسلم ومعتنقي المذاهب الاسلامية بعضهم ضد بعض... الخ من الاعمال التي تضر بالشعوب الاسلاميةولا تخدم نضالها ضد الاقطاع والرأسمالية والاستعمار، ومن اجل السلام والاشتراكية.

٦- وعلمتنا وقائع الحرب هذه بان الصراع في العالم هو بين الشعوب والسلم والديمقراطية من جهة وبين الاستعمار والحرب والرأسمالية من جهة ثانية. وان اية تخريجات نظرية مغايرة كتقسيم العالم الى مؤمنين وكفرة وتصوير الصراع بين المستغلين ـ بفتح الغَين ـ والمستغلين ـ بكسر الغِين ـ على انه صراع بين هذا الدين او ذاك او هذا المذهب وذاك مثلما يفعل حكام ايران، يعد جريمة بحق نضال الشعوب ويؤدي في النهاية الى خدمة الرأسمالية

والاستعمار، ويوماً بعد آخر يتكشف لدى كل ذي بصيرة، كيف ان المصالح الاستعمارية في المنطقة شهدت تقدماً ملحوظاً جراء سياسة حكام ايران. ويجب ان لايغيب عن بالنا بأن الكثيرين من الناس انخدعوا في البدء بالشعارات البراقة لما يسمى بالثورة الاسلامية في ايران وفي الايام الاولى من مجيء الاستعمار بطغمة الخميني الى الحكم وقطع الطريق أمام القوى التقدمية الوطنية والاشتراكية الايرانية للحيلولة دون وصولها الى السلطة، وهي التي تعد اصلاً صاحبة المصلحة الحقيقية في الثورة وقوة الثورة الحقة.

اننا في الوقت الذي نستخلص فيه العبر والدروس من سنوات الحرب نود ان نشير الى حقائق مضيئة عن الدين الاسلامي الحنيف ومدى اساءة الخمينية اليه، أن مانفهمه عن الاسلام هو اعترافه بالشعوب «وخلقناكم شعوباً وقبائل لتعارفوا إن اكرمكم عند الله اتقاكم» ووقوفه الى جانب السلام «وان جنحوا للسلم فاجنح لهـا» و «إن طائفتان من المؤمنين اقتتلوا فاصلحوا بينهما». فاين هي الخمينية من الاعتراف بالحقوق القومية للشعوب ولا سيما الشعب الكردي وغيره من الشعوب الايرانية؟ أين هي الخمينية من الدعوات المخلصة للشخصيات والهيئات الاسلامية وغير الاسلامية لانهاء الحرب؟ نعم اين هي من التآخي بين المسلمين واحلال المصالحة بينهم اذا تحاربوا واقتتلوا؟!

وفي الذكرى الرابعة لأندلاع حربنا الدفاعية، نقول بان الحرب جريمة بحق الانسانية، وان الطريق الوحيد لاحلال السلام هو في صمود شعبنا والتفافه حول قيادته ونبذه للحرب كحل للمشاكل الراهنة في العالم، كما ان التقدم والبناء لايتمان الا في جو من السلام، من هنا يأتي سر تعلق العراقيين المنتصرين بالسلم ونبذهم للحرب قبل وبعد اندلاعها.

وليتعزز الانتصار العظيم لشعبنا على جحافل الغزو الايرانية.

المجد لشهدائنا الابرار الذين سقطوا صرعى برصاص العدو الغاشم في ساحات القتال.

عاش الشعب، عاش الجيش، عاش القائد.

---

د. محسن محمد حسين ـ قسم التاريخ
كلية التربية ـ جامعة بغداد

الملاحظ على الكتابات التي تطرقت الى المسائل المتعلقة بالكرد وبلادهم واصلهم ونسبهم، انها قليلة، واخبار الكرد فيها متفرقة، وأحيانا تمر سنوات طويلة دون ذكر شيء ما عنهم. وكذلك يلاحظ ان اسماء الجماعات (القبائل) وحتى المدن الكردية التي وردت في بطون تلك الكتب غير مضبوطة احيانا ومصحفة «محرفة عن غير عمد» احيانا اخرى. ولعل مرد ذلك يعود الى ان اكثر الذين اولوا هذه المواضيع اهتمامهم لم يعايشوا الحوادث التي كانت بلاد الكرد مسرحا لها، او كان الكرد ابطالها، بل ان جل هؤلاء المؤرخين ـ ان لم نقل كلهم ـ لم يكونوا اكراداً، لا سيما المؤرخين الذين دونوا احداث فترة القرون الاولى في التأريخ الاسلامي، وكذا بالنسبة للبلدانيين (الجغرافيين) الذين تحدثوا عن بلاد الكرد ووصفوا طبيعتها ومحاصيلها، وتحدثوا عن مدنها وكورها «اقاليمها» وطساسيجها «نواحيها» دون ان يقطنوا فيها او يزوروها.

بل ان بين المؤرخين ـ حتى بين أبرزهم ـ من تحدث عن الكرد، وعن امم اخرى، وأصلهم وجماعاتهم، كمن يتحدث عن مخلوقات اسطورية (انظر) مقالنا عن: المسعودي وحديثه عن اصل الكرد) وكان هذا سمة الفكر، القائم على الخيال والتصورات يومئذ، اذ لم تكن الافكار قد اخذت طابع دراسات علمية تستند على قاعدة راسخة وتعتمد التجربة وسيلة للوصول الى الحقيقة. اما محاولات بعض الكتاب في الربط بين الكرد والعرب، وجعل اصلهما واحدا، فمردها ليس الجهل فحسب، ذلك الجهل الذي لا يؤخذون عليه، وذلك للسبب المذكور، وانما ـ كما نرى ـ محاولة للربط بين الامتين اللتين وحّدهما الدين ثم الجيرة والمصالح المشتركة، وكذلك مساهمات الكرد الملموسة في الدفاع عن حياض الوطن الاسلامي، لا سيما في الثغور والعواصم والربط التي كانوا يعسكرون فيها، لا سيما لردع الروم البيزنطيين في محاولاتهم المستمرة للاغارة على اراضيهم، او المساهمة في الحملات العسكرية التي كانت تنظم لشن هجوم

# الكرد وبعض مصادر تأريخهم الاسلامي

على اراضي العدو. ولهذا فايجاد النسب ليس سوى دليل المحبة والتقدير، اذ لا يمكن لمؤرخ، او غيره، ان ينسب اصل امة ما الى امته اذا لم يكن يحب ويقدر تلك الامة. ومحاولات كهذه لم تكن جديدة، ولم تنته الى الوقت الحاضر.

هـذا وكان المـؤرخون والبلدانيـون اللاحقون ينقلون تلك المعلومات عمن سبقهم من الرواد مع اضافات او تغييرات قليلة. ما عدا كتّاب الرحلات الذين حاولوا ان يكتبوا مشاهداتهم دون الالتفات الى كلام من سبقهم، فخرجت كتابـاتهم اكثر صحـة واقرب الى ذهن القارىء لانها كتابات شهود عيان، لكنهم كانوا يفسرون مشاهداتهم برؤى ومنطق عصرهم القـاصر، وحسب ادراكهم وفهمهم لتلك الظواهر. ولهذا كانت كتاباتهم ـ في اكثر الاحيان ـ اشبه بريبورتاجات صحفية تستند عـلى انطبـاعات شخصية يتوقف التعبير عنها عـلى ثقافـة الرحالة، وروح ذلك العصر.

ويبدو ان الاقاليم التي قطنها الكرد قد تقلصت وتمـددت حسب الظروف، الا ان هذه الملاحظة تنطبق على اطراف البلاد، اما قلب كردستان فبقي وطيدا واحتفظ على المقومات القومية من لغة وعادات وسحنات وازياء وغيرها، اكثر، عكس الحال مـع اطراف البلاد. فثمة اشارات واضحة الى وجود الكرد في اقاليم تقع خارج كردستان الحالية، كالتي ذكرها ابن الفقيه في كتابه (مختصر كتاب البلدان) وابن خرداذبـه في (المسالك والممـالك)

وابن حوقل في (صورة الارض) وغيرهم ويـؤكدون عـلى وجود الكرد في عدة زموم اي محلات (عن الزموم انظر بحث الدكتور احمد عثمان ابو بكر: الكرد في كتابات المسلمين الاوائل. مجلة كليـة الآداب. العدد 24 لسنـة 1979) لا سيما في اقليم فـارس وقصبتها شيراز، وفي نواحي اصفهان وغيرها، اضافة الى وجود الكرد الواضح في مدن كبيرة عديدة غير كردية.

ويذكر المسعودي (وابن حوقل) اسماء اكثر من ثلاثين حيا بفارس يقطنها الاكراد، ثم يضيف «انهم يزيدون على خمسمائة الف (500,000) بيت ويخرج من الحي الواحد الف فارس الى مائة فارس واقل من ذلك او اكثر، وينتجعون في المشتى والمصيف على المـرعى (رحلة الشتاء والصيف) الا القليـل منهم على حـدود الصرود (من سرد، سارد: يعني بارد) والجروم (جمع جرم، گرم، گەرم: يعني حار) اي «گەرميان وكويستـان»، ولهم من العدة والبأس والقوة بالرجال والدواب والكراع ما يستصعب على السلطان امرهم اذا اراد تحيفهم (انزال الظلم بهم) وتهضمهم. ويقول (ابن حوقل) عن الاكراد المازنجان الموجودين في نواحي فارس واصفهان: «ليس منهم احد في عمل فـارس الاّ وله بها ضياع وقرى كثيرة غزيرة (صورة الارض: 239). الا ان مصادر العهود التالية (المصادر المتأخرة) لم تعد تتحدث عن الوجـود الكردي في تلك الاصقاع. ولعل ذلك يعود الى قيـامهم بثورات عديدة فيها، بينها ثورة واسعة احتاج اخماد نـارها الى جهـد

